

گۆڤارێکی هزریی ڕۆشنبیریی وەرزییە، ژمارە (٣٥) شوباتی ٢٠٢٢



بە سپۆنسەری سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی


خاوەنی ئیمتیاز و سەرنووسەر
تۆفیق کەریم

٠٧٥١١٤١٢٥٤٣ - ٠٧٧٣٢٦٣٧٦٦٤
tofeqkarem@yahoo.com

بەڕێوەبەری نووسین: عادل سدیق

بەڕێوەبەری هونەریی: ڕەوشت محەمەد

ڕاوێژکاری یاسایی: بەکر حەمەسدیق





سایتی گۆڤاری خاڵ
www.xallkurd.com

تیراژ: ١٥٠٠
نرخ: ١٥٠٠ دینار



# ناوەرۆک

## تەوەری ژمارە:



## بابەتی گشتی:








## ئەزموونی حوکمڕانیی لە هەرێمی کوردستاندا، هەڵسەنگاندن و بەراوردکردن

دوای تێپەڕبوونی زیاتر لە سی ساڵ بەسەر ئەزموونی حکومڕانیی لە هەرێمی کوردستاندا، چاوخشاندنەوە و لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندنی کار و سیاسەت و بڕیارەکانی دەسەڵات و لێکەوتەکانی، پێویستییەکی هەنووکەیی هەموو ناوەند و دەزگایەکی ئەکادیمی و زانستییە. لەم سۆنگەیەوە گۆڤاری خاڵ تەوەری داهاتووی بۆ گەنگەشەی ئەزموونی حوکمڕانی لە هەرێمی کوردستان تەرخانکردووە چی بە هەڵسەنگاندن یان بەراوردکردن، ئەویش لەڕێی قسە و باس و خواس لەسەر ئەم تەوەرانەی خوارەوە:

١- هەڵسەنگاندنی ڕەوشی سیاسەت لە سایەی حوکمڕانی کورددیدا لە هەرێم، جا سیاسەتەکە حکومی بێ یان ناحکومی.

٢- هەڵسەنگاندنی باری دەستووریی و یاسایی هەرێم و شیکردنەوەی یاساییانە بۆ ئەزموونی هەرێم لە بواری یاساداناندا.

٣- ئەزموونی دامەزراوەیی لە هەرێمدا و ئاستی بەدامەزراوەییکردنی بوارە جیاوازەکانی ژیان.

٤- حیزبایەتی و دیموکراسی و هەڵبژاردن و دەستاودەست کردنی دەسەڵات و ڕەنگدانەوەیان لە هەرێمدا.

٥- باسی باری دارایی و ئابووریی هەرێم و سیاسەتی حکومەت لەمبارەیەوە و ئاماژەدان بەو قەیران و ئاریشانەی ئەم بوارە بەدەستیانەوە ئەناڵێنێ.

٦- ئاماژەدان بەدۆخی کۆمەڵایەتی و کلتووریی و دەروونی هاوڵاتیانی هەرێم، لەگەڵ ئەو دەرد و نەخۆشییانەی کە لە سایەی دەسەڵاتی کورددیدا، دوچاری هەرێم و خەڵکەکەی بوون.

٧- کەرتی پەروەردە و خوێندن لە سایەی حوکمڕانی هەرێمدا و سیاسەت و فەلسەفەی پەروەردەیی هەرێم.

٨- ئایین و ڕۆڵ و پێگە و کاریگەرییەکەی و هەڵوێست و هەڵسەنگاندنی سیاسەتی حکومەتی هەرێم دەربارەی ئەم پرسە.

٩- پرسی گەندەڵی و هەڵمەتەکانی بنبڕکردنی و بابەتی شەفافییەت لە داهات و کار و سیاسەتی حکومەتدا.

١٠- دۆخی ڕاگەیاندن و سۆشیال میدیا و ڕێکلام و چۆنێتی ئەزموونکردنیان لە هەرێمدا.

- داواکارین لە نوسەرانی بەڕێز، لێکۆڵینەوەکانیان لەسەر ئەو تەوەر و بوارانەی کە ئاماژەیان پێدراوە تا ڕێکەوتی (٢٠٢١/٣/١٥) بنێرن بۆ گۆڤارەکەمان.



تەوەری ژمارە

# کۆمەڵگە لە بەردەم باهۆزی
# سۆشیال میدیادا

جاران بە ڕاگەیاندن دەوترا دەسەڵاتی چوارەم، ئەم ڕستەیە کاتێک بوو سۆشیال میدیا بوونی نەبوو، بەڵکو ڕاگەیاندن لە چەند کەناڵێکی دیاریکراو پێکهاتبوو، دامەزراوە و گرووپ و کۆمپانیاکان بەڕێوەیان دەبرد و ئاڕاستەیان دەکرد، تاک ڕۆڵی سەرەکی تێدا نەدەبینی، بەڵام ئەمڕۆ لە سایەی سۆشیال میدیا دۆخەکە تەواو گۆڕاوە، تاک دەتوانێت چەندین کەناڵ بەڕێوە ببات و ئاڕاستەشی بکات، خۆ ئەگەر باسی کۆمپانیا و دامەزراوەکان بکەین بێگومان هەرگیز لەگەڵ ڕابردوودا بەراورد ناکرێن، ئەمانە لەڕووی گەیەنەرەوە، بەڵام ئەوانەی پەیامەکەیان پێدەگات، جاران بەشێکی دیاریکراوی کۆمەڵگە بوون، کەچی ئێستا دەکرێت بوترێت هەموو تاکەکانی کۆمەڵگەیە.

جا ئەگەر پێشتر ڕاگەیاندن دەسەڵاتی چوارەمی پێ وترا بێت، ئەدی ئەمڕۆ چی بە سۆشیال میدیا بوترێت! ئەم هەژموونە بەهێزەی سۆشیال میدیا چ کاریگەرییەک لەسەر کۆمەڵگە بەجێ دەهێڵێت؟ لە هەموو ڕوویەکەوە، ئەو کەلێن و بۆشاییانە کامانەن کە لە ئەنجامی ئەو هەژموونەدا پەیدا دەبن؟ ئەدی ژیانی کۆمەڵگە بەرەو کوێ دەبات؟ کاریگەری لەسەر کۆمەڵ و خێزان و تاک چی دەبێت؟ ئەدی کۆمەڵگەی کوردی لە کوێی ئەم باهۆزەدایە؟

ئایا دەتوانین مامەڵەیەکی دروست لەگەڵ سۆرشیال میدیادا بکەین و خاڵە ئەرێنییەکانی لە بەرژەوەندی کۆمەڵگەکەمان بەکاربهێنین و خۆمان لە خاڵە نەرێنییەکان لادەین؟ ئەم خاڵانە و چەندین خاڵی دیکەمان خستە بەردەم پسپۆڕان و ڕۆشنبیران، ئەوانیش هەریەکەیان لە گۆشەنیگایەکەوە تیشکیان خستووەتە سەر بابەتەکان و زانستیانە توێژینەوەیان لەسەر کردوون. ئومێد دەکەین کۆمەڵێک لێکۆڵینەوەی بەسوود بن بۆ خوێنەرانی بەڕێزی گۆڤاری خاڵ.



د.جەعفەر عومەر
پزیشکی پسپۆڕی دەروونی

# دەروونناسی سۆشیاڵ میدیا

**پوختە:**

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا بوونەتە بەشێک لە ژیانی تاکەکان و زۆربەی دانیشتوانی سەر زەوی بەشدارن و هەژماریان هەیە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییە جیاوازەکاندا. ئەم بابەتە دیاردەیەکی نوێیە و تایبەتە بە سەدەی بیستویەک، وەکو بابەتێکی تەواو پەیوەست بە دەروونی مرۆڤ، لە ڕووی دەروونناسی و دەروونپزیشکییەوە لە سەرەتای لێکۆڵینەوەکاندایە. ئەم لێکۆڵینەوە بە ئامانجی لێکدانەوەیەکی دەروونی بۆ بابەتی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کراوە. پاڵنەرەکانی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەچوارچێوەی پێنج پاڵنەری سەرەکیدا کورتکراونەتەوە: (پەیوەستبوون، پێداویستییەکان، گوزارشت لە خود، بەدەستهێنانی زانیاری، سودی کەسی)، تاکەکان ئەم تۆڕانە بەکاردەهێنن وەکو سەرچاوەیەک بۆ شاردنەوەی کەسێتی ڕاستەقینە و پیشاندانی کەسێتییەکی خەیاڵی و ویستراو، گەنجان و ئەو کەسانەی کە تایبەتمەندی کۆمەڵایەتیبوونیان هەیە زیاتر بەکاریدەهێنن، سەرەڕای چێژبەخشی تۆڕەکان تاکەکان ڕووبەڕووی دوو مەترسی گەورە دەبنەوە: (تۆڵەکردنەوەی بەدڕەوشتی و هەراسانکردنی ئۆنلاین).

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان چەندین کاریگەریی و مەترسیان هەیە لەسەر دەروونددروستی تاک، بەشێوەیەک زۆربەکارهێنانی هۆکارە بۆ توشبوون بە خەمۆکی، دڵەڕاوکێ، توندوتیژی، ئالودەبوون و تێکچوونی وێنەی جەستە لەلای تاک، هەرچەندە توێژەران زیاتر سەرنجیان لەسەر کاریگەرییە نەرێنییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانە، بەڵام هێشتا چەند سودێکی هەیە بۆ دەروونددروستی تاک. لەکۆتاییدا جگەلە دەرئەنجام چەند ڕاسپاردەیەک کراوە بۆ لایەنە پەیوەندیدارەکان؛ بەکارهێنەر، دایباب، قوتابخانە، دەزگاکانی ڕاگەیاندن، ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکان، پسپۆڕانی بواری دەروونی و دەسەڵات.

**پێشەکی:**

لە ماوەی دەیەی ڕابردوو میدیا گۆڕانکارییەکی گەورەی بەخۆیەوە بینیوە، تەلەفیزیۆن و ڕادیۆ بەشێوازی یەک ئاڕاستە زانیارییەکان دەگوازێتەوە، بەواتایەکی تر ئەو زانیارییانەی کە لەلایەن کۆمپانیا و بەرهەمهێنەرانەوە بڵاودەکرێتەوە پێویستە لەلایەن بینەرانی ناچالاکەوە وەربگیرێت. لەهەمانکاتدا میدیای نوێ کە پێیدەوترێت سۆشیال میدیا یان میدیای کارلێککردوو، چەندین هەلی لەبننەهاتوو دابیندەکات بۆ بەکارهێنەران کە وەکو دروستکەر و بەکارهێنەر لە میدیادا کاربکات١. سۆشیاڵ میدیا؛ شێوازێکی پەیوەندیکردنی بیندراوە کە تیایدا بابەتەکان لەلایەن بەکارهێنەرەوە دروستدەکرێن، بەشداریان پێدەکات و ئاڵوگۆڕیان پێدەکات، بەوهۆیەوە بەکارهێنەران کارلێک لەگەڵ یەکتری دەکەن، لە ڕێگەی پەیامی کورت، وێنە، ڤیدیۆ و نامەی تایبەتەوە، کە بەکارهێنەرانی تر دەتوانن وەڵامبدنەوە و بەشداربن٢. لە ڕوانگەی دەروونکۆمەڵایەتییەوە؛ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان پێناسە دەکرێن بە «بۆشایی ژمارەیی» (digital spaces) کە ڕێگە بە بەکارهێنەر دەدەن بۆ ڕێکخستنی هەردووک لایەنی: پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان لەسەر تۆڕەکە (ڕێکخستن، دەرکەوتن، بەراوردکردن) و ناسنامەی کۆمەڵایەتی تاک (ناساندن و پێناسە)١.

لەسەر ئاستی جیهان، ژمارەی بەکارهێنەرانی ئەنتەرنێت زیادیکردووە لە (٣٦١) ملیۆن لە ساڵی (٢٠٠٠) بۆ نزیکەی (٣.٦) بلیۆن بەکارهێنەر لە ساڵی (٢٠١٦). تۆڕی زۆر بەکارهاتوو بۆ پەیوەندیکردن و کارلێکی کۆمەڵایەتی بریتییە لە فەیسبووک کە مانگانە (١.٧١) بلیۆن بەکارهێنەری چالاکی هەبووە لە ساڵی (٢٠١٦)٣. هەروەها ماڵپەڕەکانی تۆڕی کۆمەڵایەتی بوونەتە بەشێکی سەرەکی ژیانی کەسانی پێگەیشتوو، لە مانگی سێی ساڵی ٢٠١٨، (٦٨٪)ی کەسانی پێگەیشتوو لە ئەمریکا هەژماریان لە فەیسبووک هەبووە، هەروەها (٧٥٪)ی ئەو کەسانە ئاماژەیان بەوە کردووە کە ڕۆژانە فەیسبووک بەکاردەهێنن. لەوەش زیاتر (٧٨٪)ی گەنجانی پێگەیشتوو (تەمەن ١٨ بۆ ٢٤ ساڵ) سناپچات، و (٧١٪) یان ئینستاگرام بەکاردەهێنن٤. تویتەر لە دوای فەیسبووک دووەم بەربڵاوترین تۆڕی

کۆمەڵایەتی بەکارهاتووە کە زیاتر لە (٥٠٠) ملیۆن بەکارهێنەری هەیە لەسەر ئاستی جیهان، نیوەی بەکارهێنەرانی تویتەر ڕۆژانە دەچنە ناو تۆڕەوە و تویت دەکەن، ئەمەش بۆتە هۆی ئەوەی کە ڕۆژانە زیاتر لە (٥٠٠) ملیۆن تویت بکرێت٢.

تەکنەلۆجیا بەگشتی دەرئەنجامی باش و خراپی هەیە، ئەنتەرنێت نمونەیەکی تەواوە بۆ ئەم بیرۆکەیە، سەرەڕای باشترکردنی پەیوەندی بە جیهانەوە و بە دیموکراسیکردنی زانیارییەکان، بەهەمان شێوە ئەنتەرنێت ڕێگەیداوە بە تاکەکان هەتا خۆیان بشارنەوە لەژێر ماسکی نەناسراویدا٥. لە ڕوانگەیەکی ترەوە؛ ڕەفتاری بەکاربەر لەسەرهێڵ لە ڕێگەی سۆشیاڵ میدیاوە دەبێتە هۆی دروستکردنی چەند دەرئەنجامێکی بێمەبەست لەسەر بەکارهێنەر٣. لەم کورتە نوسینەدا لەسەر بنەما زانستییەکان لەچوارچێوەی بەکارهێنانی زانیاریی و ئامار و توێژینەوەی زانستییەوە باسی دەروونناسی و دەروونتدروستی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەکەین، بەشێوەیەک کە بتوانێت ببێتە سەرچاوەیەک بۆ گۆڕینی تێڕوانین و ئاڕاستەکردنی تاک، پەروەردەکاران، ئەکادیمیان، بەرپرسان و دەسەڵاتداران بۆ باشترکردنی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەناو کۆمەڵگەی کوردیدا.

### پاڵنەرەکان بۆ بەکارهێنان

ئێمە بۆچی تۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنین؟ ئەمە پرسیارێکی هەروا سادە نییە، دەروونناسان (پرۆچسکا و دیکلیمێنت) دانەرانیی قۆناغەکانی گۆڕانکاری، دەڵێن: «خەڵکی دەگۆڕێن ئەگەر فشاریان بخرێتە سەر یان گۆڕانکارییەکە هەلێکی گرنگیان پێبدات»، واتە بوونی هەل و دەرفەتی زیاتر هۆکارە بۆ بەکارهێنانی تۆڕەکان. بوونی هەل؛ بریتییە لەو سەرچاوەیەی کە ژینگە «دەیبەخشێت» بە کەسێک کە دەتوانێت بەدەستی بهێنێت١.

بەڵام سەرنجراکێشانمان بۆ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بە تەنها لە ڕێگەی بوونی هەلەوە ناتوانرێت ڕوونبکرێتەوە١. لێکۆڵینەوە و توێژینەوە نوێیەکان لەبارەی سۆشیاڵ میدیاوە، پێشنیازی ئەوە دەکەن کە بەکارهێنەران بەشداری دەکەن لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەم هۆکارە سەرەکیانە:

#### یەکەم. پەیوەستبوون (ئینتیما) (Affiliation):

پاڵنەری سەرەکی بۆ بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بریتییە لە ئارەزوو و ویستی تاک بۆ کۆمەڵایەتیبوون و پەیوەندی لەگەڵ ئەوانی تردا، خەڵکی پێویستی زۆریان هەیە بۆ پەیوەستبوون، و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان پێویستن بۆ باشبوونمان٢. لەڕێگەی پاڵنەری پەیوەستییەوە (Affinity impulse)؛ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ڕێگە بە بەشداران دەدەن بۆ دەربڕینی پەیوەستییان، ویستن یان پەیوەندی لەگەڵ خەڵکی، بەرهەمەکان، هۆکارەکان و گرووپەکان٢.

**دووەم. پڕکردنەوەی پێداویستییەکانی مرۆڤ:**

یەکێک لە پاڵنەرەکان بۆ بڵاوکردنەوەی بابەت لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، لەسەر بنەمای بیردۆزی هەرەمی پێداویستییەکانی ماسلۆ دانراوە، کە پێیوایە بەشداریکردن لە تۆڕەکان بۆ پڕکردنەوەی پێداویستییەکانە، وەکو لە خوارەوە هەیە بەگوێرەی پێنج ئاستە سەرەکییەکەی پێداویستی مرۆڤ٦:

- پێداویستییە فیسیۆلۆجییەکان: خەڵکی هەندێکجار پۆست دەکەن بۆ سودگەیاندن بە تەندروستی و باشبوونی هاوڕێیان و خێزان.
- پێداویستی بۆ سەلامەتی: لەبەرئەوەی ئاسایشی جەستەیی، دەروونی و ئابووریان گرنگە بۆ خەڵکی کاتێک کە دەیانەوێت پۆستێک بکەن.
- بوونی خۆشەویستی و ئینتیما: بەکارهێنەران بەگشتی پۆست دەکەن بۆ هەستکردن بە پەسەندی کۆمەڵایەتی لەلایەن گرووپێکەوە یان لەلایەن کەسێکی تایبەتەوە.
- پیویستی بۆ ڕێز: خەڵکی دەیانەوێت ئارامبن و خاوەن ڕێزبن، ئەمەش یارمەتیدەرە بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوەی بۆچی خەڵکی پۆستی «ناو ناخی خۆیان» بڵاودەکەنەوە.
- بەدەستهێنانی خود: خەڵکی ئەو چالاکییانە بڵاودەکەنەوە کە گەیشتوونەتە سەرکەوتن، وەکو سەرکەوتن لە پیشە، کۆتاییهێنان بە پرۆژەیەک، تەواوکردنی خوێندن...

سێیەم. گوزارشتکردن لە خود و دووبارە پیشاندانەوەی ناسنامە (Self-Expression and Identity Representation):

> **لە توێژینەوەیەکدا دەرکەوتووە کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان مەترسین بۆسەر دەروونردوستی تاک. بەشداران هەستیان بە لاوازی متمانەبەخۆبوون، خەمۆکی و بیری خۆکوژی کردووە وەکو دەرئەنجامێکی نەرێنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان.**

ئەم تۆڕەکۆمەڵایەتییانە ڕێگەمان پێدەدەن بۆ گوزارشتکردن لە خود و دووبارە پیشاندانەوەی ناسنامەی تاکەکان، تۆڕەکان ڕێگە دەدەن بۆ بەشدارپێکردنی زانیارییە کەسییەکان، ئارەزوو و خولیاکانی تاک، باوەڕ و بیرکردنەوەکان و وێنەکان لەگەڵ ئەوانی تردا، ئەمەش دەبێتە هۆی دابینکردنی شوێنێک بۆ خۆنواندن و وێناکردنی خۆیان لەسەر ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییانە٢. بە واتایەکی تر؛ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێندرێت بۆ بەردەوامبوونی پەیوەندییەکان لەگەڵ هاوڕێیان، دانانی پلانەکان، باشتر ناسینی خەڵکی

و پیشاندانی خود بەوانی تر٦.

یەکێک لە پاڵنەرە گرنگەکان بۆ ژیانی تاک بریتییە لە پاڵنەرەکان بۆ دروستکردنی خاوەنداریێتی دەروونی (Psychological Ownership). هەستی خاوەنداریێتی دەروونی، جا بۆ بەرهەمە بەرجەستەکان بێت (وەکو ئامێری مۆبایل، ئۆتۆمۆبێل) یان خزمەتگوزارییە مەعنەوییەکان (گرووپێکی وەرزشی، هەژماری تۆڕی کۆمەڵایەتی)، بە ئاسانی دەناسرێتەوە. یەکێکە لە پاڵنەرەکان بۆ بەکارهێنانی تۆڕی کۆمەڵایەتی لە ڕێگەی بەرجەستەکردنی ئەم هەستەوەیە کە لە ڕێگەی چالاکی و کاریگەری، ناسنامەی خود، بوونی شوێن و وروژاندنەوە دروست دەبێت، ئەمانەش لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەردەستن٣.

**چوارەم. بەدەستهێنانی زانیاریی و بڵاوکردنەوەی** (Information Retrieval and Dissemination):

دەستڕاگەیشتن، کۆکردنەوە و بڵاوکردنەوەی زانیاری بەشێوەیەکی خێراو و تێچوویەکی کەم لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە پاڵنەرێکی ترە. بەهۆیەوە بەکارهێنەران دەتوانن لەبارەی ژیانی ئەوانی ترەوە بزانن، لەبارەی هاوسەرگری هاوڕێکانیان، تەواوکردنی خوێندن، بۆنەکانی داهاتوو، زانیاریان دەست دەکەوێت. لە یەکێک لە توێژینەوەکاندا دەرکەوتووە کە ٥٤٪ی پەیوەندی نێوان دوو هاوڕێ کە بە کەمی پەیوەندی دەکەن بەیەکەوە لە ڕێگەی بیرخەرەوەی کاتی لەدایکبوونی فەیسبووکەوەیە٢!

هەندێکجار ئەم پاڵنەرە پێشی دەوترێت پاڵنەری کونجکاری (Curiosity impulse)؛ کە بریتییە لە ڕەزامەندبوونی کونجاکرییانە لەبارەی ئەوانی ترەوە لە ڕێگەی بەدواکەوتنیان یان بینینی چالاکییەکانیان بەشێوەی ئۆنلاین٢.

**پێنجەم. پاداشت** (Reward) **و سودی کەسی** (Personal utility impulse)

پاڵنەری سودی کەسی؛ واتە خەڵکی دەگەڕێن بۆ وەڵامی پرسیاری «چی تێدایە بۆ من؟»، گەڕان بۆ سود لە شێوازی زانیارییەکان، هاندان، چێژ و حەوانەوە٢. بەڵکو چەندین توێژینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە دەبێت ئەو شتە توانای هەبێت هاندانی ناوەکی دابین بکات بۆ بەکارهێنەرانی. واتە «توانای بوونی ئەزموونکردنی پاداشت، بەبێ بوونی هۆکارەکان، هاندەرێکی کاریگەرە، خۆشی ئەو کارەی دەیکات دەبێتە پاداشتی سەرەکی کە هانی کەسەکە دەدات دووبارەی بکاتەوە»١. توێژەران بۆیان دەرکەوتووە کە «هاندەرە کۆمەڵایەتیی و هەڵچوونییەکان ڕۆڵی گرنگیان هەیە لە ڕەفتاری بەشداریکردن لە میدیادا»٦.

لە توێژینەوە تایبەتەکاندا دەرکەوتووە کە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کاریگەری دەکاتە سەر چەند بەشێکی مێشک. بۆنمونە زۆربوونی لایکەکان لە فەیسبووک، تویتەر و ئینستاگرام دەبێتە هۆی «چالاکبوونی مێشک لەو ڕێڕەوەی پەیوەندی هەیە بە پاداشتەوە». لە توێژینەوەیەکدا کە لەسەر مێشکی نەوجەوانان کراوە لەکاتی بەکارهێنانی

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا، دەرکەووتووە کە «بینینی وێنەیەک کە لایکی زۆری هەیە، بووەتە هۆی چالاکی زیاتری ئەو بەشانەی دەمارەکان کە بەشدارن لە پرۆسەی هاندان و هزری کۆمەڵایەتی»٦. بەگشتی دەگونجێت لە هەمانکاتدا چەندین پاڵنەر بۆ تاک هەبێت بۆ بەشداریکردن لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و پۆستکردن و کۆمێنت و لایکەکانی.

### ڕەفتاری بەرکاهێنەر

ڕەفتاری بەکارهێنەر؛ بەواتای لێکدانەوەی هەڵسوکەوت و مامەڵەی ئەو کەسانەی کە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانن، کە ئایا کێن و چۆن ڕەفتار دەکەن؟ لەوبارەوە ئەم لایەنانە پەیوەستن بە ڕەفتاری بەکارهێنەرەوە:

### گۆڕینی کەسێتی!

چەند دەرئەنجامێکی بێمەبەست بۆ بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەیە. یەکەم ئەو ڕاستییە دەزانین کە ئەو کەسێتییەی خەڵکی لەسەر فەیسبووک پیشانی دەدەن، کەسێتی ڕاستەقینەی کەسەکە نییە لە زۆر لایەنەوە؛ بەڵکو کەسێتی ڕاستەقینەیان پیشان نادەن، بەکارهێنەران هەوڵدەدەن ئەو کەسایەتییە پیشان بدەن کە دەیانەوێت هەیانبێت٣. لە توێژینەوەیەکدا سەبارەت بە گۆڕانکاری لە کەسێتی بەکارهێنەری فەیسبووکدا، کە ئایا بەکارهێنەران چەندە گۆڕانکاری لە ناسنامە و کەسێتییاندا دەکەن، بەگشتی هەمووان بەڕێژەیەک گۆڕانکاری لە ناسنامەکەیاندا دەکەن، بە پیشاندانی ئەو کەسێتییەی کە ویستراوە و بەکارهێنەر پێیوایە «سەلامەتە» یان «گونجاوە»، لەوبارەوە سێ شێوازی پیشاندان و گۆڕینی ناسنامە هەیە٣:

١. ڕاستەقینە (Authenticity)؛ لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و دەرەوەی تۆڕەکانیش هەمان کەسێتی پیشان دەدەن.
٢. گۆڕینی ڕوو (Facet management)؛ بەگوێرەی لایەنەکانی ژیانیان، بەکارهێنەران گۆڕانکاری دەکەن لە ناسنامەی پیشاندراویان لەسەر فەیسبووک.
٣. گۆڕینی تێڕوانین (Impression management)؛ بەکارهێنەران هەوڵدەدەن دڵنیابنەوە لە ناسنامەکەیان لەسەر فەیسبووک بەوشێوەی کە دەیانەوێت هەستیان پێبکرێت.

### کەسێتی کۆمەڵایەتی زیاتر:

کەسێتی بریتییە لە کۆمەڵێک تایبەتمەندی تاک کە بە گشتگیربوون و جیاوازی ڕەفتارەکانی خەڵکی دەناسرێتەوە وەکو بیرکردنەوەکان، هەستەکان و چالاکییەکان. هەرکەسێک و خاوەنی کەسێتییەکی بێهاوتایە لەڕێگەی بیرکردنەوە و چالاکییەکانییەوە.

شێوازی پێنج ڕەوشتە گەورەکەی کەسێتی (The Big Five personality model) باوترین و بەکارهاتووترین بیردۆزە لەبارەی کەسێتییەوە، ئەم بیردۆزە لە پێنج هۆکاری سەرەکی پێکهاتووە؛ کۆمەڵایەتیبوون (extraversion)، کراوەیی (openness)، دەمارگیری (neuroticism)، پەسەندی (agreeableness)، ویژدانزیندوویی (conscientiousness). بەگوێرەی توێژینەوەکان تایبەتمەندی کۆمەڵایەتیبوون کاریگەری هەیە لەسەر بەردەوامبوون لەسەر تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان١. چەندین دەرئەنجامی ئەرێنی کۆمەڵایەتی و ئابووری هەیە بۆ بەکارهێنەر و کۆمپانیا بازرگانییەکان، بۆنمونە تۆرە کۆمەڵایەتییەکان یارمەتیدەرە بۆ پەیوەندیکردن بە هاوڕێیانی کۆن، یارمەتیدەرە بۆ زانیاری وەرگرتن و هەستی پەیوەندی مرۆیی دەداتە تاک کاتێک کە بەتەنهایە٣.

## بەتایبەت گەنجان و نەوجەوانان:

گەنجان زۆرتر تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی وەکو فەیسبوک و تویتەر بەکاردەهێنن وەکو خۆدەربازکردن و هەڵاتن لەو فشارە دەرەکییانەی کە لەسەریانە و مەترسییە بۆ دەروونذروستییان. لە زۆربەی وڵاتان تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بوونەتە بەشێکی سەرەکی لە پەروەردە، کلتوور و ژیانی کۆمەڵایەتی نەوجەوانان. داتاکان ئاماژە بەوەدەکەن کە بە نزیکەیی (٪٩٧) نەوجەوانان تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنن٧. تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ڕێگە بە بەکارهێنەر دەدەن کە بیرکردنەوە و هەستەکانی بەشداری پێ بکات، زۆرجار بەبێ هەژمارکردنی ڕێز و بەهاکانی لە پەیوەندییەکەدا٣، ئەمەش سەردەکێشێت بۆ دروستبوونی چەندین کێشە کە لە ئێستادا بەشێکن لە ژیانی تاکەکان، وەکو تۆڵەکردنەوەی بەدڕەوشتی١ و هەراسانکردنی ئۆنلاین٥.

## تۆڵەکردنەوەی بەدڕەوشتی:

بەهۆی یەکگرتنی هەردوو لایەنی هێزی دەربڕین و بابەتی بینراو و بیستراو، مەترسییەکی نوێی ئۆنلاینی دروستکردووە؛ بڵاوکردنەوەی «تۆڵەکردنەوەی بەدڕەوشتی» (revenge porn)، یاخود بڵاوکردنەوەی وێنەی ڕووت یان سێکسی ئەوانی تر بە مەبەستی ئازاردانیان بەو ڕێگەیە. ئەمەش ڕەفتارێکی نوێیە و دەبێتە هۆی زیانگەیاندن بە بەکارهێنەران، تێکدانی پلانی پەروەردەیی و لەهەندێک کاتدا دەبێتە هەوڵی خۆکوژی١. جۆرەکانی ڕەفتاری پۆستکردنی تۆڵەکردنەوەی بەدڕەوشتی جیاوازی هەیە لە سەرچاوە و دۆخ و مەبەستی پۆستەکە، بۆنموونە ئەگەر کەسێک پۆست لەسەر کەسانی تر بکات، ئەوە هەرچەندە لە دۆخی پۆستەکە دڵنیانین، بەڵام مەبەستی پۆستەک ڕوونە کە بۆ زیانگەیاندنە بە کەسی بەرانبەر و ئەم زانیارییانەش لە سەرچاوەی نەناسراوەوە دێن.

بڕوانە خشتەکە:

**خشتەی جۆرەکانی ڕەفتاری پۆستکردنی تۆڵەکردنەوەی بەدڕەوشتی:١**

| سەرچاوەی پۆستەکە | دۆخی پۆستەکە | مەبەستی پۆستکەر | ناسینەوەی سەرچاوە |
|---|---|---|---|
| خود | دڵنیایە | ستایشکردنی کەسەکە | سەرچاوەیەکی ناسراوە |
| ئەوانی تر | دڵنیا نییە | زیانگەیاندن بە کەسەکە | سەرچاوەیەکی نەناسراوە |
| ئۆنلاین | ناڕوونە | مەبەستی تر | سەرچاوەکەی موستەحیلە بزاندرێت. |

**هەراسانکردنی ئۆنلاین:**

هەراسانکردن(bullying)ی تەقلیدی بریتییە لە: «کێشەیەکی دەروونی کۆمەڵایەتییە، بەشێوەیەکی مەبەستدارانە و دووبارە زیان بە ئەوانی تر دەگەیەندرێت، و دروستکردنی ناهاوسەنگیی توانایە لە نێوان قوربانی و ئەنجامدەردا، کە دەرئەنجامی نەرێنی بۆ هەردوو لایەن هەیە.» هەراسانکردنی تەقلیدی زیاتر لایەنی مەترسی جەستەیی دەگرتەوە لەلایەن کەسێک یان گرووپێکی بەهێزتر بەدەربڕینی توانایان بەسەر کەسانێک کە لاوازن، بەڵام هەراسانکردنی ئۆنلاین (cyberbullying) کە زۆرجار هاوواتایە و بەگشتی ناهاوسەنگی توانای لایەنی کۆمەڵایەتی و دەروونی دەگرێتەوە. بەشێوەیەکی گشتی هەراسانکردنی ئۆنلاین بەمشێوەی ناسێندراوە: «هەراسانکردنە لە ڕێگەی ئەنتەرنێت یان ناردنی نامەوە». ژوورەکانی گفتوگۆ، تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بەرنامەکانی مۆبایل، یارییە ئەلکترۆنییەکان، چەند نموونەیەکن بۆ تووشبوون بە هەراسانکردنی ئۆنلاین٣! بەگوێرەی ڕاپرسییەکان ڕێژەی هەراسانکردن ساڵانە زیادیکردووە، سەرەڕای ئەوەی کە زۆربەی دایبابان باسیان لەوە کردووە کە منداڵان بە زۆری لە قوتابخانە تووشی هەراسانکردن دەبنەوە، (١٩.٢٪)ی منداڵان تووشی هەراسانکردن بوونەوە لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و بەرنامەکانی ئۆنلاینەوە، (٧.٩٪) یارییە ڤیدیۆییە ئەلکترۆنییەکان سەرچاوەی هەراسانکردنەکە بووە٥.

بیردۆزی بەکارهێنان و چێژوەرگرتن (Uses and Gratifications Theory):

بەگوێرەی ئەم بیردۆزە، خەڵکی بەشێوەیەکی چالاکانە هەوڵدەدەن بۆ بەدەستهێنانی بابەتێکی تایبەتی میدیا، لەپێناو مەبەست و ئامانجێکی ویستراوی تایبەتدا. ئەم بیردۆزە بەرچاوڕوونی دەبەخشێت بۆ تێگەیشتن لەوەی کە کەی و چۆن بەکارهێنەرێکی میدیا چالاک یان سست دەبێت، هەروەها دەرئەنجامی ئەو زۆریی و کەمی بەشدارییە چییە. ئەم بیردۆزە لەسەر بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیش جێبەجێدەکرێت، بیردۆزەکە پێنج گریمانەی سەرەکی هەیە١:

١. گوێگر چالاکە و ئامانجدارە لە بەکارهێنانی میدیادا.
٢. میدیا بۆ چێژوەرگرتن بەکاردێت.
٣. میدیا لە کێبەرکێدایە لەگەڵ هۆکارەکانی تری بەدەستهێنانی پێداویستییەکان.
٤. خەڵکی تێدەگەن لە بەکارهێنان و پاڵنەر و ئارەزووەکانیان، تەنانەت بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ توێژەران لەبارەی بژاردەکانیانەوە.
٥. گوێگران تاکەکەسن کە دەتوانن دادوەری بکەن لەبارەی بەهای ئەو بابەتەی لە میدیادا هەیە.

کاریگەرییەکان لەسەر دەروونددروستی (Mental Health Consequences):

گفتوگۆیەکی بەردەوام هەیە لەبارەی کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەسەر دەروونددروستی، توێژینەوەکان ئەنجامی جیاواز و تێکەڵییان هەبووە، چەندین توێژینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەییەکان وەکو کەسێکی ناچالاک یان بەکارهێنانی زانیارییەکان بەبێ بەرکەوتنی ڕاستەوخۆی کۆمەڵایەتیی کاریگەری نەرێنی دەخاتە سەر باشبوونی تاک٨. لە توێژینەوەیەکدا کە لەگەڵ نەوجەوانان کراوە، بەگشتی بەشداران باوەڕیان وابووە کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کاریگەری نەرێنیان هەیە لەسەر دەروونددروستی تاک، بەڵام ئاماژەیان بەوەداوە کە چەند کاریگەرییەکی ئەرێنیشی هەیە. لە دەرئەنجامی توێژینەوەکەدا دەرکەوتووە کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەشێوەکی گشتی زیانیان هەیە بۆ دەروونددروستی نەوجەوانان٧.

**خەمۆکی و بیری خۆکوژی:**

لە توێژینەوەیەکدا دەرکەوتووە کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان مەترسین بۆسەر دەروونددروستی تاک. بەشداران هەستیان بە لاوازی متمانەبەخۆبوون، خەمۆکی و بیری خۆکوژی کردووە وەکو دەرئەنجامێکی نەرێنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان٧. هەروەها ئەو کەسانەی کە لە خوار تەمەنی (٢٥)ساڵەوەن و دەبنە قوربانی هەراسانکردنی ئۆنلاین، دووهێندەی کەسانی تر هەوڵی خۆکوژی دەدەن٥.

کەڵەکەبوونی زانیارییەکان؛ یەکێک لە تایبەتمەنییەکانی هەواڵی ئەم سەدەیەیە، کە بریتییە لە زۆری بڕی ئەو زانیارییانەی کە بەکارهێنەران بەرکەوتنیان هەیە لەگەڵی. ئەو زانیارییە هەواڵییانەی لە ماوەی (٣٠) ساڵی ڕابردوو بڵاوکراونەتەوە زیاترە لە هەموو زانیارییەکانی (٥٠٠٠) ساڵی ڕابردوو٣! لە توێژینەوەیەکدا دەرکەوتووە کە کەڵەکەبوونی زانیارییەکان لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەم ڕێگایانەوە دەبێت٣:

- زۆربوونی بڕی زانیارییە هەواڵییەکان.
- زۆر قورسە بتوانیت خۆت بەدوربگریت لە بەرکەوتن بە هەواڵەکان.
- نادڵنیایی سەبارەت بە ڕاستییەتی هەواڵەکان.

- نادڵنیایی سەبارەت بە مەبەستداری هەواڵەکە.
- پێشکەشکردنی بابەتی ناپەیوەندیدار.

لە توێژینەوەیەکدا لە زانکۆی پەنسلڤانیا کە لەسەر (١٤٣) خوێندکاری زانکۆ کراوە، سەبارەت بە کاریگەری کەمکردنەوەی کاتی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەسەر دەروونددروستی تاک، دەرکەوتووە کە ئەو گرووپەی کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان (فەیسبووک، ئینیستاگرام و سناپچات)یان ڕۆژانە بۆماوەی ١٠ خولەک کەمتر بەکارهێناوە لە چاو گرووپەکەی تردا، ئاستی هەستکردن بە تەنهایی و خەمۆکییان کەمی کردووە. توێژینەوەکە وەکو دەرئەنجام دەڵێت: «سنووردارکردنی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بۆماوەی (٣٠) خولەک لە ڕۆژێکدا دەبێتە هۆی باشترکردنی هەستکردن بە باشی تاک.»٤

**دڵەڕاوکێ و فشاری دەروونی:**

چەندین توێژینەوە ئاماژە بە کاریگەری ناچالاکانەی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەکەن لەسەر توشبوون بە فشار و دڵەڕاوکێ٨. یەکێک لە کێشەکانی سۆشیاڵ میدیا بریتییە لە بڵاوکردنەوەی زانیاری هەڵە و ناڕاست، بە هەواڵی ساختە(fake news) ناسراوە کە سەرچاوەیەکی سەرەکییە بۆ تووشبوونی تاک بە دڵەڕاوکێ٩. بەهەمانشێوە زۆر بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، زیانی شاراوە و نەبینداروی دەبێت لەسەر تاک، وەکو خراپبوونی بڕی خەوتن، کەمبونەوەی بەختەوەری کەسی، دابەزینی ئاستی ئەکادیمی، و دەرئەنجامی نەویستراوی دەروونی وەکو دڵەڕاوکێ و خەمۆکی١٠.

**دڵپیسی هاوسەران:**

بەهۆی دابینکردنی زانیاری زۆر سەبارەت بە لایەنەکانی کۆمەڵایەتی تاکەکان، پەیوەندییە سۆزدارییەکان و چالاکییەکانی ئێستای، دەبنە هۆی هەستکردن بە دڵپیسی (غیرە) لەلای هاوسەران. توێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەکەن کە زۆر بەکارهێنانی فەیسبووک یان بەشداری زۆر لە فەیسبووک دەبێتە هۆی دروستبوونی پەیوەندی دڵپیسی و نەبوونی ڕەزامەندی هاوسەری١.

**توندوتیژی:**

گەڕان لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و خودبەراوردکاری، دەبێتە هۆی ئەوەی کە خەڵکی هەست بە کەمی خۆیان بکەن لە بەرانبەر ئەوانی تر، هەست بە ئیرەیی و توڕەیی بکەن٨. ڕێژەیەکی زۆر لە توێژینەوە کراوە لەسەر کاریگەری بەرکەوتن بە میدیای توندوتیژ لەسەر ڕەفتاری توندوتیژی، بەتایبەت لەسەر شێوازی ئۆنلاین وەکو سایتەکانی یاریکردن، فەیسبووک، ژوورەکانی گفتوگۆ، بەرکەوتن بە میدیای توندوتیژ دەبێتە هۆی توشبوونی تاک بە توندوتیژی و ڕەفتاری توندوتیژانە٢.

## ئالودەبوون بە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان:

چەندین بەڵگە هەن پێشبینی دەکەن کە زۆر بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەوانەیە ببێتە هۆی ئەو نیشانانەی کە لە ئالوودەبوون بە مادده هۆشگۆڕەکانەوە هەیە، ئەو نیشانانەش وەکو گرنگبوونی ڕەفتارەکە لای تاک، گۆڕانکاری لە مەزاج، بەرگەگرتن (Tolerance)، نیشانەکانی لێگیرانەوە (Withdrawal)، دووبارە توشبوونەوە و بوونی کێشە بەهۆی ڕەفتاری ئالودەبوونەوە١١. لە توێژینەوەیەکدا لەگەڵ نەوجەوانان کراوە، سەرەڕای ئەوەی کە بەکارهێنەری سەرەکی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانن، زۆربەیان باسیان لەوە کردووە کە هەتا ڕادەیەک تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ئالودەکەرن٧. لەبەرئەوەی کە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان پەیوەندییان هەیە بە سیستەمی پاداشت لە مێشکی مرۆڤدا، کە سەرچاوەیە بۆ خراپ بەکارهێنان وەکو بەکارهێنانی ماددەی هۆشگۆڕ و قومارکردن. لەبەرئەوە پێویستە بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەم مەترسییە بەئاگابن٦. ئالوودەبوون بە فەیسبووک یەکێکە لە نموونەکان، تاک ئەگەری هەیە ئالودەی بەکارهێنانی هەر تۆڕێکی تری کۆمەڵایەتی ببێت١١. لە توێژینەوەکدا لەسەر خوێندکارانی زانکۆ لە وڵاتی چین، بە بەکارهێنانی ڕاپرسی تایبەتی، دەرکەوتووە کە (٪١٤.٨)ی بەشداران ئالودەی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بوون١٠.

بەڵگەکان ئاماژەبەوە دەکەن کە هەڵپەکردن بۆ بەکارهێنانی تەکنەلۆجیا، کە ناوکرۆکی ئالودەبوونە بە تەکنەلۆجیا و لەنێویشیاندا تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، کایگەری هەیە لەسەر هەستکردن بە سوتانەوە و بێزاری دەروونی بەهۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە١٠.

## تێکچوونی خودبینی بۆ جەستە

چەندین توێژینەوە ئاماژە بەوە دەکەن کە میدیای تەقلیدی (تەلەفیزیۆن، بەرنامەکان، ڕیکلامکردن) کاریگەرییان هەیە لەسەر بڕیاری ئافرەتان بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەری جوانکاری. ئەم کاریگەرییە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان زۆرتر و کاریگەرترە، لە توێژینەوەیەکدا کە لەسەر سەد و هەژدە ئافرەت کراوە لە تەمەنی نێوان (١٨-٢٩) ساڵیدا سەبارەت بە کاریگەری بینینی ئەو ئافرەتانەی کە جوانکارییان لە دەموچاویاندا ئەنجامداوە، لەسەر تێڕوانینیان بۆ خۆیان و ئارەزوویان بۆ ئەنجامدانی کرداری جوانکاری. لە توێژینەوەکەدا دەرکەوتووە کە بینینی وێنەی ئەو کەسانەی کە جوانکارییان کردووە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کاریگەری هەبووە لەسەر ئارەزووی ژنەکان بۆ ئەنجامدانی نەشتەرگەی جوانکاری، ئەو ئافرەتانەی کە زۆر لەسەر تۆڕی کۆمەڵایەتی دەمێننەوە و هاوڕێ و پەیجی زۆریان لایە زیاتر دەکەونە ژێر ئەم کاریگەرییەوە١٢.

هەروەکو ئاماژەمان پێدا، لە ڕابردوو میدیای تەقلیدی لە ڕێگەی ڕیکلامەوە کاریگەری هەبووە، لەسەر گۆڕینی تێڕوانینی تاک بۆ وێنەی جەستەی خۆی. تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان چەندین جیاوازییان هەیە لەگەڵ میدیای تەقلیدی لەڕووی کاریگەری لەسە وێنەی جەستە، ئەوانیش بریتین لە١٣:

١. لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکارهێنەران خۆیانن، بەپێچەوانەی میدیای تەقلیدی کە هونەرمەندان و کەسانی ڕیکلامکەر بوو.

٢. خەڵکی شێوازە خەیاڵییە ویستراوەکەی خۆیان لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان پیشاندەدەن. تەنها وێنە سەرنجڕاکێشەکانیان دادەنێن (جوانکاریشی تێدا دەکەن)، وێنە نەخوازراو و ناشیرینەکان لادەبەن.

٣. تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وێنەی چەندین کەسی جیاوازیان تێدایە (وەکو هاوڕێ، خێزان، نەناسراو، کەسانی بەناوبانگ)، هەروەها توێژینەوەکان ئاماژە بەوەدەکەن کە خۆبەراوردکردن بە هاوڕێیان کاریگەری گەورەی هەیە لەسەر وێنەی جەستە.

٤. هەروەها سەرەڕای دانانی وێنە، خەڵکی زۆرجار پۆست یان کۆمێنت دەنوسن لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کە پەیوەندی هەیە بە دەرکەوتنی کەسەکەوە، ئەمەش کاردەکاتە سەر تێڕوانین و هەستی بەکارهێنەر بەرانبەر بە جەستەی خۆی.

توێژینەوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە گەڕان بەنێو پۆستە ئەرێنییەکانی ئەوانی تر لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، کاردەکاتە سەر باشبوونی تاک و خۆبەراوردکردن بە باڵاتر لە خۆی. خەڵکی خۆیان بەراورد دەکەن بە کەسانی باڵاتر و خوارتر لە خۆیان. لەبەرئەوە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەئاسانی هانی بەراوردکردنی کۆمەڵایەتی دەدات٨. تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی وەکو ئینستاگرام، پینتێست و تویتەر، پۆستی بینراو و گوتراویان تێدایە کە سەبارەت بە وێنەیەکی خەیاڵی لاشە و هاندان بۆ بنیاتنانی کلتوورێکی «هاندەری جەستەی لاواز»! توێژینەوەکان دەریانخوستووە کە ڕیکلامکەرە جەستە لاوازەکان بەشێوەیەکی نەرێنی کاردەکەنە سەر تێگەیشتنی تاک لەبارەی شێوەی جەستەییەوە و هەڵسەنگاندنی خود بۆ سەرنجڕاکێشی٣.

توێژینەوە پەیوەندیدارەکان ئەوەیان پیشانداوە کە بەکارهێنانی تۆڕی کۆمەڵایەتی (بەتایبەت فەیسبوک) پەیوەندی هەیە بە وێنەی جەستەوە لەناو ژنان و پیاوانی گەنجدا. هەروەها خۆبەراوردکردنی دەرکەوتنی تاک، ڕۆڵی هەیە لە پەیوەندی نێوان تۆڕی کۆمەڵایەتی و وێنەی جەستە١٣. بەهەمانشێوە زۆربەکارهێنانی ئینستاگرام، پەیوەندی هەیە بە تێڕوانین بۆ وێنەی جەستە٤.

### سودەکانی بەکارهێنان بۆ دەروونڕوستی:

هەرچەندە توێژەران زیاتر سەرنجیان لەسەر کاریگەرییە نەرێنییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانە، بەڵام هێشتا چەند سودێکی هەیە بۆ دەروونڕوستی تاک. بۆنموونە چەندین هەل دەدەنە تاک بۆ دروستکردنی هاوڕێیەتی و دڵخۆشی، بەتایبەت گەنجان دەتوانن بە ئاسانی پەیوەندی هاوڕێیەتی و پەیوەستی بەهێز دروستبکەن بەهۆی ئاسانی دەستڕاگەیشتن بە زانیاریی و ئارەزووەکانی هاوڕێکانیان. هەروەها زیاتر هەست بە سەربەخۆیی دەکەن و توانای بڕیاردان و بیرکردنەوەی ڕەخنەگرانەیان گەشەدەکات. لە توێژینەوەکاندا ئاماژە کراوە بەم سودانەش٦:

- بەشداری کۆمەڵایەتی لەگەڵ گرووپێک کە هەمان ئارەزوویان هەیە.
- هاندان و پاڵنان بۆ ژیانێکی ئەرێنی لە ڕووی تەندروستی و جەستەوە.
- بوونی گرووپی پشتیوانی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان.
- هێشتنەوە و دروستکردنی پەیوەندی نوێ.
- ئاشنابوون بە شێوازی نوێی بیرکردنەوە.

### دەرئەنجام (Conclusion):

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کاریگەری گەورە لەسەر دەروون و دەروونڕوستی تاک دادەنێت، لە ڕۆژگاری ئەمڕۆدا زۆرترین کەس هەژماری هەیە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و بەشێوەی ڕۆژانە و بەردەوام بەکاریدەهێنێت. گرنگ و پێویستە کە بەشێوازە زانستییەکەی لەم بابەتە تێبگەین و بزانین چۆن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەین. ئەگەر تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەلایەن کەسانی پێگەیشتوو، کە هەستی بەرپرسیارێتیان هەیە بەکاربهێندرێت ئەوە هەلێکی باشە کە گفتوگۆی لەبارەوە بکرێت، بۆ باشکردنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و هەروەها ئەنجامدانی بازرگانی. بەپێچەوانەشەوە کاتێک کە بەشێوەیەکی نابەرپرسانە بەکاردەهێندرێت لەلایەن کەسانێکەوە کە زۆر گەنجن دەتوانێت ببێتە هۆی دروستکردنی کێشە و ناڕەحەتی کە هەندێکجار لەوانەیە نەتواندرێت بسڕدرێتەوە١. توێژینەوە و لێکۆڵینەوە لەسەر چەندین لایەنی دەروونی ئەم تۆڕانە کراوە، سەرجەمیان ئاماژە بە مەترسییەکانی دەکەن لەسەر دەروونڕوستی تاک و بەتایبەت گەنجان و نەوجەوانان، کە زۆرترین بەشدارییان هەیە و بە ئاسانی دەکەونە ژێر کاریگەری ئەم تۆڕانە و کۆمپانیا و دامەزراوە گەورەکانەوە.

لەسەر ئاستی جیهان ڕێگە و ڕێوشوێنی تایبەت بە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەیە و توێژەران و پەروەردەکاران بەردەوام هەوڵی لێکدانەوەی ئەم دیاردەیە دەدەن. لە کوردستان کەمترین زانیاری هەیە لەسەر ئاستی بەکارهێنان و لەوەش مەترسیدارتر زانیاریی و شارەزایی بەکارهێنان لای تاکی کورد لاوازە. لەبەرئەوەشە کە نەمانتوانیوە لەم لێکۆڵینەوەدا سود لە سەرچاوەی کوردی وەربگرین! تەنانەت بابەت و پۆستی تایبەتیش لەسەر ئەم تەوەرە و لێکدانەوەی لەڕووی دەروونییەوە کەمە و زۆربەی پۆستەکانیش لاوازن و باسکردنن لە ئەزموونی کەسی.

**ڕێکارەکانی داهاتوو** (Future Interventions):

لەم بەشەدا ئاماژە بە چەند ڕێکارێک دەکەین کە پێویستە لایەنە پەیوەندیدارەکان جێبەجێی بکەن هەتا بتوانن لە زیانە دەروونییەکانی خۆیان و نەوەکانیان بپارێزن.

بەکارهێنەران: ئەو کەسانەی کە گەورەن و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنن، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەن هەتا بتوانن لە کاریگەرییە نەرێنییەکانی خۆیان بەدووربگرن:

١. بوونی هەژمار لە کەمترین تۆڕی کۆمەڵایەتی؛ چونکە هەتا ژمارەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان زیاتر بن کاتی زیاتری دەوێت و مرۆڤ زیاتر گیرۆدەیان دەبێت.

٢. کاتی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کەمبکرێتەوە بۆماوەیەکی دیاریکراو؛ بۆ کەسێک کە تەنها بۆ پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەکاریدەهێنێت باشترە نەگاتە یەک سەعات لە شەو و ڕۆژێکدا.

٣. پیشاندانی خودی ڕاستەقینە و دورکەوتنەوە لە نمایشکردن و گۆڕانکاری لە خود؛ چونکە مرۆڤ کاتێک کە خودێکی ساختە پیشاندەدات هەست بە کەمی خۆی دەکات و بەو ساختەکارییەی لەڕووی دەروونییەوە ناڕەحەت دەبێت، ئەمە جگەلەوەی کە لەلایەن خزمان و هاوڕێیانەوە هەست بەو ساختەکارییە دەکرێت.

٤. دوورکەوتەنەوە لە خۆبەراوردکردن بەوانەی تر؛ لە ڕێگەی بوونی تێڕوانینی دروست بۆ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بەشێوەیەک تاک تێبگات کە بەشێکی زۆری وێنە و بابەتەکان خۆجوانکردنن و ساختەن، ئەمەش لەپێناو دورکەوتنەوە لە خۆبەراوردکردنی هەڵە بەوانی تر.

٥. دورکەوتنەوە لە دروستکردنی پەیوەندی و نامە گۆڕینەوە لەگەڵ کەسانی نەناسراو و گەورەتر لەڕووی تەمەن! ئەمەش چەند نموونەیەک بۆ خۆپاراستن:

- وەرنەگرتنی ئەو کەسانەی کە هەژماری نەناسراویان هەیە وەکو هاوڕێ.
- وەڵامنەدانەوەی نامەی کەسانێک کە نەناسراون و نامە دەنێرن بەناوی یەکترناسین.
- هیچ کەسێک نەکاتە هاوڕێی هەتا نەزانێت کێیە و کەسێتی چۆنە.
- نەکەوتنە ژێر کاریگەری وشە هەستبزوێنەکانی وەکو؛ بەهۆی جوانییەکەتەوە نامەم نارد، ئارەزوو دەکەم لەگەڵ کەسێکی خاوەنکەسێتی وەک بەڕێزت ببمە هاوڕێ، لە پۆستەکانتەوە دیارە کە کەسێکی بەتوانایت، ...
- دوورکەوتنەوە لە دروستکردنی پەیوەندی سۆزداری لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە.
- نەناردنی وێنە و ڤیدیۆ بۆ کەسانێک کە تەنها لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هاوڕێن.
- دورکەوتنەوە لە چاتکردن لەگەڵ کەسانێک کە نەناسراون یان مەبەستێکی تایبەتییان هەیە.

٦. دوورکەوتنەوە لە گەڕان بەناو هەژماری ئەوانی تر و چاودێری و کونجکاریی نائاسایی؛ واتە خۆی بەدوربگرێت لە گەڕان بەدوای ڕووداوەکانی ژیانی کەسانی تردا کە چی دەکەن و پەیوەندییان لەگەڵ کێ هەیە.

٧. لەسەر تۆڕەکان ناچالاک نەبن؛ واتە تەنها سەیرکەر نەبن، بەڵکو بەشداری چالاکانەیان هەبێت لەڕووی پۆستکردن، لایک، کۆمێنت و ... ناچالاکبوون هۆکارە بۆ پەنگخواردنەوە و زۆرتربوونی ڕق و کینەی تاک.

٨. هەوڵدان بۆ نوسین و پۆستی سودبەخش و لەکاتە پێویستەکاندا؛ بۆنموونە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی یان سیاسی بە دروستی باسبکات، کۆمێنتی پیرۆزبایی بۆ هاوڕێیان لەکاتی بۆنەکاندا، وێنەی شیاوی خۆی دابەزێنێت، ...

٩. هەڵسەنگاندن و پشکنینی خود؛ ستراتیجییەکی تر لەوانەیە ئەو بەرنامانە بێت کە دەبنە هۆی زیادکردنی هەسەنگاندنی خودی و بەئاگایی بۆ بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وەکو بەرنامەکانی (In Moment) و (Space) کە پێتدەڵێت هەتا چ ڕادەیەک ئالودەبوویت بە مۆبایلەکەتەوە٤.

١٠. پشوو وەرگرتن؛ ئەم دوو لایەنە دەگرێتەوە:

- هەرگیز لە بۆنەکۆمەڵایەتییەکان کە خزمان یان هاوڕێیان کۆبوونەتەوە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکارنەهێندرێن، بەڵکو مۆبایل لە دووری خۆیان دابنێن!
- هەوڵبدرێت ساڵانە یاخود مانگانە بۆماوەیەک لە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دوربکەوێتەوە، بۆنموونە مانگی جارێک بۆ ٣ ڕۆژ نەچێتە سەر تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان.

ئەم دوو خاڵە یارمەتیدەرن بۆ دوورکەوتنەوە لە ئالودەبوون بە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان..

دایباب: پێویستە کە منداڵان تێبگەیەندرێن کە نابێت تۆڕی کۆمەڵایەتییان هەبێت، هەرگیز ڕێگە نەدەن منداڵان لە خوار تەمەنی ١٥ ساڵان ببنە خاوەنی هەژماری کەسی! ئەوان هێشتا منداڵن و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بۆ ئەوان شیاو و گونجاو نییە، بەڵام ئەگەر منداڵێک تۆڕی کۆمەڵایەتی هەبوو یان لە تەمەنی نەوجەوانی تۆڕی کۆمەڵایەتی دانا! پێویستە دایباب ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەن:

١. ڕێگریکردن؛ هەتا دەتوانن ڕێگری بکەن لە بوونی تۆڕی کۆمەڵایەتی لە خوار تەمەنی (١٥) ساڵان. ئەگەرنا با بەگوێرەی تەمەنی ڕێگەپێدانی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییە بێت کە ماڵپەڕەکە خۆی دایناوە، بۆنموونە بۆ بوونی هەژمار لە فەیسبووک، سناپچات و تیکتۆک نابێت کەسەکە لە ١٣ ساڵ کەمتر بێت. دەبێت بیرمان نەچێت ئەمانە بۆ کۆمەڵگای ئەورووپی دانراون، لەبەرئەوە ئێمە بۆ کۆمەڵگەی کوردی لە خوار ١٥ ساڵ بە هەڵە دەزانین تۆڕی کۆمەڵایەتییان هەبێت.

٢. ڕێگە نەدەن کە منداڵان تۆڕی کۆمەڵایەتییەکانی دایباب بەکاربهێنن و بەڕێوەی ببەن؛ بەکارهێنانی هەژمارەکانی دایباب لەلایەن منداڵانەوە هاندەرە بۆ دروستکردنی هەژماری کەسی و، هەروەها هەندێک بابەت دەبینن کە نەگونجاوە بۆیان، لەبەرئەوە باشترە کە ڕێگەنەدرێت منداڵەکانیان تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی دایباب بەڕێوەببەن.

٣. هاوڕێیان بە؛ دەبێت دایباب لە تۆڕی کۆمەڵایەتی هاوڕێی منداڵەکەیان بن، هەتا ئاگاداری پۆست و کۆمێنت و هاوڕێکانی منداڵەکانیان بن. لێرەوە ئاسانتر دەتوانن مامەڵەیان لەگەڵ بکەن لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان. تەنانەت دەبێت یەکێک لە دایباب لەو تۆڕە کۆمەڵایەتیەی منداڵەکەیان هەیەتی خۆشیان هەژمار دروستبکەن!

٤. چاودێریکردن؛ پێویستە کە دایباب لەکاتی بەکارهێناندا چاودێری منداڵەکەیان بکەن و بزانن کە لەگەڵ کێ و بۆچی مەبەستێک پەیوەندی دەکەن. ئەمەش بەمانای ئەوە نایەت کە بەردەوام چاویان لەسەریان بێت، بەڵکو کاتێک کە بەکاریدەهێنن هەندێکجار لەگەڵیان بن و بزانن چی دەکەن!

٥. ڕێنیشاندان؛ ڕێنماییکردن و ئاڕاستەکردنی منداڵان لەسەر چۆنییەتی خۆپاراستن لە هەراسانکردنی ئۆنلاین و تۆڵەکردنەوەی بەدڕەوشتی، کە دوو دیاردەی مەترسیداری ناو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانن.

٦. کات و شوێنی دیاریکراو هەبێت بۆ بەکارهێنانی تۆڕی کۆمەڵایەتی؛ بۆنموونە منداڵان ماوەی چەندە لە شەو و ڕۆژێکدا دەتوانن لەسەر هێڵبن، لە چی ژورێک بەکاری بهێنن، ... ئەم دوو خاڵە بە ڕوونی لەگەڵیان باسبکرێت و لەسەری ڕێکبکەون.

٧. پێشەنگێکی باشبن لەڕووی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، دوو خاڵ هەیە لەم لایەنەوە زۆر گرنگە کە دایباب جێبەجێی بکەن:

– کراوەبن لەگەڵ منداڵاندا لەڕووی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان؛ بۆنموونە کاتێک کە دایباب تۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنن ئاسایی بێت کە منداڵەکەیان لەگەڵیان بێت، هەتا ئەوانیش ڕێگە بە دایبابیان بدەن!

– ماوەی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی دایباب دیاریکراوبێت و زۆر بەرکارینەهێنن. بەڵکو دەبێت هەوڵبدەن کەمترین کات مۆبایل و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکاربهێنن.

٨. پاڵاوتن: بەکارهێنانی ئەو بەرنامانەی کە فلتەری هەندێک لە بابەت دەکەن کە بۆ منداڵان نەشیاوە، لە ئێستادا تۆڕی ئنتەرنێتی تایبەت هەیە کە خۆی هەندێک بابەت فلتەر دەکات.

٩. قوتابخانە بەشداری پێ بکە؛ هاندان و داواکاری لە قوتابخانە هەتا بابەت لەسەر هۆشیاری بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بدەنە نەوجەوانان.

١٠. هەلیان بۆ برەخسێنن؛ پڕکردنەوەی کاتەکانی منداڵ بە پەیوەندی کۆمەڵایەتی ڕاستەوخۆ و ڕاستەقینە و ڕەخساندنی هەل بۆ دوورکەوتنەوە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان. بۆنموونە

یاریکردن، بردنە دەرەوە، چیرۆک گێڕانەوە، وێنەکێشان، ...

چەندین ڕێگە هەیە کە دایباب بەکاریدەهێنن بۆ وەڵامدانەوەیان بەرانبەر بە هەراسانکردنی ئۆنلاین، بەربڵاوترین جۆری وەڵامدانەوە بریتییە لە قسەکردن بۆ منداڵان لەبارەی سەلامەتی بەکارهێنانی ئۆنلاین. وەڵامی دایباب دوای تووشبوونی منداڵەکانیان بەم هەراسانکردنە بەمشێوە بووە: (٥٩.٤٪) قسەیان بۆ منداڵەکە کردووە لەبارەی سەلامەتی و چۆنێتی خۆپاراستنەوە، (٤٣.٤٪) دەستدرێژیکارانیان بلۆک کردووە، (٤٠.٦٪) کارەکەیان داوەتە دەست لێکۆڵەرەوان، (٣٣٪) ڕێسای نوێی بەکارهێنانی تەکنەلۆجیایان بەکارهێناوە، تەنها (٣٤.٩٪) قوتابخانەیان ئاگادارکردۆتەوە لەبارەی ڕووداوەکەوە، هەروەها (١٠.٤٪) بە تەواوی تەکنەلۆجیایان لە منداڵەکان قەدەغەکردووە٥.

قوتابخانە و وەزارەتی پەروەردە:

یەکێک لە دامەزراوە کاریگەر و گرنگەکان لە کۆمەڵگەدا لەڕووی پەروەردەییەوە بریتییە لە قوتابخانە، لە ڕووی کاریگەری لەسەر کەمکردنەوەی زیانە دەروونییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، لەم ڕێگایانەوە دەتوانێت سودبەخشبێت:

١. بەکارنەهێنانی تۆڕی کۆمەڵایەتی بەشێوەی فەرمی بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ قوتابیان! قوتابخانە نابێت ببێتە هۆی ناچارکردنی قوتابی بۆ بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان!
٢. ئەنجامدانی کۆڕ و سیمینار و چالاکی جۆراوجۆر لەلایەن کەسانی شارەزا و پسپۆڕەوە لەبارەی چۆنییەتی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەلایەن قوتابیانەوە.
٣. تۆمارکردنی هەر کێشە و گرفتێکی قوتابی کە بەهۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە ڕوودەدات بۆ لایەنی پەیوەندیدار (دایباب یان دەسەڵات)، ئەمەش لەپێناو ڕووبەڕرووبونەوەی کێشەکە و چارەسەرکردنی بەشێوەیەکی دروست.
٤. دانانی پرۆگرامێکی تایبەتی لەسەر چۆنییەتی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و یارییە ئەلکترۆنییەکان، وەکو وانەیەکی تایبەتی بخوێندرێت.
٥. گرنگیدان بە ڕێنماییکارانی پەروەردەیی ناو قوتابخانەکان وەکو سەرچاوەیەک بۆ هاوکاریکردنی خانەوادەکان لەکاتی بوونی کێشە بەهۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە.

دەزگاکانی ڕاگەیاندن:

لە ئێستادا هەموو دەزگا میدیاییەکان بەشێکی گەورە و گرنگیان بریتییە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، لە زۆربەی تۆڕەکان هەژمار و پەیجی تایبەتییان هەیە بۆ بڵاوکردنەوەی زانیاری و هەواڵ، بەداخەوە لە کوردستان کێشەی گەورەیان هەیە و پۆستەکانیان تەنها بۆ زۆرکردنی بینەر و کۆمێنت و لایکە، ئەمەش قەبارەی مەترسییەکەی زیاتر کردووە، بەبڕوای ئێمە پێویستە ئەم خاڵانە ڕەچاو بکەن لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیان:

١. ئەم دەزگایانە پێویستە بەشێوەیەکی پیشەییانە و هەستکردن بە بەرپرسیارێتی

کاربکەن، خۆیان بەدوربگرن لە بڵاوکردنەوەی بابەتی هەڵە و ناڕاست.

٢. ئاگاداری دەروونددروستی تاک بن لەکاتی بڵاکردنەوەی هەواڵ و بابەتەکان، بەتایبەت پۆستی لایڤ و قسەکردن لەسەر ڕووداوە تاوانکارییەکان.

٣. ئەو کەسانەی کە لە بواری بەرهەمهێنانی بەرنامە و هەواڵدا کاردەکەن، پێویستە کەسانی ئەکادیمی و پیشەیی بن و لە دەرئەنجامی هەواڵ و بەرنامەکان تێبگەن.

٤. ئەنجامدانی ڕاهێنانی میدیایی لە زانکۆکان و شوێنی کار سەبارەت بە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، دەتوانێت ببێتە هۆی کەمکردنەوەی کاریگەرییە نەرێنییەکان١٢.

ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکان:

یەکێک لە کێشە گەورەکان کە پێویستی بە ڕووبەڕووبونەوە هەیە لەسەر ئاستی ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکان بریتییە لە هەراسانکردنی ئۆنلاین و فلتەرکردنی بابەتەکان. لە ئێستادا ڕێکخراوەکان و کۆمپانیا و قوتابخانەکان بە چەندین شێوەی جیاواز کاردەکەن لەگەڵ هەراسانکردنی ئۆنلاین. بۆنموونە: پێویستە کەسەکە بە هەژماری خۆی پۆست وکۆمێنت بنوسێت و ناوی ئاشکرا بێت، داخستنی کۆمێنت هەیە لە ماڵپەڕەکان، سنورداركردنی خوێندکاران بۆ بەرکاهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەکاتی دەوامی قوتابخانە، گۆڕانکاری لە چەند پەیجێک کە مەترسین، بۆنموونە لابردنی پۆستی نەگونجاو لەلایەن فەیسبووکەوە٣.

هەروەها دەبێت ئەم ماڵپەڕانە کاری زیاتر و گەورەتر بکەن لەسەر بوونی سەرچاوەی ڕێگریکردن لە هەراسانکردن و خۆکوژی٣. ئەرکی لایەنی پەیوەندیدار و پسپۆڕانە کە توێژینەوەی زانستی بکەن بەمەبەستی کەمکردنەوە و چارەسەرکردنی کێشەکان و بیگەیەننە ئەو ماڵپەڕانە هەتا کاری لەسەر بکرێت.

**پسپۆڕانی بواری دەروونی:**

پسپۆڕانی بواری دەروونی زۆر لایەن دەگرێتەوە؛ دەروونناسان، چارەسەرکارانی دەروونی، ڕێنماییکاران، پزیشکانی دەروونی، ... هەموو ئەو پسپۆڕیانە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەن و بەشداری دەکەن وەکو تاکێک لەناو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، پۆست و کۆمێنت و شیکردنەوە دەکەن بەبێ بوونی لێکۆڵینەوە و بەئاگابوون لە کاریگەری وتە و کردارەکانیان لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان.

ڕێکخراوی (The Association of State and Provincial Psychology Boards) کە ڕێکخراوێکە بۆ دەروونناسان، لە کەندا و ئەمریکا کاردەکات، بەم نزیکانە ڕێککاری بەکارهێنانی تۆرە کۆمەڵایەتییەکانی داناوە بۆ ئەندامەکانی! هەروەها هەردوو ڕێکخراوی (Oregon Board of Psychology) لە ساڵی (٢٠١٨)، (American Psychological Association) لە ساڵی (٢٠١٩) کار لەسەر دانانی هەمان ڕێکاری

دەکەن بۆ ئەندامەکانیان و ڕەشنوسیان ئامادەکردووە. پەیوەندی لە ڕێگەی ئۆنلاینەوە لە ئێستادا لەلایەن دەروونناسانەوە زۆر بەکاردەهێندرێت، لەبەرئەوە پێویستی بە ڕێکخستن هەیە هەتا بزاندرێت چی گونجاوە و چی نەگونجاوە لەوبارەیەوە. پێویستە کە ڕێنمایی و ڕەوشتی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بۆ دەروونناسان دابندرێت، واپێشبینی دەکرێت کە ئەم ڕێنیشاندەرانە ببنە بۆی باشترکردنی چاودێری و پاراستنی کۆمەڵ١٤.

بۆ ئەو کەسانە کە لە بوارێکی دەروونیدا پسپۆڕییان هەیە، کاتێک لە تۆڕێکی کۆمەڵایەتی هەژماریان هەیە، پێویستە ڕەچاوی ئەم خاڵانە بکەن، هەتا دەروونڕوستی هاوڕێیانیان بپارێزن:

١. ڕای کەسی جایبکەنەوە؛ لەکاتێکدا کە پۆستێک یان بابەتێک لە بارەی شتێکەوە دەبنوسن و بڵاوی دەکەنەوە دەبێت ڕای کەسی و بابەتە زانستییەکان لەیەکتر جیابکەنەوە، هەرکات کە ڕا و سەرنجی کەسیی بوو وەکو بنەمایەکی زانستی باسی نەکەن و ئاماژە بەوە بکەن کە ئەوە بابەتێکی کەسییە!

٢. نوسینی سەرچاوە؛ بەبێ سەرچاوەی زانستی باسی بابەتە دەروونییەکان نەکەن و هەوڵبدەن لەکاتی نوسینی بابەت و پۆستەکاندا پشت بە چەند سەرچاوەیەک ببەستن. بەداخەوە لە ئێستادا چەندین بابەت بڵاودەکرێتەوە بەبێ ئاماژەکردن بە سەرچاوەی زانیارییەکان، پێویستە کەسانی پسپۆڕ لەم هەڵەیە دووربکەونەوە.

٣. پاراستنی هەردوو لایەنی «تایبەتمەندی و نهێنیپارێزی»؛ کاتێک کەسێک یان هاوڕێیەکی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان داوای هاوکاری لێکردووە! بەداخەوە لە ئێستادا نامە و پۆست و قسەی کەسەکان بڵاودەکرێتەوە بەبێ هەژمارکردنی نهێنیپارێزی کەسەکە!

٤. دوورکەوتنەوە لە بڵاوکردنەوەی بابەت و هەواڵی ناڕاست و ساختە؛ زۆرجار بەهۆی متمانەی هاوڕێیان بەوکەسەی ئەو پۆستەی کردووە باوەڕ بە هەواڵەکە دەکەن و دەرئەنجام بەهۆیەوە کەسانێکی زۆر گیرۆدە دەبن. لەبەرئەوە دەبێت پێش بڵاوکردنەوەی هەر بابەتێک لە ڕاستی بابەتەکە دڵنیاببنەوە، پاشان بڵاویبکەنەوە.

٥. دورکەوتنەوە لە بێهیواکردنی خەڵکی؛ لە جیاتی بێهیواکردنی تاکەکان، پێویستە ڕێگەکانی چارەسەر و ڕێنمایی دروست بۆ کێشە و گرفتەکان پێشنیاز بکەن. بەداخەوە لە ئێستادا تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بوونەتە سەرچاوەی بێهیواکردنی خەڵکی، نابێت کەسانی پسپۆڕ سواری ئەم شەپۆلە ببن!

٦. چارەسەرنەکردنی هیچ کێشەیەک لەڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتییەوە؛ دەبێت خۆیان بەدووربگرن لە پێشنیازکردنی چارەسەر و هەوڵنەدەن کە کێشەی کەسێک لە ڕێگەی نامە گۆڕینەوە و پەیوەندی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان چارەسەر بکەن. لە ئێستادا چەندین کەس گیرۆدەی دەستی ئەم جۆرەن لە چارەسەر، نەک کێشەکە چارەسەر نەکراوە بەڵکو گەورەتر و خراپتر بووە.

٧. هەڵسەنگاندنی پێش نەشتەرگەری جوانکاری؛ چەندین توێژینەوە پشتیوانی هەڵسەنگاندنی دەروونی بۆ ئەو نەخۆشانەی کە نەشتەرگەری جوانکاری دەکەن دەکات١٢. پێویستە پسپۆڕانی بواری پزیشکی پێش ئەنجامدانی نەشتەرگەریی و پرۆسەکانی جوانکاری بۆ هەندێک کەس کە گومان دەکرێت لەژێر کاریگەری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ئەو بڕیارەیانداوە، بنێردرێن بۆ لای پزیشکانی دەروونی بەمەبەستی هەڵسەنگاندنی دەروونی.

٨. دانانی ڕێنیشاندەری تایبەت لەلایەن ڕێکخراو و کۆمەڵە تایبەتەکان؛ کۆمەڵە تایبەت و فەرمییەکانی دەروونناسان، پزیشکانی دەروونی، چارەسەرکارانی دەروونی، دەبێت هەوڵبدەن کە ڕێنمایی تایبەت و پابەندکەریان هەبێت بۆ ئەنجامەکانیان، بەتایبەت لەسەر بابەتی چارەسەر و ڕێنمایی لە ڕێگەی ئۆنلاین و نامەگۆڕینەوە.

٩. چارەسەر و ڕێنمایی بەشێوەی ئۆنلاین؛ ئەو کەسانەی کە لە ڕێگەی ئۆنلاینەوە کاردەکەن، پێویستە ڕەچاوی سەرجەم ڕەوشتە پیشەییەکان بن، هەروەها دەبێت لە ڕێگەی تایبەت و ڕێکخراوەوە ئەو کارە بکەن هەتا لە کێشە و گرفتی یاسایی و کۆمەڵایەتی بەدوربن.

دەسەڵات: حکومەتی هەرێم بەرپرسیارێتی گەورەی لەسەرشانە بۆ کەمکردنەوەی زیانەکانی بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، لە چەندین ڕێگەوە دەتوانێت کار لەسەر تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بکات:

١. ڕێگریکردن؛ سانسۆرکردنی هەندێک تۆڕی کۆمەڵایەتی کە زیانی هەیە بۆ کۆمەڵگە و تەنها بۆ تێکدانی شیرازەی خێزان و کۆمەڵگەیە.

٢. یاسای تایبەت؛ یاسایەکی تایبەت بە بواری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە کوردستان دەربچێت، لەسەر بنەمای ڕووبەڕووبونەوەی زیانەکانی ئەم تۆڕانە کە هەندێکجار جیاوازن و لە چوارچێوەی یاسای ژمارە ٦ی ساڵی (٢٠٠٨) (یاسای قەدەغەکردنی خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندی کردن) ئاماژەی بۆ نەکراوە یاخود ناڕوونە.

٣. گەیاندنی پێشنیازەکان بە ماڵپەڕەکان؛ لەسەر حکومەتی هەرێم پیویستە لە ڕێگەی لایەنە پەیوەندیدارەکانەوە کاربکات بۆ گەیاندنی پێشنیازەکان بۆ خاوەنانی ماڵپەڕە کۆمەڵایەتییەکان وەکو گرنگیدانی زیاتر بەلایەنی زمانەوانەی نوسینی کوردی بۆ فلتەرکردنی وشەی نەشیاو و نەگونجاو! یاخود هاندانی کەسانی ئەکادیمی هەتا لە بواری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان توێژینەوە بکەن و توێژینەوەکان بگەیەننە لایەنی پەیوەندیدار.

٤. پرۆگرامی خوێندن؛ دانانی پرۆگرامێکی تایبەت بۆ خوێندن، گرنگی بە هۆشیاری لەبارەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بدرێت لە سەرجەم ئاستەکان، بەتایبەت لە بەشە پەیوەندیدارەکانی وەکو ڕاگەیاندن، هونەر، دەروونناسی...

# سەرچاوەکان

1. Riva, G., Wiederhold, B. K., & Cipresso, P. (2016). The Psychology of Social Networking.
2. Dimofte, C. V., Haugtvedt, C. P., & Yalch, R. F. (2016). Consumer psychology in a social media world.
3. Scheinbaum, A. C. (2018). The dark side of social media: a consumer psychology perspective.
4. Hunt, M. G., Marx, R., Lipson, C., & Young, J. (2018). No More FOMO: Limiting Social Media Decreases Loneliness and Depression. Journal of Social and Clinical Psychology.
5. COOK, S. (n.d.). Cyberbullying facts and statistics for 2018 – 2021. Retrieved January 10, 2022, from comparitech: https://www.comparitech.com/internet-providers/cyberbullying-statistics/
6. King University Online. (2019). The Psychology of Social Media.
7. O›Reilly, M., Dogra, N., Whiteman, N., Hughes, J., Eruyar, S., & Reilly, P. (2018). Is social media bad for mental health and wellbeing? Exploring the perspectives of adolescents. Clin Child Psychol Psychiatry.
8. Yue, Z., Zhang, R., & Xiao, J. (2022). Passive social media use and psychological well-being during the COVID-19 pandemic: The role of social comparison and emotion regulation. Computers in Human Behavior.
9. Domenico, G. D., Sit, J., Ishizaka, A., & Nunan, D. (2021). Fake news, social media and marketing: A systematic review. Journal of Business Research.
10. Liu, C., & Ma, J. (2020). Social media addiction and burnout: The mediating roles of envy and social media use anxiety. Current Psychology volume.
11. Kuss, D. J., & Griffiths, M. D. (2017). Social Networking Sites and Addiction: Ten Lessons Learned. Int J Environ Res Public Health.
12. Walker, C. E., Krumhuber, E. G., Dayan, S., & Furnham, A. (2019). Effects of social media use on desire for cosmetic surgery among young women. Current Psychology.
13. Fardouly, J., & Vartanian, L. R. (2016). Social Media and Body Image Concerns: Current Research and Future Directions. Current Opinion in Psychology.
14. Drude, K., & Messer-Engel, K. (2020). The Development of Social Media Guidelines for Psychologists and for Regulatory Use. J Technol Behav Sci.



بوخاری عەبدوڵڵای قەسریَ

# تەکنەلۆژیای شاشەیی و سۆشیال میدیا وەك ئاڵنگارییەکی نوێی پەروەردەیی

ڕیشە و بنەچەی پەیوەندی نێوان بنیادەم و تەکنەلۆژیا، هەر لە سەرەتای پەیدابوونی تەکنەلۆژیا هەمەچەشنەکانەوە تا ئێستاکە، بریتییە لە شکڵدانی نوێ بەشێوەژیانی مرۆڤ و گۆڕینی ئاکاری مرۆڤ. ئامێرە تەکنەلۆژییەکان سەنعەتێکی میکانیکییانەی بەکارهێنراو نین کە تەنها کار بۆ مرۆڤ «ئاسان» یاخود «خێرا» بکەن، وەك ئەوەی زوو زوو لە پێناسەی تەکنەلۆژیادا بەسێنایی دەوترێت، بەڵکو شوێنپەنجەیان زۆر لەوە پترە! ئامێر و دەستگا تەکنەلۆژییەکان دەست لە ئاستی دنیابینی و مامەڵە و ئاکارەکانی مرۆڤ وەردەدەن. دروستە بڵێین کە مرۆڤی ئەم ڕۆژگارە، لە گۆشەی ڕوانینی بۆ ژیان و دیدگا و هەڵسوکەوت و نۆڕم و شێوازی بەسەربردنی کاتەکانیدا هەرگیز هەمان مرۆڤی چاخەکانی پێشووتر نییە. ئێستا تەکنەلۆژیا مرۆڤ دروست دەکاتەوە و هێواش هێواش ڕستن و چنینەوەی مرۆڤ دەکات. تەکنەلۆژیا لە هەر قۆناغ و گەشەیەکی پلەبەندیدا پانتاییەکی کۆمەڵایەتی بۆ مرۆڤ هێناوەتە ئاراوە و، بە پێچەوانەشەوە پانتاییەکی دی لێ سڕیوەتەوە، هاتووە فۆڕمێکی کولتووری بۆ مرۆڤ داڕشتووە و فۆڕمێکی دیکەی لێ سەندووە. هزر و هێزی مرۆڤی لەنێو بەرداشی گەشەی خۆیدا هاڕیوە. هەتا داهێنانەکانی تەکنەلۆژیا پتر پەرەبسێنن، زێتر ئاکار و خووە کۆمەڵایەتی و دەروونییەکانی مرۆڤ ئاڵۆزتر دەبن.

لە نیوەی سەدەی ڕابردووەوە تەکنەلۆژیای شاشەیی (سکرین)، و تەکنەلۆژیای گەیاندنی زانیاری، تەکانێکی باوەڕپێنەکراوی داوە بە وەرچەرخاندنی ژیانی مرۆڤ. ئیدی لەژێر چنگی تەکنەلۆژیادا ئاکاری کۆمەڵایەتییانەی مرۆڤ لەگەڵ (خود)ی خۆیی و ژینگە و دەوروبەر و سروشت و کۆمەڵگە ڕەنگێکی دیکەی پۆشیوە. بۆیە قسە دروستەکە ئەوەیە کە بوترێت، تا تەکنەلۆژیا یەک ڕەهەند و سادە و میکانیکیانە بوو لەناو چنگی مرۆڤدا بوو، بەڵام ئێستا بەو هەمووە گەشە ئەلیکترۆنی و شاشەییە ئاڵۆزەی کە کردوویەتی، نەک هەر لەناو چنگی مرۆڤدا نەماوە، بەڵکو بەپێچەوانەوە مرۆڤی خستۆتە ژێر چنگی خۆیەوە!

ئەم ئارگیومێنتەی سەرەوە، دەمانخاتە نێو واقیعێکی ئاڵنگاری، پرس و پرسیاری فەلسەفیی قورسمان تووش دەکات، کە چۆن لەگەڵ تەکنەلۆژیادا هەڵبکەین وەک «هەبوو»یەکی بەهێز لە دەرەوەی (هەبوون)ی مرۆڤدا ببینین. بۆ توێژینەوە لەم پرسیارەی سەرەوە ئەم وتارەم نوسیوە، ئومێد دەکەم لە ڕەهەندە فەلسەفیی و پەروەردەییەکەیدا ئامانجی خۆی بپێکێت.

پێشدەستیی، دەبێت بوترێت کە تەکنەلۆژیای ئێستا لەگەڵ ئەو سەردەمانەی کە بناخەی گەشەی داناوە، زۆر جیاوازە. لە ڕابردوودا بۆ هەر (فرمان)ێک، یان (پێویستی) یەک حەوجێمان بەوە هەبوو کە ئامێرێک یان دەستگایەک ساز بکەین کە هەڵسێت بە ئەنجامدانی ئەو فرمانە یاخود بەدیهێنانی ئەو پێداویستییە دیاریکراوەمان. بۆیە ژمارەی ئامێرەکان بۆ خواستەکانی ئێمە زۆر و قەبارەشیان پتر بوو. بەڵام لە ئێستادا چەندین ئامێر و دەستگای ئەلیکترۆنی و میکانیکی پێکەوە بەستراونەتەوە و یەکخراون لەناو یەک پارچە (یونیت)دا. بۆ وێنە جاران ئەگەر بۆ سەیرکردنی کات پێویستیت بە (دەمژمێر)ێکی دەستی یان دیواری هەبوایە، یان بۆ زانینی ڕۆژەکەت پێویستیت بە پەڕاوی (ڕۆژژمێر) هەبوایە، بۆ لەخەو هەڵسانی بەیانیان پێویستیت بە (زەنگوڵی خەبەرکەرەوە) هەبوایە، یاخود بۆ گرتنی وێنەیەک پێویستیت بە (کامێرای فۆتۆ) هەبوایە و، بۆ گرتنی ڤیدیۆیەک پێویستیت بە (کامێرای سەرشان) هەبوایە، بۆ لێدانی مۆسیقایەک پێویستیت بە (پیانۆ) هەبوایە، ئەوا دەبینی ئێستا یەک ئامێر کە (مۆبایل)ە و لە قەبارەشدا لە هەموو ئەمانە بچوکترە و هەموو ئەم کارانەش ئەنجامدەدات. ئێستا ئەگەر مۆبایلێکی زیرەکت پێ بێت هەموو ئەم فرمانانەی سەرەوەت بۆ دێنێتە ژێر چنگ و هێندەش بچووکە دەتوانی لەگەڵ خۆتدا بیگێڕیت و، ئیشیشت پێی نەما بیخەیتە نێو باخەڵتەوە. بۆیە ئامێری ئێستا لە قەبارەدا بچووکە، بەڵام لە هەمەجۆریی و فرەیی و چەندێتی ئیش و فرمانەکاندا قەرەباڵغ و دەوڵەمەندە. یەک دانەیە و چەندین کار دەسازێنێت. ئەم حاڵەتە لە زانستی تەکنەلۆژیادا پێی دەڵێن (multi-functional instruments) کە ئەگەر بۆ کوردی وەریبگێڕین دەبێت بە: (ئامێرە فرە فرمانییەکان) (بۆ ئەم مەبەستە توێژینەوەی زۆر نوسراون، بۆ وێنە بڕوانە Mazuryk and Gervautz).

ئەم خاڵەی سەرەوە دەروازەیەکە دەمانباتە نێو دنیایەکی تازە کە مرۆڤی دێرین پێی ئاشنا نەبوو، ئەمیش دنیایەکە پێی دەوترێ جیهانی ڤێرچواڵ (واتە دنیای نا هەقیقی ئەلیکترۆنی). دنیای ناهەقیقی ئەلیکترۆنی هەموو ئەو زانیارییانە دەگرێتەوە کە بە (شاشە) و (تیشک) بۆ ئێمە نیشاندەدرێن یاخود دەگوازرێنەوە. ئەم دنیایە کاریگەرە بەسەر واقیعە بەرجەستەییەکەی ژیانی ئێمەوە کەچی لە بنەچەدا تەنها (نیشاندان)و ڕووگەیەکی نمایشکردنە لەسەر تابلێتێکی شاشە. ئەم دنیا ڤێرچواڵە (کە شاشەییە و تەنها وێنە و ڤیدیۆ نیشان دەدات) ناوەندی کارکردنەکەی چیتر ئاسن و دار و تەختە و نایلۆن و پلاستیک و شوشە نییە، کە دەستیان لێبدەین و بە (جوڵاندن) و (بزوتن) و (هێز و گوڕی جەستە) وەک مرۆڤی دێرین بەکاریان بهێنین، بەڵکو کۆمەڵێک یەکەی زۆر ورد و چکۆلەی ئەلیکترۆنین کە پێکەوە زیرەکانە بەستراونەتەوە و پێیان دەوترێت (ترانزیستەر)، و بە شاشەیەکەوە بەرەو ڕووماندا نمایندە کراوە و، تەنها پێمان نیشاندەدات. ئێمە لەگەڵ جوڵاندنی پت و پەنجەماندا، بە ئارەزووی خۆمان ئەم چوار شتە دەکەینەوە یاخود سەیردەکەین یان دەیگوازینەوە:

**١-وێنەی ڕاوەستاو. ٢- ڤیدیۆ و وێنەی جوڵاو. ٣- نوسین و شکڵی هەمەجۆر. ٤- دەنگ.**

بۆیە مرۆڤی ئێستا لەهەمبەر دەستکەوتن و زانین و لێڕوانینی زانیارییەکان زۆر بە ئاسانی ئیشەکانی خۆی ڕایی دەکات و، هیچ ماندوبوونێک یان کاتێکی ئەوتۆ خەرج ناکات. هەر هێندە شاشەی ئایپاد، لاپتۆپ، یان مۆبایلەکەی هەڵکرد و لە ڕێگەی دوگمەی (وای فای) چووە نێو دەروازەی ئەم دنیا ڤێرچواڵە کە لێی دواین، ئەوا هوروژمی ئەو هەمووە زانیارییە (لەم چوار جۆرەی سەرەوە) بە خێراییەکی سەیروسەمەرە و بەلافاو و پڕاوپڕ هێرش دەکەنە نێو شاشەکەی و، ڕیز دەبن و خۆیان عەرز دەکەن. بۆیە لە سادەترین ڕاڤەدا دروستە بگوترێت، تەکنەلۆژیای شاشەیی لە دنیای ئێستادا زۆر سەرقاڵکەر و بەپەلە و قەرەباڵغە. ئەوەی دەتەوێت ببینی و ئەوەی ناشتەوێ ببینی یان بیزانی، تێکەڵ دەبن و پێکەوە نیشانت دەدرێت. ئەمەش ڕەنگدانەوەی ئەو قەرەباڵغییەیە کە ئێمەی مرۆڤی پۆستمۆدێرن لەناویدا دەژین.

خاڵێکی دیکەی جەوهەریی کە تەکنەلۆژیای ئەم ڕۆژگارەی ئێستا لە سەردەمی کۆن لێکجیا دەکاتەوە، بریتییە لەوەی کە (شاشە)ەکان ئێستا بوونەتە نیشان و نمایندەی ژیانی زۆر زاتیی و کۆمەڵایەتی ئێمە. تەکنەلۆژیای ڤێرچواڵیی ئێستا دەستگایەکی زۆر زاتییانە و کەسی و تایبەتی و کۆمەڵایەتییانەی فەراهەمهێناوە کە لە بەکارهێنانەکانی لە جوغزی ژیانی (individual تاک)دا تەسک بۆتەوە. ئەگەر لە دۆخی پێشوودا ئامێرە تەکنەلۆژییەکان هاتبنە نێو ژیانی کۆمەڵایەتیمان و، وەک نوێگەرییەک و داهێنانێک هاتبنە کایەوە، ئەوا ئەمرۆ هاوکێشەکە پێچەوانە و بەراوەژووبۆتەوە بەجۆرێک کە خودی ژیانی تایبەتیی کۆمەڵایەتیمان هاتۆتە نێو تەکنەلۆژیا، ئێستا ئاپلیکەیشن و پلاتفۆرم و دەروازەی

نوێ داهێنراون تاوەکو شێوەژیانی ئاکاری کۆمەڵایەتیمان لەناو شاشەکاندا نیشان بدرێن. شاشەی مۆبایلی هەرکام لە ئێمە ئێستاکە پڕیەتی لە وێنە و چیرۆک و گرتەی ژیانی تایبەتیی کەسانی تر کە (زۆرجار بەبێ ئاگایی خۆمان) دەخلیان کردووە بەنێو مۆبایلەکانمانەوە، چونکە وەشان کراون. تەکنەلۆژیای میدیایی جاران ڕەسمی بوون، تەنها دەوڵەت، میری، حیزب، یان پارەدار و دەزگاکانی سەرمایە و ڕاگەیاندن دەیانتوانی دوانگەی پەخشیان هەبێت. بەڵام ئەمێستا هەرکەس خۆی خاوەنی مینبەرێکی تایبەت بەخۆیەتی و خەریکی دووین و پەخش و نماکردنە و، هەموومان دەتوانین وێنە و گرتەڤیدیۆ و دیدو نوسین وەشان بکەین (بۆ ئەم مەبەستە بڕوانە توێژینەوەی Sven Stollfuß).

پرسیارە پەروەردەییە بنەڕەتییەکە لێرەدا ئەمەی خوارەوەیە، لەگەڵ لێشاوی بەربڵاوی بەکارهێنانی ئاپلیکەیشنەکانی سۆشیال میدیا، مرۆڤی ئێستا لە بەردەم چ ئاڵنگارییەکدایە، لە دیوە پەروەردەییەکەیدا ئایا کەسایەتی و خوو و ئاکار و دەروونی مرۆڤی ئێستا چ گۆڕانێکی بەسەردا هاتووە؟

لەئەنجامی پەخشکردنی جموجۆڵ و هەڵسوکەوت و خوو و ڕەفتارە زاتیی و تاکەکەسییەکانمان کە ڕۆژانە ئەنجامیان دەدەین، لە ڕێگەی وێنە و گرتە ڤیدیۆییەکانەوە، بۆ نێو ئەو دنیا ناواقیعییە ئەلیکترۆنییە کە بە ئاپلیکەیشنە هەمەجۆرەکان سازکراوە، ڕووپێوی گشتی ژیانی کۆمەڵایەتییانەی ئێمە بەرەو گۆڕان چووە (کە هەندێک جار ناودەبرێت بە فەزای گشتی و لەلایەن هابرماسی زانای کۆمەڵناسی ئەڵمانی داهێنراوە).

مەبەستم لەم بۆچوونە ئەوەیە کە، هەر تاکێکی بەکاربەری سۆشیال چیتر خاوەنی کەسایەتییەکی (نەگۆڕ) و چەسپاو نییە، کەسایەتی مرۆڤی ئێستا سیفەتێکی شلۆقیی هەیە، ڕووە و گۆڕانکارییە و خێرا خووی کۆن فڕێدەدات و خووی نوێ وەردەگرێت. مرۆڤی بەکارهێنەری سۆشیال میدیا خۆچن و خۆهەڵوەشێنە، واتە لە هەر ئان و ساتێکی ڕۆژانەیدا، زاتی خۆی هەڵدەوەشێنێتەوە لەو ئاکار و چالاکیە کردەییانەی زووتر فێری بووە و وەریگرتووە و زانیویەتی و ئەنجامیداوە، هەمیش ئەم مرۆڤە خۆی بینادەکاتەوە لەو دید و ئاکارانەی  دەیبینێت و فێری دەبێت. وێنە و ڤیدیۆ و نامەدەنگییەکان و وشەکانی سەر ڕووپێوی سۆشیال میدیا کە بە (سکرۆڵ) ڕیز دەبن و دێن و دەچن و ئەمسەر و ئەوسەری شاشەی مۆبایلمان دەگرن، ناخی ئێمە دەگۆڕن. ئەم وێنە و ڤیدیۆیانە جا خەندە ئامێزبن یان خەمهێن ئێمە بە تێپەڕینی کات دەگۆڕن، جا ئاگاییمان لێی هەبێت یاخود نا ئێمە لە قاڵبێکی دیکەدا دادەڕێژنەوە، تەنانەت خووی لاسایی کردنەوەشمان پێ دەبەخشن.

ڕەنگە هۆکارێکی هەرە سەرەکیی لە گۆڕینی ئاکار و دید و ڕەفتار و شێوەی هەڵسوکەوتەکانی ڕۆژانەمان بەهۆی سۆشیال میدیا بریتی بێت لەوەی کە لەڕووی تەکنیکی مەبەستیشەوە هەموو ئاپلیکەیشنەکانی سۆشیال میدیا کار لەسەر هونەر

(دووبارەکردنەوە) دەکەن، مرۆڤ بە دووبارەکردنەوە زۆر کارتێکراو دەبێت، ئەگەر تۆ شتێک لەبەردەمتدا لە چەند کات و ساتێکی جیاواز دووبارە کرایەوە، ئیشتیهای فێربوون و لاساییکردنەوەت دەجوڵێ. ئەم دەستگایانە گرتەیەکی ڤیدیۆیی چەندین جار بە بەرچاومان دەخەن، وێنەکان دووبارە دەکەنەوە، لە تەک یەکتر ڕیزیان دەکەن، جا بەکارهێنەرێک کاتێک چەندین جار لەسەریەک ناواخنی گرتەیەکی ڤیدیۆیی دەبینێت، بەشێوەیەکی خۆکاریی هەستی لاساییکردنەوە و وروژانی لەلا پەیدا دەبێت. ئەمجارە ڕەنگە خۆی چیتر بینەری ئەم ڤیدیۆیە نەبێت، بەڵکو لاسایی بکاتەوە و خۆشی سازی بکات. ئێمە لە سەردەمی سۆشیال میدیادا زۆرجار دەبین بە کەسانێک کە خێرا یەک پرۆژەی هاوبەش یان یەک ڕەوتی کاتیی کاریگەر کۆماندەکاتەوە، بەبێ ئەوەی بشزانین چی لەپشتییەوە دەگوزەرێت. بۆیەش، ئەگەر سەرنج بدەی نەوجەوانانی ئێمە لە لاساییکردنەوەی گرتە «کۆمیدی» و»تەرفیهی» و «گاڵتە ئامێزەکان»، حەزێکی لەڕادەبەدەریان هەیە بەتایبەت لە تیکتۆک و فەیسبووکدا ئەوەم بینیوە، زۆر بەخێرایی و تاڵۆکە ئەم وێنە و ڤیدۆیانە لەنێو هەژمار و لاپەڕەکانیاندا بڵاودەکەنەوە (بۆ زانینی کاریگەرییەکانی تیکتۆک لەسەر نەوجەوان و گەنجان بڕوانە توێژینەوەی Dilon).

**پەروەردەی مرۆڤ و تەکنەلۆژیای سکرین (سۆشیال میدیا بە هەموو ئاپلیکەیشنەکانییەوە) لەم ڕەهەندە قوڵانەی خوارەوە بە پرد دەبن:**

ئەگەر پەروەردە لە چەمکە فراوانەکەیدا بریتی بێت لە خودسازیی مرۆڤ، یاخود ئامادەسازیی مرۆڤ بۆ ڕووبەڕووبوونەوەیەکی ئەرێنییانەی ئاڵۆزیی و بەربەست و سەختیی و دژواریی و کێشەکانی (ژیان)، ئەوا دنیای ئەنتەرنێتییانە، دنیای شاشەیی، لە سەردەمی ئێستەماندا، کە بە ڕەنگەکانی سۆشیال میدیا ڕەنگڕێژکراون، هاندەرێکن لە خوڵقاندنی ئەم ئاریشە نوێیانە. ئەم ئاریشە نوێیانە حەوجێیان بەوە هەیە قسەی نوێیان لەبارەوە بکرێت. پەروەردەی دیموکراتییانەی هاوچەرخ بریتی نییە لە لەبەرکردنی زانیاری نێو دێڕەکانی پەرتوکێک و وەڵامدانەوەی کۆمەڵێک پرسیار لە تاقیکردنەوەدا، لەوە پەروازتر چووە و گەشەکردووترە، بەڵکو ئەگەر یەکێک لە ڕەهەندەکانی پەروەردە بریتی بێت لە بەرزکردنەوەی ڕێژەی هۆشیاریی تاک بە ئاریشە و کێشەکانی ژیان، ئەوا ئەرکی پەروەردە بریتییە لە ئامادەکردنی ئێمە بۆ خودپارێزیی لەو کێشانەی کە شاشەی ئاپلیکەیشنەکانی سۆشیال میدیا دەیانخاتە بەرچاومان و نمایشیان دەکات. پەروەردە دەبێت ئەو چاوەمان پێ ببەخشێت کە دیوی پشت وێنە و ڤیدیۆ و وشەکانی سەر ڕووپێوی سۆشال میدیا ببینین.

داشۆرین و گلەییبارانکردن و ڕەخنەگرتن لە نەوەی تیک تۆک و سناپچات چارەسەر نییە، بەتایبەت لە کۆمەڵگەیەکی وەکو کوردستان کە زۆر ساوایە بە (پەروەردەی شاشەیی)، بەڵکو لەبری ئەوە دەبێت چەکی بنیاتنەری پەروەردە بەهێزتر بکرێت، پەروەردە لە

هەر چەرخێکدا پرسیاری قورسی خۆی هەیە، ئێستا کە مرۆڤایەتی بە تونێلی سۆشیال میدیادا گوزەر دەکات، هەقی خۆیەتی چەند کریدیتێک تایبەت بە (هۆشیاری مامەڵەی مرۆڤ لەگەڵ ئاپەکانی سۆشیال میدیا) لە ناوەندەکانی پەروەردە و خوێندندا بە قۆناغە جیاوازەکانییەوە بخوێنرێن. یاخود لە کەمترین هەوڵداندا، چەند سیمینار و خول و هەڵمەتێکی خودهۆشیاریی لەبارەی سۆشیالمیدیا لە ناوەندەکانی پەروەردەدا بگوترێتەوە. بە کورتی، سۆشیال میدیا ببێتە بابەتێکی گەرماوگەرمی پەروەردە کە بە پلان و ڕووانین و بیرۆکەی بنیاتنەرانەوە کاری لەسەر بکرێت،

تەنانەت توێژینەوەیەک بەناوی (Zuheir N Khlaif) ئەنجامدراوە، کە لە ژێدەرەکەماندا دەتوانی بگەڕێیەوە سەری، جەخت لەوە دەکاتەوە کە ئێستا لە هەندێک ناوەندی پەروەردەییدا ئیش لەسەر ئەوە دەکەن (پەروەردە و تیک تۆک) پێکەوە بە شێوەیەکی بنیاتنەر ببەستنەوە تا نەوەی ئێستا بزانێت تەکنەلۆژیا تەنها ماڵی لاساییکردنەوە و تەرفیهیات و پێکەنین و نوکتە و خودنمایشکردن نییە. دەکرێت هەرکام لەم ئاپلیکەیشنانە مەعریفی و زانستمەند و سودبەخشیش بن، ئەگەر ئەقڵێکی هۆشیار و چاوێکی بینا بتوانێت بەڕێوەیان ببات، یان مرۆڤەکان لە هەمبەر بەکارهێنانیاندا ئاڕاستە بکات.

لێرەوە سیستەمی پەروەردە دوور و دابڕاو نابێت لە سیستەمە تەکنەلۆژییە گەشەکردووەکەی دنیای ئێستا، بەڵکو دەبێتەوە دوانگەیەک یاخود مەڵبەندێک کە مرۆڤ ئاڕاستە دەکات کە بە چ هێما و نیشانەیەک شاشەکەی بەکاربهێنێت و، هۆشیار بێت بەوەی (خود)ی خۆی چی دەوێت؟ بەدوای چیدا دەگەڕێت، نەک ئەوانیتر چیان لێی دەوێت!. (دەتوانیت بڕوانیتە توێژینەوەیەک بەناوی Mahwish Rabia کە جەختدەکاتەوە لەسەر کاریگەریی سۆشیالمیدیا لەسەر ئاکاری پەروەردەیی و کۆمەڵایەتی گەنجانی ئێستا لە زانکۆ و ناوەندەکانی تری خوێندندا).

خاڵێکی دیکەی گرنگ ئەوەیە کە سۆشیال میدیا و تەکنەلۆژیای شاشەیی دەشێت وەکو پلاتفۆرمێکی سودبەخش و بەکەڵک لێی بڕوانرێت لەوەدا کە یارمەتیدەرە facilitator بۆ خودی بەڕێوەبردنی ماکینەی پرۆسەی پەروەردە. یانی نەک بەشێوەیەکی سادە تەکنەلۆژیای شاشەیی پێویستی بە (پەروەردە) هەیە بۆ ئیدارەدان و باش بەکارهێنانی، بەڵکو خودی پەروەردەش بەپێچەوانەوە لە دنیای ئێستەدا وردە وردە پێویستی بە تەکنەلۆژیای شاشە و سۆشیال میدیا هەیە بۆ بەڕێوەچوونی. ئەم حاڵەتە بەتایبەت لەم دوو سێ ساڵەی ڕابردووەوە پتر تەشەنەی کردووە بەهۆی سەرهەڵدانی ڤایرەسی کۆرۆنا و هاوشێوەکانی کە ڕووبەری ژیانی کۆمەڵایەتی ئێمەی مرۆڤیان تەسک کردۆتەوە، ناچار پەنا دەبرێتە بەر هەر پلاتفۆرمێکی ڤێرچواڵ (شاشەیی ناواقیعی) کە لەوێوە پێکبگەین و یەکتر ببینین یان گوێمان لە یەکتر ببێت.

کاتێک پلاتفۆرمێکی وەک (گوگڵ کلاس) یان (زووم) یاخود (گرووپ ڤۆیس کۆڵی

ڤایبەر و واتسئاپ و ماسینجەر و تێلی گرام...هتد) بژاردەیەکی کاریگەریی لێکتێگەیشتن و پێکەوەگردبوونەوەی دەنگ و ڕەنگمان دەخاتە بەردەست، ئێمەی مرۆڤی پۆستمۆدێرن ڕێگەی تازەمان لە بەردەمدا دەکرێتەوە بەوەی چۆن پێیدا گوزەر بکەین تا بتوانین سیستەمی پەروەردەمان جارێکی دیکە دابڕێژینەوە. دەبێت سیستەمی پەروەردەییمان هەم لەڕووی فەلسەفەوە، هەمیش لەڕووی پێداگۆجی (ڕێگەی وانەوتنەوە) و تەکنیک و ئامرازەوە خۆی نوێ بکاتەوە، تا بتوانێت لەگەڵ ئەم پلاتفۆرمە تەکنەلۆژییە نوێیانە هەڵبکات و، کەڵکیشی لێ وەربگرێت. (لەبارەی بەکارهێنانی ئەم دوو ساڵەی سۆشیال میدیا و تەکنەلۆژیای شاشەیی بۆ بەڕێوەچوونی پەروەردە لە قەیرانی کۆرۆنادا زۆر توێژینەوە کراون، بۆ وێنە بڕوانە Derar Serhan).

> **پێویستە ســۆشیال میدیا وەك فۆڕمێكی نوێی پەیوەندیكردن و گواستنەوەی زانیاریی و ئاسانكاریش لە گەیشتن بە هەواڵ و وێنە و ڕووداو تەماشا بكرێت.**

پوختەی باس ئەوەیە کە، لەبری ئەوەی سۆشیال میدیا بە «سەرئێشە»یەکی تازە بۆ پەروەردەی مرۆڤ بخەملێنرێت و وێنا بکرێت، وەک ئەوەی لە زیهنییەتی بەشێک لە دەروونناس و پەروەرشیاراندا چەقیوە، دەگونجێت بە «دەرفەت» ێکی تازە بۆ مرۆڤی ئێستا ببینرێت، کە دەشێت کارئاسانیمان بۆ فەراهەم بهێنێت لەوەی چۆن ئەو دید و هزر و زانستەی دەمانەوێت ببەخشین یان وەریبگرین بە شوێنی خۆی بگات لەوپەڕی خێراییدا. دەشێت تەکنەلۆژیای شاشەیی بە هێڵێکی دیکەی خودسازی و خودڕۆشنبیریی و هزردەوڵەمەندبوون ببینرێت، بەوپێیەی کە تەشەنەکردوو و خێرا و کاریگەر و ئاسانە لە بەکارهێناندا، بەڵام ئەگەر بەرنامەسازیی پێشوەختەی بۆ بکرێت و لەوپێناوەدا پرۆژەی پەروەردەیی لەکاردابن.

بۆیە زۆر گرنگە ناوەندی پەروەردە و، خودی پرۆسێسی پەروەردە وەکو سیستەمێکی هزریی، لەوە تێبگات کە تەکنەلۆژیای شاشەیی چیتر ئەو دنیا سادە بەکارهێنراوە نییە کە بە تەنیشت مرۆڤەوە بڕوات و دەخل بە ژیانی تاک نەکات، بەڵکو بەپێچەوانەوە شاشە هێندە خۆی ئاخنیوەتە شێوەی ئاکاری کۆمەڵایەتییانەی تاک، چرکە چرکەی کاتەکانی مرۆڤی ئێستا و ئاکارەکانی بە شاشەکانی سۆشیال میدیادا دێن و دەچن و دەگوازرێنەوە، هەڵسوکەوت و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکانی مرۆڤی پۆستمۆدرێن چیتر «تایبەتیی» private نین، ئێستا لەنێو شاشەکاندا دێن و دەچن: لە خواردن، خەوتن،

پۆشین، قسەکردن، گەشت، وێنەگرتن، پیاسە و سەیران، خۆشی و ئاهەنگ، زەماوەند و سێکس و منداڵبوون، شین و شیوەن، مردن و نەمان، کارەسات و خەم، پەژارە و قەیران، ڕاو بۆچوون، سیاسەت و، دین و دونیا...هتد. جا ئەگەر پەروەردە قسە لەسەر دووبارە ڕێکخستنەوەی ئەم هەژموونە شاشەییەی تەکنەلۆژیا نەکات، ئەوا ئاگایی تاک بەرەو پەراوێز و کزیی و کاڵیی دەڕوات. (بۆ پتر ئاشنابوون بە کاریگەریی سۆشیال میدیا لە سەر تەسکبوونەوەی «تایبەتمەندێتی» ژیانی کۆمەڵایەتیمان و کرانەوەی زیاتر بەرەو نمایشکردنی ئاکارە کۆمەڵایەتییەکانمان، بڕوانە توێژینەوەی Bernhard Debatin, Jennette P. Lovejoy).

لێرەوە و لە غیابی فەلسەفەی ڕوونی پەروەردەییمان بۆ تەکنەلۆژیای شاشەیی، پێ دەنێینە نێو ئەم هەمووە کێشە و گرژیی و تاڵییەی کە لە ئاوابوونی هۆشیاری تاکدا دێنە ئاراوە و، دەخرێتە ملی سۆشیال میدیا. (بڕوانە توێژینەوەی Sagee Geetha Sethu لەبارەی شوێنپەنجەی سۆشیال میدیا لەسەر تایبەتمەندێتی ژیانی تاک و تەنانەت ئاسایشی کۆمەڵایەتی تاک).

سۆشیال میدیا وەک واقیعێک، کە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ لە خۆ ئەبدەیتکردنەوە و هەڵکشاندایە و، هەنگاو بە هەنگاو لەڕووی کاتگرتن و دەخالەتکردن بە ژیانی ڕاستەقینەمان شوێنپەنجەی پتر دادەنێت، دەبێت لە ناوەندە ئەکادیمیی و دەروونی و ئایینی و پەروەردەییەکاندا لە قاوغە ڕەشبینییەکەی بهێنرێتە دەرەوە. بۆ ئەوەی ئەرێنییانەتر سۆشیال میدیا بەکاربهێنرێت و ئەرێنیانەتر قسەی لەسەر بکرێت، نابێت چیتر  هەمیشە لێزمەی ڕەخنەی لەسەر بێت بەوەی کە بەهاکانمان دەشێوێنێت، گەرچی ئەو قسەیەش دروستە لە ڕێژەی خۆیدا، بەڵام پێویستە سۆشیال میدیا وەک فۆڕمێکی نوێی پەیوەندیکردن و گواستنەوەی زانیاریی و ئاسانکاریش لە گەیشتن بە هەواڵ و وێنە و ڕووداو تەماشا بکرێت. لەڕاستیشدا، بۆ پارێزکردن لەو بەها ئایینی و کەلتووریی و مرۆییانەی کە هەمانن و نامانەوێ لە چنگیان بدەین، پێویستیمان بە کەنارگیرکردنی تەکنەلۆژیای شاشەیی نییە لە زاتی خۆیدا، ئەسڵەن لافاوی زانیارییە شاشەییەکان هێندە بە لێزمەیە ناتوانین بەری پێ بگرین، وەچەی تازەش لە بەکارهێنانە تەکنیکییەکەی سۆشیال میدیا زۆر زیتەڵ و زرنگ و زیرەکن، گەورەکان بە ئاسانی ناتوانن پێشیان لێ بگرن، بەڵکو پێویستیمان بە خودهۆشمەندیی و دنیادیتەیی پتر هەیە کە لە ئاوەز و دەروونی تاکی ئێمەدا بروێنرێن، کە بزانێ لەهەمبەر بەکارهێنانی هەر ئاپلیکەیشنێکی سۆشیال میدیادا چی هەڵدەبژێرێت و چۆن مامەڵە دەکات.

ڕوونتر بڵێم، لە دەروونی تاکی مۆدێرندا کە شاشەی سۆشیال میدیای لە هەر ئان و ساتێکدا لەبەردەمدا کراوەیە، پێویستییەکی هەنووکەیی هەیە بە هەستی بەرپرسیارێتی، لەوەی کە کاتێک تۆ داخڵ بە دنیای شاشەیی و ڤێرچواڵ دەبیت و پتی داخڵبوونی سۆشیال میدیا دادەگری، دەبێ بزانی کە هەر وشە و ئەتوار و بڕیار و وێنە و ئاکارێکت،

کاریگەریی دادەنێت لەسەر بینەر و بیسەر و خوێنەرەکانت. هەروەها تۆش بە وێنە و وشە و ڤیدیۆکانی ئەوانی تر کاریگەریی، ڕاستەوخۆ ئێمە لکاوین بە تۆڕبەندێکی پێکەوەئاڵاوی ئاڵۆز و خێرا، زانیاری وێنەیی و وشەیی وەردەگرین و دەبەخشین، ئەگەر کۆمەڵێک بەهای باڵا ڕاماننەچڵەکێنێت ئەوا نازانین بەرەو کوێ هەنگاو دەنێین و چیمان لێدێت و، چیمان لەکۆتاییدا لێ دروست دەبێت. دەبین بە کەسێکی تر بەبێ ئەوەی بەخۆمان بزانین! لەکۆتاییدا (مرۆڤ) خۆی بڕیاردەدات ئەو پێوەندییە چۆنە، بۆیە مرۆڤ پێویستی بە دیدی (پەروەردە)ی نوێ هەیە.

سەرنجێکی بچوک: هەوڵمدا خۆم لە بەکارهێنانی زۆر دەستەواژەی ئینگلیزی بپارێزم، بەڵام زۆر سەرکەوتوو نەبووم، چونکە هەستمکرد فەرهەنگی زمانەوانی ئێمەی کورد لە وەرگێڕان و چێکردنی زۆر وشەی تازە لە بواری تەکنەلۆژیادا کرچ و کاڵیی تێدایە، یان لانیکەم من بەرچاوم نەکەوتووە، هیوادارم زمانناسان بایەخی پتر بەو بوارە بدەن.

## سەرچاوەکان


1- Stollfu□, Sven. “Between television, web and social media: On social TV, About:Kate and participatory production in German Public Television”. Participations Journal. Volume 15, Issue 1 May 2018.
2- Sethu, Sagee Geetha and Devika Ramachandran. “Limiting the Social Media’s Encroachment into a Person’s Right to Privacy”. 2021, Global Media Journal – Arabian Edition Volume 3, Issue 3 ISSN: 2707-6768.
3- Serhan, D. (2020). “Transitioning from face-to-face to remote learning: Students’ attitudes and perceptions of using Zoom during COVID-19 pandemic”. International Journal of Technologyin Education and Science (IJTES), 4(4), 335-342.
4- Khlaif ZN, Salha S. “Using TikTok in Education: A Form of Micro-learning or Nano-learning?”. Interdisciplinary Journal of Virtual Learning in Medical Sciences. 2021;12(3):213-218. doi: 10.30476/ ijvlms.2021.90211.1087.
5- Debatin, Bernhard et al. “Facebook and Online Privacy: Attitudes, Behaviors, and Unintended Consequences”. Journal of Computer-Mediated Communication. doi:10.1111/j.1083-6101.2009.01494.x
6- Dilon, Cell. “Tiktok Influences on Teenagers and Young Adults Students: The Common Usages of The Application Tiktok”. American Scientific Research Journal for Engineering, Technology, and Sciences (ASRJETS) ISSN (Print) 2313-4410, ISSN (Online) 2313-4402.
7- Mazuryk, Tomasz and Michael Gervaut. “Virtual Reality History, Applications, Technology and Future”. Institute of Computer Graphics Vienna University of Technology, Austria.








پ. ی. د. صادق حەمەغریب سەرگەتی

# ڕاگەیاندنی تەقلیدی و سۆشیال میدیا: یەکتر سڕینەوە یان یەکتر تەواوکردن

ڕاگەیاندن چییە؟

ڕاگەیاندن بە جیاوازی قۆناغە مێژووییەکانی و، جۆری ئامرازەکانی و، پسپۆری و شارەزایانی بوارەکە پێناسەی جیاوازیشی بۆکراوە، پسپۆڕی بواری ڕاگەیاندن (هیلین کاتز)، لە شرۆڤەی پرسیاری (ڕاگەیاندن چییە؟)دا، بەم شێوەیە دەنوسێت: «بەیانی کاتژمێر ٣٠: ٧ کاتێك لە خەو هەڵدەستیت گوێ بۆ ڕادیۆکەت ئەگریت، ڕۆژنامە لۆکاڵییەکەت دەخوێنیتەوە، بۆئەوەی بزانیت لە جیهاندا چی ڕوویداوە، بە دەم نانخواردنی بەیانییەوە سەیری هەواڵە تەلەفزیۆنییەکان دەکەیت، پێش چوونە سەر کاریش ئیمەیڵەکەت ئەکەیتەوە، لە شوێنی کارەکەیشت گوێ بۆ ڕادیۆ لۆکاڵییەکە دەگریت، ئەمە ڕاگەیاندنە (Katz, ٢٠٠٨, p١).

کاتز لەم پێناسەیەدا مەبەستی ئەوەیە کە بڵێت ڕاگەیاندن بە هەموو شیوەیەک ئابلۆقەی تاکەکانی داوە و، بووە بە بەشێکی سەرەکی و دانەبڕاو لە ژیانی هاوڵاتیان و، تاک هەرکاتێک لە دۆخی بێداریدا بێت، ئەوە بە دڵنیاییەوە بەشێوەیەک لە شێوەکان دەبێتە بەکارهێنەری یەکێک لە ئامرازە جیاوازەکانی ڕاگەیاندن و، ناتوانێت بەبێ ڕاگەیاندن بژێت. ڕاگەیاندنی تەقلیدی بە ئامرازە میدیاییەکانی پێش سەرهەڵدانی تۆڕی ئینتەرنێت دەوترێت وەک:(ڕۆژنامە، گۆڤار، ڕادیۆ، تەلەفزیۆن).

## سۆشیال میدیا چییە؟

سۆشیال میدیا ئاماژەیە بۆ تەکنۆلۆژیای ئینتەرنێت و، گۆڕینی پرۆسەی پەیوەندیکردن بۆ پرۆسەیەکی گفتوگۆیی و کارلێکی. هەردوو پسپۆڕی بوارەکە(ئەندریاس کابڵان و مایکڵ هانلین) بەم شێوەیە پێناسەی سۆشیالمیدیا دەکەن:" بریتییە لە کۆمەڵێک خزمەتگوزاری ئینتەرنێت کە لەسەر بنەماگەلێکی ئایدیۆلۆژیی و تەکنۆلۆژی دامەزراوە و، ڕێگە دەدات بە نووسین و دابەزاندن و ئاڵوگۆڕی زانیاری لە نێوان بەکارهێنەراندا"(الفرم, ٢٠١٦: ١٧٠). سۆشیال میدیا پشت بە تۆڕی فراوانی ئینتەرنێت دەبەستێت، کە بەکارهینەران لە ڕێگەی کۆمپیوتەر و لاپتۆپ و مۆبایلەوە بەکاری دەهێنن و، پەیوەندییەکی دوو ئاڕاستە لە نێوانیاندا بەدی دێت بۆ ئاڵوگۆڕی زانیاری، واتە لە سۆشیال میدیادا بەکارهێنەر لەهەمانکاتدا دەبێتە وەرگر و نێرەر. لە دیارترین جۆر و نموونەکانی سۆشیال میدیا بریتین لە:( فەیسبوک، تویتەر، یوتیوب، انستاگرام، بامبوزر، ڤیمیۆ، فلیکر، لینکد ئین، سناپ چاد، تیک توک، تیلیگرام...هتد)، کە هەریەکەیان تایبەتمەندیی و خزمەتگوزاری میدیایی و کارلێکی تایبەت بەخۆیی هەیە.

## بۆچی هاوڵاتیان پشت بە میدیا و سۆشیال میدیا دەبەستن؟

پشتبەستنی هاوڵاتیان بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن، بەهۆی جیاوازییان لە ئامانج و پێداویستییە هۆشیارییەکانییانەوە جیاوازە. پێوەری ڕادەی پەیوەندی و پشتبەستنی جەماوەر بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن، ڕاستەوخۆ پەیوەستە بە پێوەری ئەو ئامانجانەیان کە هەوڵی جێبەجێکردنیان دەدەن، هەربۆیە ئاستی ئەو پەیوەندی و متمانەیەش بەپێی ئامانج و خواست و بەرژەوەندییەکانی جەماوەر و جۆری چین و توێژەکان و جۆرایەتی کۆمەڵگەکانەوە گۆڕانکاری بەسەردا دێت، هاوکات ئاستی ڕۆشنبیریی و مەعریفی هاوڵاتیان و بارودۆخی سیاسی، ئابووریی و کۆمەڵایەتی نیشتەجێبوونیشیان کاریگەری ڕاستەوخۆی هەیە لەسەر ئاستی متمانە و پشتبەستنیان بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن. گرنگیدانی هاوڵاتیان بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن، لە دۆخە نائارام و ناجێگیرە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکاندا و لەکاتی ململانێ، هەڕەشە جۆراو جۆرەکان و ڕووداو و قەیرانەکاندا زیاتر دەبێت. کاتێک هاوڵاتیان هەست دەکەن کە بە کەشێکی گوماناویی و

ناڕوون لەڕووی بوونی زانیارییەوە ئابلۆقە دراون، گرنگیدان و متمانەیان بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن زیاتر دەبێت، بەمەبەستی ئاگاداربوون لە بارودۆخەکە و زانینی ئاڕاستەی هەڵکشان و داکشانی ڕەوتی ڕووداو و قەیرانەکان. گرنگیدانی هاوڵاتیان بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بۆ چەند هۆکارێک دەگەڕێتەوە، کە پسپۆڕی بواری ڕاگەیاندن (سوزان القلینی)، پێیوایە کە هاوڵاتیان بە ئامانجی تێگەیشتن، ئاڕاستەکردن و چاودێری کردنی ڕوداو و گۆڕانکارییەکانی دەوروبەریان پشتدەبەستن بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن(القليني، سوزان، ٢٠٠٣، ص٧٠).

ئەگەر سەرنجێک بدەین لە جیاوازی پشتبەستنی هاوڵاتیان لە میدیای تەقلیدیی و سۆشیال میدیادا، ئەوا توێژینەوەکان پێمان دەڵێن کە بەهۆی بوونی خزمەتگوزارییەکی زۆری میدیایی و کارلێکییەوە لەلایەک و، کۆمەڵێک تایبەتمەندی وەک:(خێرایی، ئاسانی بەکارهێنان، کەمی تێچوون، جیهانگیری، هاوکات نەبوونی بەکارهێنان، کارلێکی ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆی لە ڕادەبەدەری نێوان وەرگر و نێرەر و...هتد، سۆشیال میدیا زیاتر لەلایەن هاوڵاتیانەوە پشتی پێ دەبەسترێت بۆ بەدەست هێنانی هەواڵ و زانیاری بە ئامانجی تێگەیشتن لە ڕوداو و گۆڕانکاریەکانی دەوروبەریان، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا میدیای کلاسیکیش وەزن و قورسایی خۆیی لە دەست نەداوە و، تایبەتمەندییە گرنگەکانی بووەتە هۆی مانەوەی و، ڕۆڵ گێڕانی لە سەرجەم کایەکاندا.

### بۆچی هاوڵاتیان میدیا و سۆشیال میدیا بەکاردەهێنن؟

پسپۆڕان و زانایانی بواری ڕاگەیاندن، لە ڕێگەی توێژینەوەی تایبەت بە هۆکارەکانی بەرکارهێنان و سەیرکردنی ئامرازە جەماوەرییەکانی ڕاگەیاندن لەلایەن جەماوەرەوە، بە بواردنی ئەوەی کە میدیای تەقلیدی بێت یان سۆشیال میدیا، گەیشتوون بەو دەرئەنجامەی کە چوار هۆکاری سەرەکی دەستنیشان بکەن، ئەوەش ڕوونبکەنەوە کە ڕووبەری ئەو هۆکارانەش لە دۆخی ئاسایی و نائاساییدا جیاوازە و هەڵکشان و داکشان بەخۆیەوە دەبینێت، وەک لە خوارەوە ئاماژەیان پێدەکرێت:

أ- چێژوەرگرتن (Enjoyment): مرۆڤەکان خواستێکی سروشتییان هەیە بۆ چێژوەرگرتن و خۆشحاڵی کەسیی و تایبەت، یەکێک لە هۆکارە سەرەکییەکانی گەیشتنیان بە خواست و ئارەزووەکانیان ڕاگەیاندنی جەماوەرییە، کە هاوڵاتیان هەموو جۆرێک لە ئامرازەکانی جەماوەری بۆ ئەو مەبەستە بەکاردەهێنن، لەوانەیە کەسێک گرنگی بە گۆڤارەکانی تەنز و سەرگەرمکردن بدات، یان لاپەڕەی تایبەتی ئەو بوارە لە ڕۆژنامەکاندا بخوێنێتەوە، یان پرۆگرامێکی ڕادیۆیی و تەلەفزیۆنی بکاتە سەرچاوەی چێژوەرگرتن و بەسەربردنی کاتێکی ئاسودە و ئارام، بەڵام سۆشیال میدیا وەک سروشتی خۆی، زیاتر لەلایەن هاوڵاتیانەوە بەکاردەهێنرێت بۆ کات بەسەربردن و چێژوەرگرتن لە

بەسەرهات و نوکتە و قسەی خۆش. سۆشیال میدیا جیهانێکی بێ سنووری خوڵقاندووە بۆ هاوڵاتیان هەتا بتوانن بە سانایی دەستیان بگات بە ئەکاوەنت و پەیجی تایبەتی کاراکتەر و ئەستێرەکانی جیهان لە سەرجەم بوارەکاندا و، بەپێی خواستی خۆیان سود لە بەرهەم و چالاکییەکانیان وەربگرن، بێگومان میدیای کلاسیکی ناتوانێت ئەو زەمینەیە بۆ بەکارهێنەرانی بڕەخسێنێت.

ب- هۆگربوون (Companionship): هۆگربوون، یەکێکی ترە لە فاکتەرەکانی گرنگیدانی هاوڵاتیان بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن، مرۆڤەکان لە ڕێگەی بەکارهێنان و سەیرکردنی بەردەوامی ئامرازە جیاوازەکانی ڕاگەیاندنەوە، جۆرێک لە هۆگربوونیان بۆ دروست دەبێت کە ناتوانن فەرامۆشی بکەن. مرۆڤەکان لەکاتی تەنیایی و نەخۆشی درێژخایەن و بەهۆی ئارەزووە تایبەتیەکانیانەوە بۆ بوار و بابەتێکی تایبەت، یان سەیرکردنی دراما، فیلم، پرۆگرامی سەرگەرم کردن، پەنا دەبەن بۆ ڕاگەیاندن بەمەبەستی پڕ کردنی ئەو ئارەزووە و، لە دوور مەودادا دووچاری هۆگربوون دەبن، بەشێوەیەک کە بەکارهێنانی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن دەبێتە خولیا و فاکتەرێکی کات بەسەربردن، ئارامی و ئاسودەییان پێدەبەخشێت. هۆگربوونی مرۆڤەکان بۆ ڕاگەیاندنی جەماوەری کارلێک و پەیوەندی کۆمەڵایەتی و دەروونی (Parasocial) بەدیدەهێنێ، بەتایبەتی لە ڕێگەی بەرنامە و پرۆگرامی زانایان و کەسایەتییە ناودارەکانی بوارە جیاوازەکانەوە تا ئاستێک کە جێگەی هاوڕێکانیان بۆ دەگرێتەوە (Turow, ٢٠٠٩, p٢١). پرسی هۆگربوون لە میدیای تەقلیدیی و سۆشیال میدیادا جیاوازە، لە سۆشیال میدیادا ئەو پرۆسەیە خێراتر ڕوودەدات، چونکە سۆشیال میدیا خەسڵەتی میدیای فرە ڕەهەند، یان میدیای فرە ژانەر، یان میدیای فرە ئامرازی هەیە. خەسڵەتی مەڵتی میدیایی سۆشیال میدیا وایکردووە کە بەکارهێنەر لە یەک کاتدا سود لە هەموو جۆرەکانی میدیا وەربگرێت، ئەوەش دەبێتە هۆی بەسەربردنی کاتێکی زۆری هاوڵاتیان لەگەڵ ئەم جۆرەی ڕاگەیاندن بەبێ ئەوەی هەست بکەن بە تێپەڕبوونی کات. جاری وا هەیە بەکارهێنەری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان خۆی لەبیر دەکات و، بەهۆی بژاردە زۆرەکانی ناو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە لە بیری دەکات کە کەی و چۆن دەستیپێکردووە و، کەی دەست هەڵبگرێت.

ت- چاودێریکردن(Surveillance): پرۆسەی چاودێری کردن، باشترین ئامرازی پاراستنی کۆمەڵگەی سیاسییە لە نائارامی و ئاڵۆزیی و دروستبوونی گەندەڵی ئابووریی و سیاسیی و پشێوی کۆمەڵایەتی، کە ئەمرۆ ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بە یەکێک لە پایە سەرەکییەکانی ئەژمار دەکرێت. چاودێری میدیایی لە کۆمەڵگەی خەڵک سالاردا، بەشێکی دانەبڕاوی چاودێری جەماوەرییە بەسەر دامودەزگا حیزبی و حکومییەکانەوە، بەئامانجی پاراستنی کۆمەڵگە لە داڕمان و تیاچوون، هەردوو

زانای ئەمریکی (میلڤین فلور) * و (ئیڤێریت دێنیس) *، لە کتێبێکیاندا بەناوی (دەرکی ڕاگەیاندنی جەماوەری) باوەڕیان وایە کە یەکێک لە ڕۆڵە گرنکەکانی ڕاگەیاندن بریتییە لە چاودێری کردنی دامەزاوەکانی حکومەت، بە ئامانجی پشتیوانی کردن و پاراستنی بەرژەوەندییە گشتییەکان، بەشێوەیەک ئەو ڕۆڵە بە گرەنتی دروست کارکردنی دەسەڵاتی سیاسیی و بەرپرسیارێتی لە کۆمەڵگەدا لەقەڵەم دەدەن. (ساعی، منصور، ٢٠١٢، ص٤٦). ڕۆڵی چاودێری کردن لە سۆشیال میدیادا فراوانتر و کاریگەرترە لە میدیای تەقلیدی لەبەرئەوەی کە هەموو تاکێکی هاوڵاتی دەبێتە چاودێر و ئەرکی ڕۆژنامەنووسی هاوڵاتی دەگێڕێت. ئەگەر وڵاتێک دەیان دامەزراوەی میدیایی هەبێت، ئەوا بە هەزاران ڕۆژنامەی ئەلیکترۆنی هەیە و، زۆربەی تاکەکانیش خاوەنی ئەکاونت، پەیج، وێبسایت، چەناڵ و سۆشیال میدیای تایبەت بە خۆیانن بۆ بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیاریی و بابەتی تەنز و سەرگەرم کردن و...هتد. سۆشیال میدیا ئێستا بە کاریگەرترین هۆکاری گۆڕینی بڕیار لە کۆمەڵگە جیاوازەکاندا دادەنرێت، پرس و بابەتەکان بە خێراییەکی زۆر بڵاودەبنەوە تیایدا و، لە ماوەیەکی کەمدا دەگات بە بەکارهێنەرێکی زۆر و ڕای گشتی دروست دەکات.

ث- شرۆڤەکردن (Interpretation): ئەرکی لێکدانەوە و شرۆڤەکردنی ڕووداو و گۆڕانکارییەکان، هۆکارێکی تری بەکارهێنانی ڕاگەیاندنە لەلایەن جەماوەرەوە، لەبەرئەوەی ئەرکی چاودێریکردن ناتوانێت خواستی هاوڵاتیان بۆ ئاگاداربوون لە گۆڕانکارییەکان، بەبێ شرۆڤە و لێکدانەوەی هەواڵ و زانیارییەکان جێبەجێ بکات. گرنگیدانی جەماوەر بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن و بەکارهێنانی ڕاگەیاندنی تەقلیدی و نوێ لەلایەن هاوڵاتییانەوە، بەپێی جۆر و تایبەتمەندی دۆخەکە جیاوازە. شێوازی گرنگیدان لە بارودۆخی ئاسایی و ئارامدا، بەپێی توێژینەوەکان، زیاتر بە ئاڕاستەی ئەرکە میدیاییەکانی وەک کات بەسەربردن و چێژوەرگرتنە، بەڵام هەرچی حاڵەتی نائاسایی و ڕووداو و قەیرانەکانیشە، گرنگیدانی وەرگر تیایدا بە ئامرازەکانی ڕاگەیاندن بە ئاڕاستەی چاودێری کردنی دۆخەکەیە. ئەگەر سەخت و دژوار بێت کە هاوڵاتییەک لە ڕێگەی ڕۆژنامە و گۆڤار، دەزگایەکی ڕادیۆ و کەناڵێکی تەلەفزیۆنەوە ئاگاداری شرۆڤەی هەواڵ و ڕووداوەکان بێت، یان بەشداری بکات لە شرۆڤەکردنیاندا، ئەوا لە ڕێگەی سۆشیال میدیاوە زەمینەی بۆ ڕەخساوە کە بە ویستی خۆی شەن و کەوی ڕووداوەکان بکات، بیرەڕای خۆی لەبارەیانەوە دەرببڕێت، هاوکاتیش بۆچوونەکانی دابەش بکات و بیگەیەنێت بە هاوڕێکانی. بەکارهێنەری سۆشیال میدیا دەشتوانێت ڕاستەوخۆ یان ناڕاستەوخۆ کارلێکی لەگەڵ نێرەردا هەبێت و سەرنجی خۆی بە ڕاشکاویی و دوور لە سانسۆری تەقلیدی میدیای کلاسک دەرببڕێت و بەشدارییەکی کارا بکات لە شرۆڤە و گەیاندنی هەواڵ و زانیارییەکاندا.

## میدیای تەقلیدی و کلاسیکی; یەکتر سڕینەوە یان یەکتر تەواوکردن:

ڕۆڵ و کاریگەری میدیای کلاسیکی، مێژوویەکی دێرینی هەیە، کە دەگەڕێتەوە بۆ کۆنترین ڕۆژنامەی ڕۆژانەی دەستنووس، بەناوی (Acta Diurna)، بە واتای ڕووداوی ڕۆژانە، کە ساڵی ٥٩ی پێش زاین لە ڕۆما، لەلایەن ئیمپراتۆر (یۆلیۆس قەیسەر)ەوە بڵاوکراوەتەوە، گرنگیداوە بە هەواڵ و ئاگاداری سیاسی تایبەت بە دەسەڵاتی ڕۆما لەگەڵ هەواڵ و ئاگاداری کۆمەڵایەتی تایبەت بە دەسەڵاتداران (الابياري، فتحي، ٢٠٠٠، ص١٩). کاریگەری ڕاگەیاندنی تەقلیدی لەگەڵ قۆناغەکانی گەشەکردنیدا زیاتر و زیاتر بووە، بە دەرکردن و بڵاوبوونەوەی گۆڤارەکان زیاتر بەرجەستە بوو، گۆڤاری تایمزی لەندەنی کە ساڵی ١٧٨٥ لەلایەن (جان واڵتەر)ەوە دامەزرا، بووبە یەکێک لە کاریگەرترین گۆڤارەکانی کاروانی ڕۆژنامەگەری جیهانی، بەهۆی جۆری گوتاری ڕاستگۆیانە و ئەو ڕۆژنامەنووسە بوێرانەی کە کاریان تێدا دەکرد (عبده، ابراهيم، ١٩٥١، ص٨٩). پاش بڵاوبوونەوەی ئەو گۆڤارە بە چەند ساڵێکی کەم و لە ساڵ ١٧٨٧دا پەرلەمانتاری بەریتانی (ئیدمۆند بورک)، لەناو هۆڵی پەرلەماندا ڕاگەیاندنی وەک دەسەڵاتی چوارەم ناوزەد کرد و ڕایگەیاند کە ڕاگەیاندن و ڕاگەیاندنکاران پایەی چوارەمی دیموکراسین، لەپاڵ سێ پایەکەی تردا، کە دەسەڵاتەکانی یاسادانان و جێبەجێکردن و دادوەرین، هەروەک باوەڕیشی وابوو کە لە سێ دەسەڵاتەکەی تر بەهێزتر و کاریگەر ترە (ساعي، منصور، ٢٠١٢، ص٤٦). ڕاوێژکاری ڕۆژنامەوانی سەرۆک کۆماری ئەمریکا (جۆن کەنەدی)، دەنووسێت کە: «هیچ سیاسەتمەدارێکی پلە یەک نییە، کە سەرەتای هەر ڕۆژێکی بە خوێندنەوەی نیویۆرک تایمز دەست پێ نەکات و، هەموو بەرپرسەکانی ئەمریکا لە سەرۆک کۆمارەوە بیگرە تا ئەوانی تر، ڕۆژانە واشنتۆن پۆست دەخوێننەوە« (واکر، مارتين، ٢٠٠٤، ص١٦).

پاش دروستبوونی ڕادیۆ، ڕۆڵ و کاریگەری ئەم ئامڕازە نوێیەی ڕاگەیاندنی تەقلیدی زیاتر دەرکەوت. هەر لەوبارەیەوە هەریەک لە (ئارل ئیلهان) * و (نالان دیریک) *، لە نوسینێکیاندا لەبارەی سیاسەتی هەواڵیی لەکاتی شەڕدا، ئاماژەیان کردووە بەوەی کە ڕادیۆ لە جەنگی جیهانی یەکەمدا گرنگترین ئامڕازی پەیوەندیکردن و کاریگەری دروستکردن بووە (ئیلهان، ئارل، دیریک، ئالان، مجله ڕسانه، ٢٠١٥، ص١٢٨). لە سەردەمی جەنگی یەکەمی جیهانیدا سەرۆک کۆماری ئەو کاتی ئەمریکا (نیلسۆن)، توانی لە ڕێگەی هەڵمەتێکی چڕوپڕی ڕاگەیاندنەوە (نوسراو، بیستراو)، هاوڵاتیانی وڵاتەکەی ڕازی بکات بۆ پشتیوانیکردنی وڵاتانی ئەوروپا، کە بە یەکێک لە دەستەکەوتە میدیاییەکانی جیهان بۆ کۆتایی هێنان بە جەنگەکە دەژمێردرێت، (عبدالحميد، صلاح، ٢٠١٣، ص١٠). کاریگەری ڕاگەیاندن لە جەنگی یەکەمی جیهانیدا، لە سەر دروستکردن و ئاڕاستەکردنی بیروڕای گشتی، بووە هۆی ئەوەی کە بەریتانیا دامەزراوەیەک بەناوی (دەزگای بەڕێوەبردنی ڕاگەیاندن) دابمەزرێنێت بۆ سەرپەرشتیکردن و بەڕێوەبردنی ئامرازەکانی ڕاگەیاندن

(مک نیر، برایان، کاظمی، مهدی، مقدمه ای بر ارتباطات سیاسی، ٢٠١٣، ص١٨٩). لە جەنگی دووەمی جیهانیشدا ڕاگەیاندنی نوسراو و بیستراو، ڕۆڵ و کاریگەریان کەمتر نەبوو لە چەک و تەقەمەنی و مۆراڵی سەربازەکانی شەڕ، ڕاگەیاندن بەتەواوی شێوازی میدیای ئاڕاستەکراوی وەرگرت و زیاتر ئەرکی پڕوپاگەندەی سیاسی ئەنجام دەدا کاتێک ڕۆژنامەی (نیۆیۆرک تایمز)ی ئەمریکی ساڵی ١٩٤٢ توانی لە ڕێگەی نوسینگەی وەزیری دەرەوە (سونز) دەستی بگات بە زانیارییەکی زۆر نهێنی کۆمەڵکوژی جولەکەکان لەلایەن هیتلەرەوە، جیهانی تووشی شۆک کرد (الطويسي، باسم، آخرون، ٢٠١٢، ص١٥٠). پاشتریش کاتێک تەلەفزیۆن دروستکرا و، لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە پەرەی پێدرا، لە ماوەیەکی کەمدا بووبە کاریگەرترین ئامڕازی میدیای تەقلیدی، بەهۆی بەکارهێنانی دەنگ و ڕەنگ لە یەک کاتدا توانی سەرنجی بەکارهێنەرانی میدیا بۆ خۆی ڕابکێشێت و تا ئاستێکی بەرچاو لە جەماوەری ڕادیۆ و خوێنەری ڕۆژنامە و گۆڤارەکان کەم بکاتەوە.

> **سۆشیال میدیا جیهانێکی بێ سنووری خوڵقاندووە بۆ هاوڵاتیان هەتا بتوانن بە سانایی دەستیان بگات بە ئەکاوەنت و پەیجی تایبەتی کاراکتەر و ئەستێرەکانی جیهان لە سەرجەم بوارەکاندا.**



پاش دروستبوونی تۆڕی ئینتەرنێت لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم، لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، گۆڕانکارییەکی ڕیشەیی لە بواری میدیادا ڕوویدا، جۆرێک لە میدیا هاتەبوون کە بە میدیای نوێ ناسراوە(ئەگەرچی دروستبوونی هەر ئامڕازێکی میدیایی لە چاو ئامڕازی پێش خۆی بە نوێ ناوزەند کراوە، بەڵام واتای هاوچەرخی میدیای نوێ ئاماژەیە بۆ میدیای ئینتەرنێتی، یان ڕۆژنامەگەری ئەلیکترۆنی)، وەک ئاماژەمان پێدا ئەم جۆرە میدیایە پشت دەبەستێت بە تۆڕی ئینتەرنێت، سەرەتای سەرهەڵدانی دەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای نەوەدەکانی سەدەی بیستەم، کاتێک بۆ یەکەمجار ڕۆژنامەکان نوسخەی کاغەزی خۆیان لە ماڵپەڕە ئەلیکترۆنییەکاندا بڵاوکردەوە.

سەرەتای کاریگەری میدیای نوێ و سۆشیال میدیا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠٠١، کاتێک هاوڵاتیانی فیلیپین لە ڕێگەی کورتەنامەوە داوای ڕێپێوان و گردبوونەوەیان کرد بۆ لەسەرکارلادانی سەرۆک کۆماری وڵاتەکەیان بەهۆی تێوەگلانی لە گەندەڵی و، دزینی ٧١ ملیۆن دۆلار، لە نامەکاندا نوسرابوو"بڕۆن بۆ شەقامی ئێدسا"و"بۆ پرسەی

دیموکراسی پۆشاکی ڕەش بپۆشن"، ئەو گردبوونەوەیە دادگای باڵای ناچارکرد کە سەرۆک کۆمار(جوزیف ئیسترادا) لەسەر کار لابدات و بڵێ"گەل قسەی خۆی کرد"(مجلة یو اس اي, ٢٠٠٧: ٧). بەڵام شۆڕشی میدیای نوێ لە ٢٠٠٥/١٢/١١وەوە دەستیپێکرد، ئەوکاتەی کە تەقینەوەیەک لە کێڵگەی نەوتی(بونسفیلد)لە ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا ڕوویدا و، لە ماوەیەکی کەمدا زیاتر لە ٦٥٠٠ نامەی ئەلیکترۆنی و ڤیدیۆ و وێنەی تەقینەوەکە گەیشتنە وێستگەی ڕادیۆی بەریتانی(بی بی سی)، لەو ڕووداوەدا زیاتر هاوڵاتیان بوونە سەرچاوەی زانیاریی، لە پێشینەی ڕۆژنامەوانی ئەلیکترۆنی توانی پێش ڕۆژنامە و ئامڕازە کلاسیکییەکان بگرێتەوە، چونکە لە هەمان ڕۆژدا زیاتر لە نیو ملیۆن بەکارهێنەر سەردانی ماڵپەڕی BBCیان کرد(مجلة یو اس اي، ٢٠٠٧: ٩).

لە دیارترین کاریگەرییەکانی سۆشیال میدیا دەتوانین ئاماژە بکەین بە شۆڕشەکانی(بەهاری عەرەبی)، کە لە وڵاتی تونسەوە دەستیپێکرد و لە چەند ساڵیکی کەمدا کۆشکی بەشێک لە وڵاتە عەرەبییە دیکتاتۆرەکانی لەرزاند و، گۆڕانکاری ڕیشەیی لە جۆری حوکمڕانی و سیستمی سیاسیاندا دروستکرد. تونسییەکان هیچ کات ڕۆڵی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبووک لە یاد ناکەن کە توانی یەکدەنگی و ڕای گشتی دروستبکات و شۆڕشی(یاسەمین) بە ئەنجام بگەیەنێ و دەسەڵات بڕوخێنێ، لەکاتێکدا پێشتر زانیاری لەلایەن دەسەڵاتەوە قۆرغکرابوو، هاوڵاتیان و ڕۆژنامەنووسان تەنها دەیانتوانی لە دوو ماڵپەڕی ژێر دەسەڵاتی حکومەتەوە زانیاری بەدەست بهێنن کە بریتی بوون لە(www.tunisnews.net)و(www.nawaat.org)(عبد الفتاح، بدون سنة: ٢١).

لە دیارترین سیماکانی سۆشیال میدیا بە ڕاستی کردنی خەیاڵە زانستییەکان بوو، بەتایبەتی لە بواری ڕۆژنامەگەریدا، وەک سەرهەڵدانی جۆرێک لە ڕۆژنامەڕۆبۆتی، یان هاوڵاتی ڕۆژنامەنووس. کە دواتر ئەم دەستەواژەیە سەریهەڵدا(هەموو هاوڵاتییەک ڕۆژنامەنووسە)، ئەم دەستەواژەیە ئاماژەیە بۆ ئەو هاوڵاتییە ئاساییانەی کە خاوەنی تەکنۆلۆژیای نوێ یان مۆبایلی زیرەکن و لە شوێنی ڕووداوەکاندا هەڵدەستن بە تۆمارکردنی وێنە و ڤیدیۆ و پاشان لە سۆشیال میدیای تایبەت بە خۆیاندا بڵاوی دەکەنەوە یان دەینێرن بۆ ئامڕازە میدیاییەکانی تر بە ئامانجی بڵاوکردنەوە و ئاگادارکردنەوەی جەماوەر لەبارەیانەوە. وەک نموونەیەکی دیار ئاماژە دەکەم بە وێبسایتی(OhmyNews) کە ساڵی ٢٠٠٠ لەلایەن ڕۆژنامەنووسی دیاری کۆریای باشوور(ئو یون هو)ەوە دامەزرا، بووە سەرەتایەکی گرنگی سەرهەڵدان و پەرەسەندنی چەمک و کاری ڕۆژنامەگەری هاوڵاتی و هاوڵاتی ڕۆژنامەنووس، لەو ئەزموونەدا زیاتر لە ٧٠٠ ڕۆژنامەنووسی هاوڵاتی کاریان لەگەڵ دەکرد، بەڵام ئەو ژمارەیە بۆ ساڵی ٢٠٠٥ گەیشتە نزیکەی ٣٦ هەزار هاوڵاتی ڕۆژنامەنووس لەسەر ئاستی جیهان، لەکاتێکدا کە تەنها٦٠ ڕۆژنامەنووس بە فەرمی کاریان تێدا دەکرد، ئەم گۆڕانکارییە جۆرایەتییە لەڕووی کاری ڕۆژنامەگەرییەوە




وەرچەرخانێکی گرنگ بوو بەرووی ئازادی ڕۆژنامەگەریی و فراوانبوونی پانتایی کارکردن لە فەزای سایبەردا کە دواتر بووە دەروازەیەک بۆ سەرهەڵدان و گەشەسەندنی سۆشیال میدیا(الشرق الوسط، ٢٠٠٥: عدد ٩٦٩٩).

دەرکەوتنی کاریگەری گەورە و فراوانی میدیای نوێ و سۆشیال میدیا، کاریگەریی و ڕۆڵی میدیای تەقلیدی لاواز کرد، ئەوەش بووە هۆی هەوڵی ئەو جۆرەی میدیا بۆ خۆگونجاندن لەگەڵ تەکنۆلۆجیای نوێی گەیاندن و ڕاگەیاندن تا بتوانن بەردەوام بن و بمێننەوە. هاوکاتیش چەندین ئاڕاستەی نوێ بۆ پێشبینی ئایندەی هەردوو جۆری میدیا(تەقلیدی_سۆشیال میدیا) دەرکەوتن، ئاڕاستەی یەکەم ئاماژە بوو بۆ توانای زۆری ئینتەرنێت کە سۆشیال میدیای بەرهەمهێناوە لە دابینکردنی کات و هەلی گونجاو بۆ بەکارهێنەرانی تا بەشێوەیەکی خێرا هەواڵ و زانیاری بڵاوبکاتەوە و کارلێک و پەیوەندی لەگەڵ نێرەردا دروستبکات، کە میدیای تەقلیدی ئەو توانایەی نەبوو، هەربۆیە ئەم ئاڕاستەیە پێیوایە لە ئایندەدا میدیای تەقلیدی نامێنێت و میدیای نوێ و سۆشیال میدیا جێی دەگرێتەوە. ئاڕاستەی دووەم ئاماژەیە بۆئەوەی کە میدیای نوێ و سۆشیال میدیا ناتوانێت ببێتە جێگرەوەی میدیای تەقلیدی، ئەویش لەو سۆنگەیەوە کە لە قۆناغەکانی گەشە و پێشکەوتن و شۆڕشەکانی ڕاگەیاندندا، هیچ کات ڕۆڵ و کاریگەری ئامڕازێکی ڕاگەیاندن بە سەرهەڵدانی ئامڕازێکی نوێ کۆتایی پێنەهاتووە، چونکە هەر جۆرێک لە جۆرەکانی ڕاگەیاندنی تەقلیدی کۆمەڵێک تایبەتمەندیی و خەسڵەتی هەیە کە بوونەتە هۆی مانەوەیان، بەڵک و ئەوەی گۆڕانکاری بەسەردا هاتووە جۆر و شێوازی کارکردن و گەیاندنی پەیامەکەیانە. ئەم ئاڕاستەیە ئاماژەیە بۆ خۆگونجاندنی میدیای تەقلیدی لەگەڵ سۆشیال میدیا بۆئەوەی بمێنێتەوە، بۆئەوەش دەبێت گۆڕانکاری تەکنۆلۆژی لە گەیاندنی پەیامەکەیدا دروستبکات، هەروەک چۆن ئێستا هەموو گۆڤار و ڕۆژنامەکان، ڕادیۆ و کەناڵە تەلەفزیۆنییەکان خاوەنی ماڵپەڕی تایبەت بە خۆیانن و لەگەڵ جۆرە تەقلیدییەکەیاندا تەواوکەری یەکترن لە بڵاوکردنەوەی هەواڵ و زانیارییەکان و ئەنجامدانی سەرجەم ئەرکە میدیاییەکانی تردا، لەبەرئەوە دەتوانم بڵێم کە میدیای تەقلیدی و سۆشیال میدیا یەکتری ناسڕنەوە، بەڵک و تەواوکەری یەکترن.



**دانا ئەسعەد**
خوێندکاری ماستەر لە بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی پۆلیتەکنیکی سلێمانی

# سەکۆکانی سۆشیاڵ میدیا و
## کاریگەرییان لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییان

دەستپێك

جیهان لە ئێستادا گۆڕانکاریی خێرا و جۆراوجۆر بەخۆیەوە دەبینێت لە بوارەکانی گەیاندن و تەکنەلۆژیای زانیاری، ئەمەش دنیای کردووە بەیەك گوند کە لە چرکەیەکدا زانیارییەکان بە هەموو لایەکدا بڵاودەبنەوە. هیچ گومان لەوەدا نییە ئەم گۆڕانکارییانەش کاریگەریی ڕاستەوخۆیان هەیە لەسەر تاك و دەزگا و دامەزراوەکانی کۆمەڵگە کە جگەلە قبوڵکردنی گۆڕانکارییەکان، سەرقاڵی خۆگونجاندنن لەگەڵیدا بۆئەوەی لە سەرجەم بوارەکاندا سودی لێ وەربگرن.

تۆڕەکانی سۆشیال میدیا لەسەر ئینتەرنێت کە بەناوبانگترینیان فەیسبوکە و بەدوایدا ئەنستاگرام و واتسئاپ و ئەوانیتر، نوێترین تەکنکیی گەیاندن و پەیوەندییەکانن. تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان نەک هەر دەرفەتی پەیوەندی لە نێوان هاوەڵاندا دەڕەخسێنێت بەڵکە یارمەتیشیان دەدات کە یەکتر بناسن و هاوڕێی نوێ بدۆزنەوە و تیم و گرووپی جیاجیا پێکەوە گرێ بدەن. لە سۆنگەی ئەوەشی کە تۆڕەکانی سۆشیال میدیا دەرفەتی جیاجیان ڕەخساندووە بۆ دروستکردنی پەیوەندی، لەگەڵ ئەوانیشدا چەمکی «کۆمەڵگا گریمانەییەکان» دەرکەوتووە کە کاریگەریی داناوە لەسەر پێکهاتەی کۆمەڵایەتیی و سرووشتی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، سرووشتی پەیوەندییە کلاسیکییەکانیش لە ئێستادا گۆڕانکارییان بەسەردا هاتووە. بەهەمان شێوەی کارلێکی ڕاستەوخۆ کە بزاوتی ژیان و پەیوەندییە مرۆییەکان ڕێکدەخات، لە ئێستادا پەیوەندییەکان سنوورە جوگرافییەکان و تەنانەت، سنوورە نەتەوەیی و ئایینیی و ڕۆشنبیرییەکانیشی تێپەڕاندووە.

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی لەسەرەوە باسکرا ئەم توێژینەوەیە باس لە کاریگەریی تۆڕەکانی پەیوەندی و گەیاندن دەکات لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، لەبەر ڕۆشنایی تیۆری پشتبەستن بەهۆکارەکانی گەیاندن کە تێکەڵەیەکە لە کۆمەڵناسی و هەندێ چەمکی دەروونناسی و پەیوەندی نێوان سیستمە جۆاوجۆرەکانی کۆمەڵگە ڕووندەکاتەوە لە ڕێگای پشتبەستن بە بەکارهێنان و تێربوون لەلایەک و تیۆری کاریگەربوونی کلاسیکی لەلاکەیتر. ئەم تیۆرییەش دیدێکی فەلسەفی دەخاتەڕوو کە دوو شت کۆ دەکاتەوە ئەوانیش گرنگیدانی کلاسیکییە بەناواخنی پەیامە میدیاییەکان و ئەو کاریگەرییانەی لەسەر جەماوەر بەجێ دەمێنێت لە ئەنجامی بەرکەوتن لەگەڵ ئەو کاریگەرییانە. توێژینەوەکان ئەوەش دەردەخەن کە ئاستی پشتبەستنی کۆمەڵگاکان بە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن جیاوازن؛ لە هەرکوێیەک ئەو هۆکارانە بتوانن پێداویستییەکانی خەڵک دابین بکەن و ئامانجەکانیان لەبەرچاو بگرن ئەوە زیاتر خەڵک پەنایان بۆ دەبات، لە دەرەوەی ئەمەش پلەی پشتبەستن بە هۆکارەکانی ڕاگەیاندن بەپێی بارودۆخ و تایبەتمەندیی کەسەکان دەگۆڕێت.

## چەمکی سۆشیال میدیا:

توێژینەوە زانستییەکان سەلماندوویانە، مرۆڤ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە و بەبێ پەیوەندیگرتن لەگەڵ دەوروبەری خۆی ناتوانێت پێداویستییە بایەلۆجیی و سایکۆلۆجییەکانی پڕ بکاتەوە. هەروەها ناشتوانێت پێداویستی کۆمەڵایەتی خۆی دابین بکات ئەگەر پەیوەندی نەکات بەدەوروبەری خۆیەوە. لەم سەردەمەشدا بوارێکی بەرفراوان ڕەخساوە بۆ مرۆڤ لە ڕێگەی تۆڕی کۆمەڵایەتییەوە (Social Networking) کە گوزارشت لە خۆی و لە هەست و بۆچوونەکانی بکات و لەگەڵ خەڵکدا ئاڵوگۆڕیان پێ بکات. تۆڕەکانی گەیاندنی کۆمەڵایەتی شێواز و جۆری زۆرە، دەکرێت لەبەر ڕۆشنایی ئەرکی دەزگا میدیاییەکان پۆلێن بکرێتەوە. لەوانەش هەن کە پێگەی بڵاوکردنەوەن وەک

(ویکیپیدیا)، هەشن پێگەی پاراستن و هەڵگرتن و بڵاوکردنەوەی گرتەی ڤیدیۆیین وەک (یوتیوب) یان وێنە (فلیکەر)، هەشن کۆمەڵگا یان سەکۆی گریمانەیین. (Forums) زۆر تۆڕی کۆمەڵایەتی تر هەن وەک (فەیسبوک و تویتەر)، قەبارەی بەکارهێنانی ئەمانەش لە پێگەیەکەوە بۆ پێگەیەکی تر جیاوازە، لەهەمانکاتیشدا سەرجەمیان بەکاردەهێنرێن بەجۆرەها شێوازی جۆراوجۆر. (قتلونی، ٢٠١٤، ص٩٦).

سۆشیال میدیا کە میدیای کۆمەڵایەتیشی پێ دەوترێت چەمکێکی فراوانە و تۆڕێکی ئەلەکترۆنییە کە ڕێگەدەدات بە بەشداربوو پێگەی تایبەت بەخۆی هەبێت تێیدا. لە ڕێگەی ئەو پێگەیەشەوە کەسەکە پەیوەست دەبێتەوە بە ئەندام و بەشداری ترەوە کە هەمان خولیا و حەزی ئەمیان هەیە (المشهداني والحمداني، ٢٠٢٠، ٨٤). هەندێکیش پێیانوایە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان شێوازێکی سانا و سادەن لە پەیوەندیی مرۆیی، چونکە لە یەک کاتدا دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ پەیوەندیکردن لەگەڵ زیاتر لە یەک کەس (خزم، هاوڕێ، هاوکار) لە ڕێگەی پێگە و خزمەتگوزاری ئەلەکترۆنییەوە (المقدادي، ٢٠١٣، ٢٤)، هەندێکیش پێیانوایە هاوکۆلکەی هاوبەشی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان پێکەوە گرێدانی ئەو خەڵکانەیە کە یەک گرنگیدانیان هەیە، ئەویش لە ڕێگای گۆڕینەوەی نامە و تەماشاکردنی پرۆفایلی یەکتریی و زانینی ئەو شتانەی کە دەیخەنەڕوو بۆ شەیرکردن (المطيري، ٢٠١٥، ٤٧).

تایبەتمەندی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیش ئەوەیە کە دەرفەتی پەیوەندی گۆڕینەوە دەڕەخسێنێت لە نێوان بەکارهێنەرەکانیدا هەرکاتێک بیانەوێت و لە هەر جێگایەکی جیهانەوە. هەروەها یارمەتییان دەدات پەیوەندی بینین و دەنگی و گۆڕینەوەی وێنە ئەنجام بدەن لەگەڵ ئەو ئیمکاناتانەی تر کە پەیوەندی کۆمەڵایەتییان بۆ دروست دەکات (المشهداني والحمداني، ٢٠٢٠، ٨٥). بە بۆچوونی هەندێک لە شارەزایان یەکێک لە کاریگەرییە نێگەتیڤەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ئەوەیە کە ئەو پەیوەندییانەی لە ڕێی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە دروست دەبن بەهۆی ئەوەی زیاتر لە ڕێی نووسینەوەن کەمتر هەست و سۆزی پەیوەندییەکی ڕاستەقینەیان تێدا بەدی دەکرێت. بەواتایەکی دیکە ئەو هەست و سۆزەی لەکاتی پیاسەکردنی دوو کەسدا دروست دەبێت لە کاتی چاتکردن یان بیروڕاگۆڕینەوە لەناو تۆڕە کۆمەڵایەتییەکاندا دروست نابێت. ئەمەش سەلمێنەری ئەوەیە کە هەستی هاوسۆزی لە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی ناو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا لاوازە (محمد علی سلطانی فر، ٢٠١٤).

فەیسبوک یەکێکە لە گرنگترین ماڵپەڕ و پێگەکانی تۆڕی کۆمەڵایەتی، تەنها تۆڕێکی کۆمەڵایەتی نییە، بەڵکە سەکۆیەکی تەکنەلۆژیشە، هەموو بەکارهێنەرێک دەتوانێت بەئاسانی بەکاری بهێنێت. بیرۆکەی ئەم تۆڕە دەگەڕێتەوە بۆ یەکێک لە خوێندکارەکانی زانکۆی هارڤارد کە (مارک زۆکەربێرگ)ە و دواتر بووبە گەنجترین ملیاردێری جیهان و سەرەتای بیرۆکەکەشی لەوەوە بۆهات کە تۆڕێک دروستبکات بۆ یەکترناسینی خوێندکارەکانی هارڤارد تا لە پاش دەرچوونیش پەیوەندییان هەر بمێنێ و پاش ئەوەی لە

شوباتی ٢٠٠٤ دەستی بەکارکردن کرد، لە ئەمڕۆدا بووەتە گرنگترین تۆڕی کۆمەڵایەتی و زۆرترین بەکارهێنەری هەیە (نومار، ٥٥_٥٦).

فەرهەنگی (Dictionary of media and communications) فەیسبوک بەوە پێناسە دەکات کە پێگەیەکە لە پێگەکانی تۆڕی کۆمەڵایەتی، لە ساڵی ٢٠٠٤ دامەزراوە، دەرفەت دەبەخشێت بۆ بڵاوکردنەوەی ئەژمار و لاپەڕەی تایبەت. (Dictionary of media and Communication. ٢٠٠٩).

شارەزایان پێناسەی جۆراوجۆریان خستووەتەڕوو لەبارەی تۆڕی کۆمەڵایەتی فەیسبوکەوە، هەر لە سەرهەڵدانییەوە تا ئێستا، یەکێک لەو پێناسانە ئەوەیە کە «بەناوبانگترین و ناسراوترین پێگەی کۆمەڵایەتییە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت، لە ڕێگەی ئەم تۆڕەشەوە بەکارهێنەران دەتوانن زانیاری بگۆڕنەوە و پەیوەندیی هاوڕێیەتی دروستبکەن» (سعودي، ٢٠١٤، ص٤٤).

فەیسبوک سەر بە تۆڕی کۆمەڵایەتییە، لە ڕێگەی فەیسبوکەوە دەتوانرێت زانیاریی و بابەت شەیر بکرێت، زانیاری ئاڵوگۆڕ بکرێت لەگەڵ خەڵکی تر بە خۆڕایی، بەکارهێنەرانی ئەم تۆڕە دەتوانن ئاڵوگۆڕی بیروڕا بکەن و چالاکی یەکتر بزانن. بەکارهێنەرانیشی دەتوانن زانیاری لەگەڵ هاوڕێکانیان شەیر بکەن و بە دەنگ و ڕەنگ پەیوەندی دروستبکەن. فەیسبوک پێگەیەکی گرنگە بۆ پەخشکردنی وێنە و فۆتۆی کەسێتی، ڕۆژانەش لە ڕێگەی ئەم تۆڕەوە ئەپلۆد (Upload) و داونلۆدی (Download) ملیۆنەها وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی دەکرێت. چالاکییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر دەبن، چونکە مینبەرێکن بۆ دەربڕینی بیروڕا و گۆڕینەوەی کۆمێنت و کارلێککردن لەبارەی ڕووداو و گۆڕانکارییە گرنگەکان. فەیسبوک ڕۆڵێکی بنەڕەتیی هەیە لە ژیانی سیاسیی و کۆمەڵایەتیی و ڕۆشنبیری کۆمەڵگاکان، ڕەهەندێکی نوێی بەخشیوە بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی نێوان ئەندامانی کۆمەڵگا.

### تایبەتمەندییەکانی فەیسبوک:

بەکارهێنانی فەیسبوک ئەم بوار و دەرفەتانەی خوارەوە دەڕەخسێنێت (فارس، ٢٠١٦، ص٤٨):

یەکەم: دروستکردنی پەیوەندی و ئاڵوگۆڕکاریی لە نێوان ئەندامانی بەشداری تۆڕ لە ڕێگەی:

أ. زیادکردنی هاوڕێ و دۆزینەوەی هاوڕێ لە ڕێگەی (Add Friend) بۆ هەرکەس خۆی بیەوێت یان ئارەزوو بکات. ئەم کارەش پێویستی بە ڕەزامەندی و قبوڵکردنی خەڵکی تر هەیە، هەموولایەک سەرپشکن لەوەی داواکارییەکە قبوڵ بکەن یان ڕەتی بکەنەوە. فەیسبوک کاری کردووە بۆ ئاسانکاریی پرۆسەکە بۆ ئەوانەی داوای هاوڕێیەتییان بۆ ئەنێریت، ئەوان دەتوانن قبوڵی بکەن یان داواکە ڕەتبکەنەوە، هەروەها زانیاری دەربارەی ئەو کەسە بزانن کە داوای هاوڕێیەتی کردووە لە ڕێگەی تەماشاکردنی پرۆفایلە شەخسییەکەی Profile)).

ب. هاوڕێکان لە فەیسبوک دەتوانن پاش یەکترناسین زانیاری ئاڵوگۆڕ بکەن، ئەگەرچی لە واقعیشدا یەکتر ناناسن.

ج. ڕەخساندنی تایبەتمەندیی پێشنیازکردنی هاوڕێی نوێ، ئەمەش دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ ئەوانەی ماوەی زۆر دابڕاون کە یەکتر بناسنەوە یان پەیوەندی بەیەکترەوە بکەنەوە و تۆڕی هاوڕێیەتی خۆیان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان فراوانتر بکەن.

د. بەکارهێنەر دەتوانێت لیستی هاوڕێکانی خۆی ببینێت بەپێی ڕیزکردنی پیت لە یەکەمەوە لەگەڵ زانیاری لەبارەی تەلەفۆن و ژمارەی هاوڕێ هاوبەشەکانیان.

هـ . هاوڕێیان دەتوانن چاتینگ بکەن (Chatting) و نامە بگۆڕنەوە (Messages) لەگەڵ گۆڕینەوەی دیاری گریمانەیی و هەواڵ بەیەکتر بدەن لەبارەی بۆنە و چالاکییە کۆمەڵایەتییەکان، هەروەها دەتوانن هەواڵ بەیەکتر بدەن لەبارەی کۆڕ و سیمینار و چالاکی و کۆبوونەوە گشتییەکان و بۆنەکانی لەدایکبوون.

فەیسبوک مافی ئەوەشی ڕەخساندووە بۆ هەمووکەس کە لە ڕێگای (Delete) هەرکەسی نەویست لە لیستی هاوڕێکانی خۆی لایبدات یان بلۆکی بکات (Block).

دووەم: خزمەتگوزاری خاوەن کۆمپانیا و بزنسمانەکان: کۆمپانیا گەورەکانی ڕیکلام پشت بە فەیسبوک دەبەستن لە ڕیکلامکردن بۆ بەرهەم و کاڵاکانیان، چونکە فەیسبوک یەکێک لە ئاسانترین میکانیزمەکانی میدیای هاوچەرخە و زۆرترین کاریگەریی هەیە لە بواری بازاڕکردن و ڕیکلام.

سێیەم: خزمەتگوزاری وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی: هەموو بەکارهێنەرێک دەتوانێت وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی دابەزێنێت یان ئەپلۆدی بکات لە ڕێگەی فەیسبوکەوە. هەندێ ئاماریش باس لەوە دەکەن دەکرێت دەیان ملیۆن گرتە ڤیدیۆیی لەماوەی یەک مانگدا دابەزێنرێت.

چوارەم: دروستکردنی پەیوەندی لە نێوان کۆمەڵگا گریمانەییەکان:

ئەویش لە ڕێگەی چالاکی و چات کردن و پەیوەندی گۆڕینەوە دەبێت لە نێوان ئەو کەسانەی کە یەک دوانگە و مینبەری هاوبەش کۆیان دەکاتەوە لەچوارچێوەی گرووپێکی دیاریکراودا، دەکرێت مەبەست لەمە ڕاهێنان و فێربوون یان هەر بابەتێکی تر بێت.

پێنجەم: ئاگاداربوون لە هەواڵ و زانیاری دەربارەی کەسایەتییە گشتییەکان لە سەرجەم بوارەکاندا: وەک کەسایەتییە سیاسییەکان، کەسایەتییە وەرزشیی و هونەرییەکان و هەموو ئەوانەی لە بواری گشتیدا کاردەکەن چ کۆمەڵایەتی بێت یان ڕۆشنبیریی و بەکارهێنەری فەیسبوک دەتوانێت ئاگاداری هەواڵ و بیروڕا و زانیارییەکان و ئەو بۆچوونانەبێت کە پەیوەستە بەوانەوە.

شەشەم: پاراستنی پێگەی ئەلەکترۆنی (Websites) و جێگیرکردنی هەواڵ و وێنە و گرتەی ڤیدیۆیی، واتە بەکارهێنەر دەتوانێت لە ڕێگەی فەیسبوکەوە ئەو لینک و سایت و پێگە ئەلەکترۆنیانە بپارێزێت کە دەیەوێت و لەکاتی پێویستدا بگەڕێتەوە بۆ سەری یان کەڵکیان لێوەرگرێت هەرکاتێک ویستی. بەپێی هەندێک لە توێژینەوەکان کە پشتیان بە ڕاپرسی بەستووە لەگەڵ بەکارهێنەرانی فەیسبوک، بەشێکی بەرچاوی بەکارهێنەرانی فەیسبوک

پێیانوایە لەڕێی فەیسبوکەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان بەهێزتر بووە. لەگەڵ هەندێک کەس پەیوەندییان دروستکردووە کە لە دونیای واقیعیدا هەرگیز دەرفەتی ئەوەیان بۆ نەدەڕەخسا کە یەکتر بناسن و ئاڵوگۆڕی بیروڕا و زانیاریی بکەن. تەنانەت هەندێکیان پێیانوایە کە بەهۆی ئاڵوگۆڕی زانیاریی و بیروڕا لەناو فەیسبوکەوە زیاتر لە جاران بەرامبەر بە ڕووداوە کۆمەڵایەتیی و سیاسییەکان هەستیاربوون و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و بەتایبەتیش فەیسبوک جۆرێک لە هاودەنگیی و یەکێتی لە نێوان بەکارهێنەراندا دروست دەکات بەرامبەر بە ڕووداوە سیاسیی و کۆمەڵایەتییەکان. ( سید وحید عقیلی، ٢٠١١)

**تویتەر:**

تویتەریش یەکێک لە بەناوبانگترین تۆڕەکانی گەیاندنە کە لە ئازاری ٢٠٠٦ کەوتووەتەگەڕ وەک پرۆژەیەکی لێکۆڵینەوەی کۆمپانیای ئۆدیۆی ئەمەریکی لە سان فرانسیسکۆ، وشەی تویتەر واتە جریوە کە ئەویش وەک باڵندەیەکی شین لەلا تەنیشتەوە دەردەکەوێت. یەکێک لە تایبەتمەندییەکانی ئەم تۆڕەش دروستکردنی هاوڕێیەتییە و هەمووکەس دەتوانێت فۆڵۆی خەڵکانێک بکات کە پێشتر نایانناسێت یان کۆمێنت لەسەر بابەتی خەڵکی تر بدات یان نامە بنێرێت یان ڕیکلام بۆ خۆی بکات. لێکۆڵینەوەکان ئەوە دەردەخەن ٧٥٪ سیاسییەکان تویتەر بەکاردەهێنن (المشهداني والحمداني، ٢٠٢٠، ٨٥).

بەهۆی ئەوەی زۆربەی کەسایەتییە سیاسییەکان لە تویتەردا چالاکن، زۆرێک لە شارەزایان پێیانوایە تویتەر بووەتەهۆی ئەوەی ئاستی وشیاری خەڵک بەرامبەر بە پرسە سیاسییەکان زیاتر بێت. جگەلەوەش تویتەر یارمەتیدەرە بۆ هەماهەنگی دروستکردن لە نێوان بەکارهێنەرانیدا کاتێک بیانەوێت لەسەر پرسێکی سیاسی دیاریکراو هەڵوێستی دیاریکراو بگرنەبەر ئەویش لە ڕێگەی هاشتاگەوە، کە جۆرێک لە کەمپینی سیاسی دروست دەکرێت (webima, ٢٠١٦)

**یوتیوب:**

ئەم تۆڕە لە ٢٠٠٥ کەوتووەتە کار و لە ٢٠٠٦ بووەتە پێگەیەکی خێرای بڵاکردنەوەی ڤیدیۆ لە ئینتەرنێت. ئەم پێگەیەش هەندێک تایبەتمەندی هەیە لەوانە: (کمال، ٢٠١٤، ٥٩):

- ناسینی ئەو کەسانەی بابەتێکی دیاریکراو بڵاودەکەنەوە، ئیتر چ لە ڕێگەی شوێنپێهەڵگرتنی بێت یان دووبارە بڵاوکردنەوە و ناساندنی.
- دەرفەت دەڕەخسێنێت بۆ بڵاوکردنەوەی پرۆگرامی گرنگ و هەر بەهۆی ئەم کاریگەریەشەوە دەیان پرۆگرام و تۆڕی تر پاشگری (توب)یان هەڵگرتووە.

**ئەنستاگرام:**

ئەمیش ئەپڵیکەیشنێکە بۆ گۆڕینەوەی فۆتۆ لەگەڵ هاوڕێیان و زیاتر ئەوانە بەکاریدەهێنن کە تەمەنیان لەنێوان ١٨_٣٠ساڵدایە (أمین، ١٢٢).

### تەکنەلۆژیای نوێ و کاریگەریی لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان

پەرەسەندنە تەکنەلۆژییەکان و پێشکەوتنی ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و سۆشیال میدیا، کاریگەریی بەرچاویان لەسەر کارلێکی کۆمەڵایەتی بەجێهێشووە، ئەمە گەیشتووەتە ڕادەیەک کە بکرێت پێناسەی نوێ بۆ پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بخرێتە ڕوو، تەنانەت پەیوەندی نێوان یەک خێزانیش، بۆ نمونە کات بەسەربردن لە نێوان ئەندامانی یەک خێزان گۆڕانکاریی زۆری بەسەردا هاتووە بەهۆی سەرقاڵبوونی تاک بە پەیوەندی دەرەکی لەگەڵ کۆمەڵێک کەسدا کە لە جێگای جیاجیا دەژین، ئەوەش بەهۆی تۆڕی ئینتەرنێتەوە. لەم میانەیەدا ئەوە دیارە کە کۆمپیوتەر (Computer) ئایپاد و تابلێت (Tablets) کاتەکاتی ئیشکردن و کاتی دیاریکراویان بۆ خێزان تێکەڵکردووە، ئەمەش گەیشتووتە ڕادەی ئەوەی هەندێ کەس بتوانن لەماڵەکانی خۆیانەوە ئیش بکەن و هەمان مووچەی پێشوو وەربگرن کە دیاری کرابوو بۆیان لەوکاتەی لە ئۆفیس و لە دەرەوەی ماڵەکانیان کاریان دەکرد Gustavo, ٢٠٠٦).)

لەسەر ئەم بنەمایەش دەکرێت بوترێت واتای کاریگەربوون لەوەوە دێت کە شتێک یان بابەتێکی دیاریکراو کاریگەری لەسەر بابەتەکانی تر دروستبکات. یان شتێک بەشێوەیەکی تایبەت کاریگەریی دروستبکات لەسەر بارودۆخ یان ژیانی خەڵکانی تر (Oxford Dictionaries ٢٠١٨). لەم ڕووەشەوە زۆربەی هاوڵاتیان بەتایبەت توێژی گەنجان کەوتوونەتە ژێر کاریگەریی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی بەهۆی پێشکەوتنی تەکنەلۆژیا و تۆڕەکانی ئینتەرنێت و دەرکەوتنی میدیای نوێ (New Media). لەگەڵ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و فەیسبوک بەشێوەیەکی تایبەتتر، ئەمرۆکە ملیۆنەها کەس بەشدارن لە فەیسبوک ئەمەش وایکردووە دەسکەوتنی زانیاریی و دۆزینەوەی پەیوەندی نوێ و گەڕان و پشکنین کارێکی ئاسانتر بێت. هەروەها هەمووکەس دەتوانێت لە ڕێگەی ئەپەکانی خۆیەوە لە مۆبایلی زیرەک و سمارت فۆن (Mobile Applications) پەیوەندییەکی تێکچڕژاو دروستبکات، بەڵام ئەوە هەیە کە دۆزینەوەی هاوڕێ لە ڕێگەی ئینتەرنێتەوە چەندە کارێکی ئاسانە، سۆز و پەیوەندی باوی نێوان هاوڕێ گریمانەییەکان پتەو و بەهێز نییە، ئەمەش یەکێکە لەلایەنە نەرێنییەکانی ئەو پەیوەندی دروستکردنەی کە لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە دروست دەکرێت (Bonanno, ٢٠١٥).

بەگەڕانەوە بۆ ڕای ماکلوهان و پاوەر، ئەوە دەبینین کە تەکنەلۆژیا جیهانی کردووە بە گوندێکی گریمانەیی. هەردووکیشیان پێیانوایە ئینتەرنێت کار لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندییەکان دەکات لە ژینگەیەکی یەکسان، ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت بۆ بەکارهێنەران کە لە ڕۆتینی ژیانی ڕۆژانە دەربچن. هەندێ پسپۆڕیش پێیانوایە ئینتەرنێت ژینگەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانە، هەندێکی تر باس لەوە دەکەن ئینتەرنێت شیاو نییە بۆئەوەی ببێتە زەمینەی دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی پتەو و کاریگەر McLuhan & Powers, ١٩٨٩).)





## تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان

ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کاریگەرییان هەیە لەسەر پەیوەندیی کۆمەڵایەتی سەرجەم بەکارهێنەران. ژمارەیەک لە خەڵکیش لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە پەیوەندی کۆمەڵایەتییان دەستدەکەوێت و ئەمە دواتر پەرە دەسێنێت بۆ پەیوەندییەکی ڕاستەقینە لە هەندێک حاڵەتدا (Boase & Wellman, ٢٠٠٤).

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان جیهانێکی گریمانەییە کە جۆرەها پەیوەندیی کۆمەڵایەتی تێدا سەرهەڵدەدات و گەشە دەکات. لەناو ئەم تۆڕەشدا فەیسبوک لە هەموویان کاریگەرترە کە خۆی سەپاندووە بەسەر ڕاڕەوی ژیاندا بەهۆی نزیکایەتییە ڕۆشنبیریی و فیکرییەکان. ئەمەش وایکردووە بەکارهێنەرانی ڕۆژ لەدوای ڕۆژ زیاتر ببێت، بەجۆرێک ئەندامانی خێزانێک زۆربەی کاتەکانیان بەدیار فەیسبوکەوە بەسەر دەبەن لەبری بەسەربردنی کات لەگەڵ یەکتر. پەیوەندیی کۆمەڵایەتی پێناسەی جۆراوجۆری هەیە وەک ئەوەی (روبیرت غوارت) کە دەڵێت: (پەیوەندییەکە لە نێوان کەسێک یان زیاتر، یان پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان لەلایەن تاکەکانەوە دادەڕێژرێتەوە و بەوانەوە پەیکەری کۆمەڵایەتی تەواو دەبێت». ئەمەش سەرجەم ئەو پەیوەندییانە دەگرێتەوە کە تاک دروستی دەکات لە ژیانی ڕۆژانەی خۆیدا لە شار و جێگا گشتییەکان و لە دەزگا پەروەردەییەکان و لە چوارچێوەی ئەم پەیوەندییەشدا کاتی ڕۆژانەی خۆیان بەسەر دەبەن (Gault, ٢٠١٦).

## کاریگەرییە کۆمەڵایەتییەکانی سۆشیال میدیا:

زۆرێک پێداگرن لەسەر ئەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی سەردەمی ئێستامان گۆڕاون (Cumming Butler and Kraut, ٢٠٠٢)، ئەمەش کاریگەریی هەبووە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی خەڵک بەگشتی و بەتایبەت ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتییانەی خەڵک کە لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتەوە دروستی دەکەن (Bargh & McKennna, ٢٠٠٤) جەخت لە کاریگەریی ئینتەرنێت دەکاتەوە لەسەر ژیانی کۆمەڵایەتی، هەروەها جەختی لەوەش کردووەتەوە کە ئینتەرنێت ڕۆڵی گەورەی دیوە لە سەرلەنوێ دارشتنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. لەبارەی کاریگەریی ئینتەرنێتیش لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان (Tyler, ٢٠٠٢) پێیوایە کاریگەریی ئینتەرنێت لەسەر پەیوەندییەکان ڕێژەییە لەڕووی دروستکردنی گۆڕانکاریی لەسەری لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەرییەکی کەمی هەیە لەسەر لایەنەکانی تری ژیان. سەبارەت بە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیش ئەوە یەکێکە لە ڕەهەندە گرنگەکانی ژیانی مرۆڤ کە لە سەردەمی بەجیهانی بووندا گۆڕانی زۆری بەسەردا هاتووە لە ڕێگەی تۆڕی ئینتەرنێتیشەوە بەدیاریکراویی و بەشێوەیەکی بەربڵاو. (Shklovski and Kraut, ٢٠٠٦) ئاماژەی بەوەکردووە، ئینتەرنێت و کۆمپیوتەر و مۆبایلی زیرەک (Smart Phones) کاریگەریی و جێ پەنجەی خۆیان لەسەر

پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان بەجێهێشتووە، پێشیوایە سەردەمی پەیوەندی کۆمەڵایەتی کلاسیکی بەشێوەیەکی بەرچاو بەسەرچووە، لەبری ئەوەش جۆرێک لە پەیوەندیی گریمانەیی دروست بووە، ئێستا پەیوەندی و بۆنە کۆمەڵایەتییەکان بە بەکارهێنانی ئینتەرنێت ڕێکدەخرێن. دوای وردبوونەوە لەو بیروڕایانەی لەبارەی ئینتەرنێتەوە هەن یان تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و کاریگەرییەکانی لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، بەگشتی دەکرێت کۆی بۆچوونە جیاوازەکان لە دوو بۆچوونی جیاوازدا پۆلێن بکەین.

> **تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هۆکارێکن بۆ لاوازکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، واتە ڕۆڵی هەیە لە دابڕینی تاک و هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ڕاستەقینەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە**

بۆچوونی یەکەم: تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بووەنەتە هۆیەک بۆ بەهێزکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، لەم میانەیەشدا (Barry) لە ساڵی ٢٠٢١ ئاماژەی بەوەکرد کە کۆمەڵگای گریمانەیی وەک تۆڕێکی پەیوەندی کەسێنی دەرفەتی یارمەتیدان و خووپێوەگرتن و گۆڕینەوەی زانیاری دەڕەخسێنێت لەگەڵ هەستکردن بە کەسایەتی و هەبوونی شوناسی کۆمەڵایەتی. کۆمەڵێک توێژەر پێیانوایە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان هێزێکی پۆزەتیڤی هەیە لە دروستکردنی پەیوەندی کۆمەڵایەتی لە نێوان خەڵکدا، ئەمەش لەسەر بنەمای قسەی بەکارهێنەران کە توانیویانە لە ڕێگەی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە پەیوەندییەکی نوێ و جۆراوجۆر دروستبکەن بەبێ ئەوەی ڕەهەندی جوگرافیی و ڕۆشنبیری هیچ کاریگەرییەکی لەسەر ئەو پەیوەندییانە هەبێت. زۆربەی بەکارهێنەران باوەڕیان وایە، تۆڕی کۆمەڵایەتی بووەتە هۆکارێک بۆ بەردەوامیی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی پێشوو یان گێڕانەوەیان.

بۆچوونی دووەم: پێیوایە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هۆکارێکن بۆ لاوازکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتی، واتە ڕۆڵی هەیە لە دابڕینی تاک و هەڵوەشاندنەوەی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییە ڕاستەقینەکانی نێوان تاکەکانی کۆمەڵگە، چونکە وەهای کردووە تاکەکان زۆبەی کاتەکانی خۆیان لە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ببەنەسەر، ئەمەش وایکردووە دابڕان و کەنارگیری سیمای زاڵ بێت لە فەزای پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان و سەرەنجامیش پەرتەوازەیی کۆمەڵایەتی لێکەوتووەتەوە. توێژینەوەکان دەریدەخەن ئاستی پشتبەستن بە بەکارهێنانی سۆشیال میدیا لەناو گەنجان و بەکارهێنەرانی ئینتەرنێتدا بەرزە و بەپێی ئامارەکانی فەیسبوک لەکۆی ٢,٥ ملیار بەشداربووی تۆڕەکە تا ساڵی ٢٠٢٠ دەوروبەری ١,٦٦ ملیاریان لە ٢٠١٩ دا لەسەر تۆڕەکە ئەکتیڤ بوون (الاتحاد، ٢٠٢٠)، پشتبەستنی خەڵکیش بەم هۆکارانە کە بەشێکن لە

میدیا دەچنە چوارچێوەی پەیوەندی خەڵک لەگەڵ میدیا لەناو کۆمەڵگادا (عمارة، ٢٠٠٥، ٢٥٧). توێژینەوەیەکی مەیدانی کە (٥٤٦) کەس بەشدارییان تێداکردووە لە کوردستان، ئەوە ئاشکرا دەکات کە زیاتر لە نیوەی بەشدارانی ئینتەرنێت باس لەوە دەکەن بۆ وەرگرتنی زانیاری سەردانی سۆشیال میدیا دەکەن، ٧,٤٪ ی بەشدارانیش هۆکارەکەی دەگێڕنەوە بۆ قسەکردن و زانیاری گۆڕینەوە لەگەڵ هاوڕێ و خزمەکانیان (تۆربین، ٢٠٢١). توێژینەوەی مەیدانی تر گەیشتووە بەو ئەنجامەی فەیسبوک کاریگەریی لەسەر بەهێزکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی گەنجانی هەرێم نییە، تەنانەت تەواو بە پێچەوانەوە، کاریگەریی لەسەر لاوازکردنی ئەو پەیوەندییانە هەیە. توێژینەوەکە، ڕوونیشی دەکاتەوە، لایک و کۆمێنتو شەیرکردنی پۆستی هاوڕێکان لەلایەک و، نامە و گفتوگۆکان لەلایەکی ترەوە، ڕۆڵیان لە بەهێزکردنی پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی ئەو گەنجانەدا نەبووە (مراد، ٢٠٢٠، ٥٩١).

## دەرەنجامەکان

لەبەر ڕۆشنایی ئەوەی لەسەرەوە باسمان کرد، دەردەکەوێت لایەنێکی خراپ هەیە لەبەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، ئەویش ئەوەیە ئەو کات و ماوەیەی بەکارهێنەران خەرجی دەکەن بەدیار فەیسبوک و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە دەرفەتی ئەوە لەبار دەبات کە پەیوەندییەکی کۆمەڵایەتی ڕاستەقینە لەگەڵ خەڵکی تردا دروست بکرێت. هەروەک لەبەر ڕۆشنایی ئەوەش دەکرێت بوترێت ئینتەرنێت بەشێوەیەکی گشتیی و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکی تایبەتی کاریگەریی گەورەیان لەسەر کۆمەڵگە داناوە. هەروەها جێگە دەستیشیان دیارە لەو گۆڕانکارییانەی بەمدواییە هاتوونەتە کایەوە. بەڵام بەشی زۆری ئەو پەیوەندی و هاوڕێیەتیانەی کە لە ڕێگەی تۆڕەکانەوە دروستبوون لە ژیانی کردارەکیدا ڕەنگیان نەداوەتەوە و نەبوونەتە پەیوەندییەکی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتی مەگەر زۆر بەدەگمەن. هەر بەپێی توێژینەوەکان تەنانەت ئەو پەیوەندییە کۆمەڵایەتیانەی لەڕێی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە دروستبوون، پەیوەندییەکی ساردوسڕن و زۆر جیاوازن لە پەیوەندییەکی ڕاستەقینە و کەمتر هەست و سۆزیان تێدا بەدی دەکرێت. بۆ نمونە ئەو هەست و سۆزەی کە لە ئاڵوگۆڕکردنی بیروڕا لەکاتی پیاسەکردنێکدا لە نێوان دوو کەسدا دروست دەبێت زۆر بە کەمی لە نێوان دوو کەسی هاوبۆچووندا دروست دەبێت لەناو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا، کاتێک بۆچوونی یەکتر شەیر دەکەن. جگەلەوەش تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە ڕوویەکی دیکەشەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانیان ساردوسڕ کردووە. بۆ نمونە بەهۆی خووگرتنی بەکارهێنەران بە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە زۆربەی کاتەکان ئەندامانی خێزانێک لەبری ئەوەی کاتەکانی خۆیان بە قسەکردن بەسەر ببەن و کات بۆ یەکتر تەرخان بکەن، کەچی زۆربەی کاتەکانیان بە مۆبایلەکانیان و بە سەیرکردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە تەرخان دەکەن. ئەمەش وایکردووە تەنانەت پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نێوان ئەندامانی خێزانێک یان پەیوەندیی کۆمەڵایەتیی نێوان هاوڕێ نزیکەکان بەراورد بە سەردەمی پێش ئینتەرنێت ساردوسڕتر بێت.

## سەرچاوەکان

**أولا: الدساتير:**

الدستور العراقي الدائم لعام ٢٠٠٥.

**ثانيا: المعاجم والقواميس:**

Oxford Dictionaries (2018) Definition of impact in English. Retrieved from: https://en.oxforddictionaries.com/definition/impact

Danedsi, Marcel (2009). Dictionary of media and Communication. Definition of Facebook. Retrieved from:
https://www.academia.edu/19522228/Dictionary_of_Media_and_Communication

**ثالثا: البحوث والدراسات:**

الحسين، أسعد بن ناصر بن سعيد، أثر وسائل التواصل الاجتماعي على سلوكيات وقيم الشباب من منظور التربية الإسلامية، مجلة كلية التربية – جامعة الأزهر. مج. ٣٥، ع. ١٦٩، ج. ٣، يوليو ٢٠١٦، ص ٣٢٥_٣٥٩.

رضا أمين (٢٠١٥) الإعلام الجديد، دار الفجر، القاهرة.

سعودي، عبدالكريم. (٢٠١٤). إدمان الفيس بوك وعلاقته بالتوافق الأسري للطالب الجامعي. مجلة دراسات نفسية وتربوية، عدد ١٣.

سيد وحيد عقيلى و احسان پورى، تاثير شبكه‌هاى اجتماعى مجازى بر ارتباطات بين فردى كاربران، ٢٠١١، تهران، مركز اطلاعات علمى جهاد دانشگاهى.

العقبي، بركات. (٢٠١٦). نمط العلاقات الاجتماعية في ظل إستخدام مواقع التواصل الاجتماعى –بين الحقيقي والافتراضي-. مجلة علوم الإنسان والمجتمع، عدد ١٩.

عمارة، نائلة إبراهيم (٢٠٠٥)، دور وسائل الإعلام في تشكيل معارف واتجاهات الجمهور المصري نحو الانتخابات الرئاسية في مصر ديسمبر ٢٠٠٥، في أعمال المؤتمر العلمي السنوي الثاني عشر بكلية الإعلام، (القاهرة: كلية الإعلام، جامعة القاهرة الجزء الأول ٢-٤ مايو ٢٠٠٦)، ص ص ٢٥٧ - ٣٠٤.

فارس، كاتب. (٢٠١٦). أثر استخدام مواقع التواصل الإجتماعي على سلوك الشباب الجزائري/ دراسة وصفية مسحية على عينة من شباب –أم البواقي-، رسالة ماجستير غير منشورة. جامعة العربى بن مهدي، كلية العلوم الإنسانية والإجتماعية.

المشهداني، سعد سلمان و الحمداني، فراس (٢٠٢٠) مواقع التواصل الاجتماعي وخصائص البيئيه الإعلاميه الجديدة، دار الأمجد_ الأردن.

المطيري، سلطان خلف (٢٠١٥)، شبكات التواصل الاجتماعي وعلاقتها بتحقيق الأمن المجتمعي، رسالة ماجستير غير منشورة، كلية العلوم السياسية والإعلام، جامعة نايف.

المقدادي (٢٠١٣)، خالد غسان يوسف، ثورة الشبكات الاجتماعية، دار النفائس عمان.

منال محمد بن حمد الناصر، تأثير وسائل التواصل الاجتماعي على العلاقات الاجتماعية والأسرية لدى طلبة الجامعة السعودية الالكترونية بالرياض، مجلة البحث العلمي في التربية، العدد ٢٠، ٢٠١٩.

وسام كمال (٢٠١٤)، الإعلام الألكتروني والمحمول بين المهنية والتطور، دار الفجر، القاهرة.

Bargh, J. A., & McKenna, K. Y. (2004). The Internet and social life. Annual Review of Psychology. 55, 573-590. Doi:
10.1146/annurev.psych.55.090902.141922

Cummings, J.N., Butler, B. and Kraut, R. (2002). The quality of online social relationships. Communications of the ACM, 45(7), 103-108. Doi: 0.1145/514236.514242

Mesch, Gustavo S. (2006). “Family Relations and the Internet: Exploring a Family Boundaries Approach.” The Journal of Family communication. 6 (2), 119-138. Doi: 10.1207/s15327698jfc0602_2

Tyler, T.R (2002) is the Internet changing social life? It seems the more things change, the more they stay the same. Journal of Social Issues, 58 (1), 195-205. doi: 10.1111/1540-4560.00256

**رابعا: الكتب:**

قتلونى، مصعب حسام الدين. (٢٠١٤). ثورات الفيسبوك.. مستقبل وسائل التواصل الاجتماعي في التغيير. بيروت، لبنان: شركة المطبوعات للتوزيع والنشر.

McLuhan, M., & Powers, B. (1989). The Global Village: Transformations in World Life and Media in the 21st Century. Oxford: Oxford University Press.

خامسا: المواقع الألكترونية:

Galasso Bonanno, S (2015) Social Media’s Impact on Relationships. Psych Central. Retrieved from http://psychcentral.com/lib/social-medias-impact-onrelationships/

Jeffrey Boase and Barry Wellman (2004) Personal Relationships: On and Off the Internet. Retrieved from:
https://www.researchgate.net/profile/Jeffrey_Boase/publication/2932622_Personal_Relationships_On_and_Off_the_Internet/links/0c960537a6967723a7000000.pdf 10.24086/cuejhss.v3n2y2019.pp.8-19 (17.06.2020).

Robert H. Gault (2016). Psychology in Social Relations, American Journal of Sociology. 22 (6), 734-748. Retrieved from:
https://www.journals.uchicago.edu/doi/10.1086/212692?mobileUi=0 (03.12.2019).

Shklovski, I., Kiesler, S. and Kraut, R (2006) The Internet and social interaction. Computers, phones, and the Internet, pp.251-264. Retrieved from:
https://psycnet.apa.org/record/2007-08867-017 (28.03.2020).

المواقع: الاتحاد (٢٠٢٠/١/٣١)، ٢,٥ مليار عدد مستخدمي «فيسبوك». https://www.alittihad.ae/article/٦٠٤٧/٢٠٢٠/٢٥-

تۆڕبین (٢٠٢١)، یەکەم توێژینەوەی زانستی لەبارەی فەیک نیوز لە کوردستان: حیزبەکان، میدیای سیبەر و سۆشیاڵ میدیا، https://torbend.net/21/01/2021/7702525/?fbclid=IwAR20iaWBvxMIkdgoC978xF4CMNogq6fnU073XoKJe9uTj-WlSyzXDF5OTE

محمد علی سلطانی فر و شیرزاد بخشی و سعید فرامرزیانی، بررسی تاثیرات شبکه‌های اجتماعی فیس بوک و تویتر بر گرایش اعضا به این شبکه‌ها، ٢٠١٤، تهران، فصلنامه پژوهش های ارتباطی
http://cr.iribresearch.ir/article_23569.html

وبیما، ٢٠١٦، توییتر و تاثیر آن بر جهان معاصر
https://webima.co/blog-post/%D8%AA%D9%88%DB%8C%DB%8C%D8%AA%D8



دڵشاد کاوانی
نووسەر و ڕەخنەگر.

# سۆشیال میدیا ڕۆڵ و پێگە و کاریگەرییەکانی، لەسەر ڕەوتی ژیانکرن لە کۆمەڵگەی هاوچەرخدا

پێشەکی:.

سۆشیال میدیا ئەو فاکتە گشتییەیە کە لە ئاکامی هاتنەکایەی جیهانێکی بەرفراوانی بەیەکەوە گرێدراوی تۆڕەکانی کۆمەڵایەتییە، کە لە ئەنجامی پێشکەوتنی سیستەمی تەکنەلۆژیای ئینتەرنێت و زێدەتربوونی خواست و ویستی تاکەکان بۆ ڕزگاربوون لە چەقبەستوویی میدیای فەرمی و ئاڕاستەکار هاتە ئاراوە. پاش ئەوەی میدیای کلاسیک، تاکەکانی بەرەو بێزاریی و ونبوونی دید و شوناسی تاکەکەسی و توانەوەی بۆچوونی تاک، لە ڕوانینی دەستەجەمعی جڵەوکراو و بەلاڕێدابردنی مەعریفەی زاتی، لەهەمبەر لەدەستدانی شوناسی ڕاستەقینەی میدیا برد. بۆئەوەی تاکەکان لە فەزاییەکی فروان و ڕەهادا، ئاسنتر و ئازادانە بڕوانن و ڕاستەوخۆ و بێ بوونی هیچ فلتەرێک و بەربەستێک ئاوێتەی جیهانی زانیارییەکان و گەیشتن بە دەرەوەی خۆیان بن، پەنا بۆ سۆشیال میدیا دەبەن، ئەمەش کاردانەوەی میدیای تاکەکەسی دروست دەکات.

**پێناسە:.**

سۆشیال میدیا لە ڕووی زاراوەییەوە لە (Social Media) هاتووە، واتا میدیای کۆمەڵاییەتی، یان میدیای خەڵک. کە ڕاستەخۆ، بەکاربەر یان فان دەتوانێ مامەڵە لەگەڵ هەر پێشهات و پێوستییەکانی پەخش و بڵاوکردنەوە لە چوارچێوەی سیستەم و یاسا و ڕێنماییەکانی هەر ئەپێکدا بکات، کە تێیدا وەک هەر تاکێکی دیکەی بەکاربەر مافی خاوەندارییەتی بەکارهێن بە یەکسانی و ئاسانترین شێوە وەردەگرێت.

**سەرەتا:.**

گەر بمانەوێت بە وردی لەسەرئەوە بووەستین ئایە بە دیاریکراوی سۆشیال میدیا وەک پێوستییەکی حەتمی هاتووەتە بەرهەم و خۆی خزاندووەتە نێو فەرهەنگی ژیان، یان لە ئەنجامی گەشەسەندن و پێشخستن و داهێنانی زانستی بووە، بە بەشێک لە ژیانی کۆمەڵایەتی مرۆڤ. ئەمەش دەمانخاتە بەردەم پرسیێکی تر کە سۆشیال میدیا جیهانێکی گریمانەییە یان بەرنامە بۆ داڕێژراوە. دەرکەوتنی سۆشیال میدیا بەرهەمی میدیا خۆیەتی یان ئەوەتە پاشەکشەی میدیای باوە! بۆ هاتنەکایەی سۆشیال میدیا حەقیقەتێک هەیە، ئەویش لەگەڵ هەر جۆرە پێشکەوتنێکی تەکنەلۆژیای ئامێری زیرەک، میدیا و ڕوانینەکانی گۆڕانکاری بەخۆوە دەبینێت، جۆری بەکاربردن و مامەڵەی خەڵکیش لەگەڵ میدیا گۆڕانکاری بەسەردا دێت، شتێک هەیە لە بواری میدیادا، کە هەمیشە قسەی لەسەر دەکەین، ئەویش حەتمەییەتی تەکنەلۆژییە، زۆرجار تەکنەلۆژیا کە سەرهەڵدەدات بەتایبەت لە بواری میدیا لەگەڵ خۆیدا کۆمەڵێک گۆڕانکاریش دەهێنێتە ئاراوە، ئەویش ڕەنگدانەوەی بووە لەسەر ژیانی ئێمە لە سێ بواری سەرەکیدا، ئەوەی سۆشیال میدیا ئێستا هێناویەتییە ئاراوە دەتوانین بڵێین دنیایەکی گریمانەییە، یەکەمیان بەجەمسەربوونی تاکە، ئەم سۆشیال کۆمەینیکەیشنە تاک دەکات بە جەمسەر بەو مانایەی مامەڵەی لەگەڵ تاک دایە، ڕاستە مامەڵەیەکی ڕاستەوخۆی لەگەڵ تاکدا کردووە، بەڵام ئەگەر دیقەت بدەیت، ئەگەر مامەڵەی خەڵک مامەڵەیەکی دەستە جەمعی بێت لە تەماشاکردندا یان ڕادیۆ بەهەمان شێوە گوێگرتنێکی دەستەجەمعی بێت، ئەگەر دەستاودەستکردنی ڕۆژنامەیەکیش مامەڵەیەکی دەستەجەمعی بێت، بەڵام مامەڵەی ئێمە لەگەڵ سۆشیال میدیا مامەڵەیەکی تاکە، واتە تاک دەبێت بە جەمسەر.

دۆخێکی تر کە دروستی دەکات، کۆمەڵێک شتی تر لە تاک دەسەنێتەوە، گرنگترین شت زەوتکردنی تایبەتمەندی تاکە، ئەم تەکنەلۆژیایە بەتایبەتی لە سەردەمی سۆشیال میدیادا، تاک بەخۆی نازانێت تادێت تایبەتمەندی خۆدی لەدەست دەدات. حاڵەتێکی تریش نامۆبوونی تاکە، چونکە ئەو لە دۆخێکدا دەژی کە گریمانەییە، دۆخێکی واقیعی نییە و مامەڵەکردنەکەش گریمانەییە، پەیوەندییەکان گریمانەییە، تادێت ئەو دۆخە گریمانەییە زیاتر خۆی بەرجەستە دەکات(١).

بەواتایەکی دی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، ئەو پەیوەندییە خێرایەیە کە بەکەمترین کات و کورترین ڕێگە، بە شکاندنی سەرجەم سنوورەکان بە خەڵکەوە دەمانبەستێتەوە. لەکاتێکدا ئەمڕۆی سەردەمی خێراییە و بۆ بەڕێکردنی ژیانی ئاسایی تاکەکان، کاتی ئەوەمان نییە تەنانەت پەیوەندییە ئاساییەکانمان لە دەرەوەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان ببەستین، بۆیە هانا و پەنا بۆ ئەم شێوازە لە پەیوەندیکردن دەبەین و بەزۆر شێوازی جۆراوجۆر بەکاری دەهێنین. کەسەکان بەبێ بوونی هیچ سنورێک لە تەواوی دونیا پێکەوە دەبەستێتەوە و دەکرێت بە ڕەهایی و بێ سنوریش کاری لەگەڵدا بکەیت، گەر بەکۆمەڵی و پێکەوە بوونبێت، یان بۆ ڕاپەڕاندنی کاروباری کۆمەڵایەتی و خێزانی بێت، یان چالاکیی و ڕۆشنبیریی و سیاسیی و ئابووریی و ئایینی و هەر بوارێکی دیکە بێت، لە هەموو کاتەکاندا بەکارهێنەری ئەو تۆڕەکۆمەڵایەتییانەین. لە یەکتر ناسین و گۆڕینەوەی بیروڕا و وەرگرتنی زانیاری خۆیی دەبینێتەوە.

**جۆر و پۆلێنەکانی سۆشیال میدیا:**

لە سادەترین پێناسەدا، سۆشیال میدیا ئەو جۆرە لە میدیایە کە چیتر خودی خۆی بە تەنها قسە ناکات، جیاواز لە میدیا باوەکان وەک ڕادیۆ و تەلەڤزیۆن و میدیای چاپکراو ڕێگە بە خەڵک دەدات ببن بە بەشێک لە بەهای ناوەڕۆکی ئەو زانیارییەی، کە سۆشیال میدیا بڵاویدەکاتەوە. لە سۆشیاڵ میدیادا هەم دەزگا فەرمییەکان و هەم خەڵکیش دەتوانن ئازادتر بدوێن و بە ستایلی جیاواز بنووسن و بڵاوبکەنەوە.

چەند جۆرێک لە سۆشیال میدیامان هەیە. وەکوو وترا ئەم میدیایە جیاوازی گەورەی بەشداریکردن و پەیوەندیکردنە، کە دەکرێت جۆری تێکەڵبوونی لەگەڵ خەڵکیدا بەم جۆرە پۆلێن بکرێت:

**سۆشیال بوکمارکین:** ئەم جۆرە لە سۆشیال میدیا ڕێگە بە بەشداربووەکانی دەدات ئەو ماڵپەرانەی کە دەیانەوێت نیشان (تاگ) بکات لەسەر بنەمای نیشانەکردنی بەشداربووەکانی تر.

**سۆشیال نیوز:** ئەم چەشنە لە سۆشیال میدیا ڕێگە بە بەشداربووەکانی دەدات دەنگ بدەن، یان کۆمێنت بنووسن لەسەر ئەو بابەت و هەواڵانەی ئەو ماڵپەرانە بڵاوی دەکەنەوە، کە بە ماڵپەری سۆشیال نیوز ناودەبرێن.

**سۆشیال فۆتۆ و ڤیدیۆ**: ئەم شێوازە لە سۆشیال میدیا ڕێگە بە بەشداربووەکانی دەدات بتوانن فۆتۆ و ڤیدیۆ ئەپلۆد بکەنە سەر ماڵپەرەکەیان، هەروەها ڕێگە بە بەشداربووەکانیشی دەدات کۆمێنت بنووسن لەسەر فۆتۆ و گرتە ڤیدیۆییەکان.

**ویکیس:** ئەم سۆشیال میدیایانە ڕێگە بە شداربووەکانی دەدات بەرهەمی نووسراو زیاد بکەن بۆ ماڵپەرەکەیان، هەروەها ڕێگە بە بەشداربووان دەدات، نووسینی زیاتر یان بەرهەمە نووسراوەکان کە ئەپلۆد کراون، کەم بکەنەوە.

سۆشیال نێتۆرکین:. تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، ڕەنگە ئەم جۆرە لە سۆشیال میدیا باوترین جۆری بێت لەناو کۆمەڵگەی ئێمەدا، ئەوەی ئەم جۆرەش لە سۆشیال میدیاکانی تر جیادەکاتەوە ئەوەیە، کە ڕێگە بە بەشداربووەکانی دەدات بتوانن لەنێو خودی خۆیاندا پەیوەندی بگرن و ببنە هاوڕێی یەکتری، ئەمەش بۆتە هۆکاری ئەوەی زۆرترین خەڵک بەتایبەتی لەم ناوچەیە لە دەوری خۆیان کۆبکەنەوە(٢).

هەرچەندە تائێستا داتایەک و ئامارێکی ورد لەبارەی بەکارهێنەرانی کورد لەبەردەستدا نییە، وەلێ بەپێی ئامارە نافەرمییەکان و درککردن بەو ڕاستییە باوترین جۆری تۆڕی کۆمەڵایەتیش لە وڵاتانی سێ و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و عێراق و کوردستان بەتایبەتی فەیسبووک و ئینستگرام و تیکتۆک و سناپ چاتەکان، کە زۆرتر بابەتی سەرگەرمی و خۆدەرخست و پەیوەندی و گفتوگۆکردنن کە خۆیان لە هەردوو پۆلێنی سۆشیال فۆتۆ و ڤیدیۆ و سۆشیال نێتۆرکین دەبینێتەوە.

### سۆشیال میدیا و لێکەوتە و کاریگەرییەکانی:.

هەڵبەتە ڕۆڵ و کاریگەریی و لێکەوتەکانی سۆشیال میدیا بەدەرنییە لە سەرهەڵدانی هەر داهێنانێکی تری زانستی، کاتێک ڕوو لە مرۆڤایەتی دەکات و دوو ڕووی جیا نیشان دەدات. یان وردتر بڵێین سۆشیال میدیا دارێکی دوو دەمە، لایەنی ئەرێنی و نەرێنی هەیە و کاریگەری خۆی بەسەر کۆمەڵگەوە دەسەپێنێت، ئەویش دەکەوێتە سەر چۆنییەتی بەکارهێنەر و پێشکەشکردنی سرویسەکانی، گەر هاتوو شێوازێکی ئەرێنی پیشان دا، تاک لێی سوودبەخش دەبێت و کۆمەڵگە بەرەو ئاقارێکی باش ئاڕاستە دەکات، پێچەوانەکەشی تاک زەررمەند دەبێت و تووشی دەیان و ئاریشەی دەروونی و تەندروستی و پەروەردەیی و دەبێت و خێزان و کۆمەڵگەش لەبەریەک هەڵدەوشێنێتەوە. بۆیە ڕۆڵ و کاریگەریی و لێکەوتەکانی سۆشیال میدیا بەسەر دوو لایەن دەبەش دەکەین:

### ـ سوودەکانی سۆشیال میدیا:.

سۆشیال میدیا بە یەکێک لە گرنگترین تەکنەلۆژیاکان دادەنرێت کە بەکاردەهێندرێت بۆ بەشداریکردنی بیرۆکە و زانیارییەکان لەسەر کۆمەڵگە گریمانەییەکانی نێو تۆڕی ئینتەرنێت، بەجۆرێک بەردەستبوونی ئەو ناوەڕۆکانە ئاسان دەکات کە زانیاریی تایبەتی و ڤیدیۆ و وێنەیان تێدایە، هەروەها نامە ناردنی نێوان تاکەکان ئاسان دەکات، بەتایبەتی کە سۆشیال میدیا زۆر بڵاوبۆتەوە.

١. بەئاسنترین و کورترین ڕێگە دەگەیتە زۆرترین هەواڵ و زانیاریی و داخوازییەکانت.
٣. فێربوونی زمان و ئاشنابوون بە کلتوور و دابونەریتە جیاوازەکان.
٤. بە ئاسانترین شێوە دەستگەیشتن بە هەلی کار و خوێندن و گەشتکردن.
٥. بەکارهێنانی سۆشیال میدیا بۆ لۆبی کردن و یەکدەنگی و هێنانەدی داخوازییە جەماوەرییەکان.

٦. ئاسانکاری بۆ دروستکردن و ئاگاداربوون لە دەستە و کۆمەڵەی مەدەنی ڕێکخراوەیی و پیشەیی و گرووپی فشار.

٧. گرنگی سۆشیال میدیا بۆ بە بازاڕکردن، زۆرترین کڕیاری نوێ دەهێنێت بۆ ئەو کارە بازرگانییانەی لەسەر بازاڕگەری وەستاون بۆ ساغکردنەوەی بەرهەم، خزمەتگوزارییەکانیان و بەردەوامبوون لەگەڵ کڕیارەکانیان لە ڕێگەی سۆشیال میدیاوە.

زیان و مەترسییەکانی سۆشیال میدیا:

بەپێی ڕاپۆرتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی، بەکاربەرانی سۆشیال میدیا بەوە وەسف دەکرێن کە دۆخێکی دروستە تاک تێیدا توانا تایبەتییەکانی خۆی ببینێتەوە. لێ لەم ڕێگەیەوە سۆشیال میدیا ڕۆژانە بەسەر تاکەکاندا زاڵ دەبێت، بە جۆرێک کە لە وزەی جەستەیی و دەروونیدا بەرهەمدار نابێت و هاوبەش لەگەڵ دەوروبەر لەدەست دەدات. لە دنیادا چەندین لێکۆڵینەوە و توێژینەوەی جۆراوجۆر کراوە لەسەر پەیوەندیی و کاریگەری سۆشیال میدیا لەسەر تەندروستی مرۆڤ بەگشتی و تەندروستی دەروونی بەتایبەتی.

**نمونەیەک لە دوو توێژینەوە لەوبارەیەوە دەخەمەڕوو:**

میشێل فانسۆن (Michel. ٢٠١٠) لە توێژینەوەیەکدا کە لەسەر (١٦٠٠) خوێندکاری زانکۆ کردوییەتی، دەریخستووە ئەو کەسانەی سۆشیال میدیا بەکاردەهێنن زۆرترین کاتەکانیان لەسەر تۆڕی ئینتەرنێتە و کەمتر تێکەڵ بە هاوڕێ و خێزانەکانیان دەبن، ئەمەش هەستی تەنهایی بۆ دروستکردون و متمانەبوونیان بەخۆیان کەم بۆتەوە. یان ( کالبیدۆ، کۆستین، مۆری) (kalpidou . costin . Morris) لە توێژینەوەیەکدا لە زانکۆکانی باکووری ئەمریکا، سەبارەت بە کاریگەری فەیسبوک لەسەر خودناسی و گونجانی دەروونی و کۆمەڵایەتی، گەیشتە ئەو دەرەنجامەی کە: خوێندکارانی قۆناغە سەرەتاییەکانی زانکۆ کاتی زیاتر لەسەر فەیسبووک بەسەر دەبەن.

بۆیە ئێمەش زیانەکانی لەسەر کۆمەڵگەی کوردی بەکورتی بە چەند خاڵێک دەخەینەڕوو:

١- تێکشکاندنی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان. بۆ کۆمەڵگەیەکی فرە کلتوور و فرە بیروڕا و ئایینی ئەمە واتە کوشتنی ڕۆحی دۆستایەتی و خۆشەویستی و هاوڕێیەتی و بێ ئاگاییمان لە دەوروبەر، لە قسەکردن و بیروڕا گۆڕینەوە، لە بێ ئاگاییمان لە ساتەوەختی ڕووداوی خۆشی و ناخۆشییەکان، کوشتنی چێژ و جوانی، هەست نەکردن و گوێ نەدان بە قسەکردن و دانیشتن لەگەڵ خێزان، کەچی ئەوان بەها و جوانی و ئاسوودەیی دەبەخشن بە ڕۆحمان. سۆشیال میدیا کارێکی کردووە دەنگ و شێوەی ئازیزانمان بیربچێتەوە، هەموو کەسێک لە فۆڕمی ئیمۆجی و دڵسۆزییان لە شەیر و لایک و کۆمێنتدا دەبینین.

٢- دواخستنی بەرەوپێشچوونی پرۆسەی خوێندن. هەموو ئەو منداڵ و مێردمنداڵانەی مۆبایل و ئینتەرنێت بەکاردەهێنن درەنگتر پەیوەندییان بۆ دروست دەبێت لەگەڵ کاغەز

و کتێب و نووسیندا، چونکە بەجۆرێک لە جۆرەکان ئەوان لە پرۆسەی نووسین بەقەڵەم دابڕاون، تەنها وابەستەی وێنەی ڕەنگاوڕەنگ و تۆنی دەنگن لە ڕێگەی مۆبایل و ئایپاد و لاپتۆپەوە. یارییە ئەلیکترۆنییەکانیشن بەشێکن لە پرۆسەی شکستپێهێنانی خوێندن کە ئەمە کاریگەری نەرێنی دروست دەکات، چونکە ئاڵوودەبوون بە یارییە ئەلیکترۆنییەکان بەپێی چەندین توێژینەوەی زانستی (منداڵ و گەورەکان) بێ جیاوازی تووشی خەمۆکی دەکات، جگەلەمەش زیانە جەستەییەکانی وەک (قەڵەویی و بڕبڕەی مل و پشت و نەخۆشییەکانی چاو..تاد) تووشی بەکارهێنەرەکان دەبێت.

٣-دروست کردنی مۆدێل و فاشیۆن، مۆدێل و ئەکتەری ڕیکلام و چەندین کارەکتەری نامۆ بە کۆمەڵگە. لەڕاستیدا دەکرێت ئەمانە گرفت نەبن یان شتێکی ئاسایی و ڕۆتینی ژیان بێت، بەڵام کەی و لە کوێ و چۆن؟ بۆ دنیای دەرەوە کە ئەخلاقی بەکارهێنان و یاسا و سیستەم جێبەجێ دەکرێت. واتە کاتێک ئامێرەکە دەگاتە دەست بەکارهێن ئەخلاق و پرەنسیپی بەکارهێنانیشی لەگەڵدایە و یاساش چاودێری دەکات و کۆمەڵگەیەکی هۆشیار و چاوکراوەیە نەک چاولێکەر. بەڵام هەموو ئەمانە بۆ کۆمەڵگەی کوردی جۆرێکن لە پاکێجی مۆدێل بەبێ تێپەڕین بە خاڵی سەرەتا، چونکە نە هێندە هۆشیارین و نە یاساش سێبەر و چاودێرمانە، ئەم جۆرە دروستکردنە، نەوەیەک بەرهەم دەهێنی کۆنترۆڵ نەکراو هەموو بڕیارەکانی وابەستەی غەریزەکانییەتی و عەقڵ و لۆجیک هیچ بەهایەکیان نییە.

لێکەوتەی ئەم حاڵەتانە (چاولێکەریی و لاسایکردنەوەیە) کە زۆرینەی خێزانەکان ڕێگا بەو جۆرە لە خۆدەرخستن و خۆڕووتکردنەوەیە نادەن، لە دەرەنجامدا بەریەکەوتن ڕوودەدات و کێشەکان گەورەدەبن و لە کۆنترۆڵ دەردەچن. ڕۆژانە دەبینین و دەبیستین کاری (خۆسوتاندن و خۆکوشتن یان دەکوژێن) هەڕەشەی بڵاوکردنەوەی وێنە و ڤیدیۆ بەرامبەر بڕێک پارە یان ئەنجامدانی کاری سێکسی و چۆن سوکایەتی بە شکۆ و بەهای مرۆڤ دەکرێت، کاتێک بە کۆمێنت و پۆستی نەشیاو و گاڵتەکردن بە کەم عەقڵ و خاوەن پێداویستی تایبەت و ڕۆشنبیر و سیاسی و پیرۆزییەکان و چەندانی دیکە دەبینین. چەندان خاڵی دیکەی لاوەکی هەن و پێویستیان بە پسپۆڕی دەروونی و توێژەری کۆمەڵایەتی و کەسانی شارەزا هەیە تا قسەی لەسەر بکەن.

٤- ئەنجامدانی کاری توندوتیژی و قۆرغکردنی ڕای گشتی و مانەوەیان لەژێر هەژموونی دەسەڵاتدارانی ستەمکار یان پێچەوانەکەی قۆستنەوەی بەرهەڵستکاران و ناڕازییە سیاسییەکان هاندانی گەنج و لاوانە بۆ کاری توندوتیژیی و خوێنڕشتن.

٥- زۆربوونی نەخۆشییە تەندرووستییەکان و دەروونییەکان بەهۆی ئاڵوودەبوون و تێکدان و شێوانی باری دەروونی بەکاربەران لەکاتی بینینی دیمەنەکانی کوشتن و برین و توندوتیژییەکان.

٦- پاشەکشەکردن بە مەعریفە و خوێندنەوەی کتێب و ئاستی ڕۆشنبیری تاک بەهۆی سەرقاڵی زۆرتر بە ئامێرە زیرەکەکان.

## چارەسەر:

دیارە هەرکاتێک پێشهات و گریمانەیەک ڕوو لە کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی دەکات، سەرەتا لە حاڵەتەوە دواتر بۆ دیاردە هەڵدەکشێت و بۆ زانستیش هەمان پێوەرە، بەهۆی بەرفراوانبوونی بەکارهێنەران و زۆری خواستی بەکاربەر کۆنترۆڵکردن و کێوماڵکردن و دەستبەسەراگرتنی بەکاربەران چۆنییەتی بەکارهێنان و مامەڵەی تەندرووست لەڕووی لێپرسینەوە و بەیاسایکردنی ئاسان نییە، وەلێ وەک چارەسەر ئەم چەند خاڵە دەخەمەڕوو.

١. دەرکردنی یاسا و ڕێنماییەکانی تایبەت بە سۆشیال میدیا.
٢. کردنەوەی خول و سیمینار و وۆرکشۆپ بۆ وشیاری مامەڵکردن لەگەڵ سۆشیال میدیا.
٣. بڵاوکردنەوەی هۆشیاری یاسایی لەسەر یاسای بەکارهێنان و مافی بەکاربەر.
٤. جێکردنەوەی لە وانەیەکی تایبەت یان بوونی بەشێک لەوانەی پەروەردە و فێکردن لە سیستەمی خوێندنی قوتابخانەکان.
٥، دروستکردنی بۆردێکی هاوبەش لە وەزارەتی ناوخۆ و ڕۆشنبیریی و کاروباری کۆمەڵایەتی بۆ چاودێریی و پێداچوونەوە و چارەسەر بۆ دەرهاویشتە و کێشە کۆمەڵایەتی و سیاسیی و ڕۆشنبیرییەکانی کۆمەڵگە.
٦، پێداچوونەوە بە سیستمی پەروەردە و خوێندن.
٧. چاودێریکردن لە ڕێگەی خێزانەکانەوە و لێپرسینەوە لەگەڵ ڕۆڵەکانیان بەشێوەیەکی دروست.
٨. سەروەری یاسا و لێپێچینەوەی تەواو لەگەڵ بەکارهێنەران لەکاتی هەر هەڵەیەک کە دەکرێت.
٩. ڕێکخستنی سیمینار و بەرنامەی دیالۆگی کراوە لە ڕێگەی دایەنگە و خوێندنگە و زانکۆکانەوە، پێدانی بەرنامەی هۆشیاری لەسەر بنەمای لۆجیک.
١٠- هاوکاریکردنی ڕێکخراوەکانی کۆمەڵی مەدەنی بە هاونیشتیمانیان و حکومەت و لایەنی پەیوەندیدار بە باسەکەوە.

## ئەنجام

لە کۆتایی باسەکەماندا گەیشتینە ئەو دەرنجامەی، کە هاتنی سۆشیال میدیا وەک پێشکەوتنی زانستی تەکنەلۆژی چەندین دەرهاویشتە و لێکەوتەی بەدوای خۆیدا هێناوە. ئەم کاریگەرییەی سۆشیال میدیا بەهەردوو ڕووی ئەرێنی و نەرێنی بۆتە زەرووڕەتێکی حەتمی بەهۆی بەرفراوانبوونییەوە و لەئێستادا جڵەوکردنی زەحمەتە. ئەمەش دەگەڕێتەوە سەر چۆنییەتی شێوازی بەکاربەر بەکام چەشن بەکاردێنێت. لە کوردستان و ڕۆژهەڵاتی ناوین زۆرتر لایەنە نەرێنییەکەی باڵی بەسەر کۆمەڵگەکاندا کێشاوە و چەندین گرفت و ئاڵنگاری لێکەوتۆتەوە و زۆرجاریش تاک و خێزان باجی هەڵەکانی سۆشیال میدیایان داوە و هەندێک جاریش دەبێتە مایەی خرۆشانی جەماوەریی و بێ ڕێزی کردن بە بەهاکان و ئایین و باوەڕ و پیرۆزییەکان، قوربانی بە کۆمەڵی لێ کەوتووەتەوە. کەواتە سۆشیال میدیا چەکێکە هەموو تاکێک دەتوانێت چۆنی بوێت ئاوا بەکاریبهێنێت.

## پەراوێزەکان

١. AM ١١:٣٣ - ٢٨-٠١-٢٠١٥ دیمانە: د. نەزاکەت حسێن مامۆستا لە بەشی ڕاگەیاندنی زانکۆی سلێمانی، کوردستانی نوێ.

٢. سەرچاوە: هاوڵات، ٢٠١٥/٣/٣.

## سەرچاوەکان


کوردی:

- هەردی ئیسماعیل - لایەنە خراپەکانی بەکارهێنانی ئینتەرنێت و تۆرە کۆمەڵایەتییەکان ، ڕوانگە و ڕەخنە ، ٢٠١٩/١٢/٢٠.

- بیزا برزۆ - چۆن دەتوانرێت سۆشیال میدیا کاریگەری ئەرێنی لەسەر تاکی کورد هەبێت ، سایتی سبەی، ٢٠١٩/٨/١٨.

- تانیا ئاوارە - ئامارەکان ژمارەی مەترسیدار لەبارەی کاریگەری نەرێنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەدرکێنن، کوردستانی نوێ، ژمارە ٧٤٩٤ ، ٢٠١٨/٢/١٦.

فارسی:

-رسناهای اجتماعی سیت های اجتماعی مانند فیسبوک و تئوتر. محمد علی پورز، تهران، ٢٠١٩.

-سوشال مدیا (Social Media) یا رسانه اجتماعی چیست؟ بیلالفیت. هانیه زاهدی.

-چگونه استراتژی سوشال مدیا بنویسیم. اتوسا اهنک. نوامبر ١٣، ٢٠٢١ نوین هاپ.

-بررسی انواع مختلف سوشال مدیاو چگونگی کارکرد آنهامدیر سایت اياتالله کاشانی ٢٢ فروردین ١٣٩٩.

عەرەبی:

- الشبكات الاجتماعية والقيم رؤية تحليلية. تأليف: جبريل بن حسن العريشي الناشر: الدار المنهجية للنشر والتوزيع الطبعة الأولى تاريخ النشر: ٢٠١٥.

- ثورة الشبكات الإجتماعية؛ ماهية مواقع التواصل الإجتماعي وأبعادها تأليف: خالد غسان المقدادي تاريخ النشر: ٢٠١٣ الناشر: دار النفائس للنشر والتوزيع، الطبعة الاولى.

- ثورة العشرين دراسة في الأحزاب السياسية والشبكات الاجتماعية في العراق ١٩٠٨ – ١٩٢٠ كيكو سكاى دار الرافدين للطباعة والنشر والتوزيع. اكتوبر ٢٠٢٠.

- المشاكل الاجتماعية والسلوك الانحرافي. دكتور محمد عاطف غيث. استاذ علوم الاجتماع. جامعة الاسكندرية. ١٩٨٩.

ئینگلیزی:

and the Well-Being of Undergraduate College Students, Cyberpsychology, 189 -183 .pp .(4)14 ,Behavior and Social Networking

Facebook and the invasion of technological communities .(2010)Mecheel,Vansoon , N.Y,Newyurk, from.www.pewinternet.org/pdfs.pip_Teens_Privcy_SNS_Repo rt_ .final_ pdf



هەژار حاتەم

# تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان چەقۆیەکی دووسەر!

## (لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان)

پێشەکی:.

شاراوە نییە کە بەدەرکەوتن و لەداکیبوونی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان واقیعێکی مەجازیی نوێ وکاریگەر دروستبووە، کە پێشتر نەمانبینیووە و پێشبینیشمان نەکردبوو، کە ڕۆژێك دنیا وای لێبێت، کە لە ڕێگەی تەکنەلۆژیایەکی پێشکەوتوو (مۆبایل، ئاپیاد....)وە سنوورە جوگرافییە تەقلیدییەکان تێپەڕێنێت و کۆنترۆڵی کۆبوونەوە خێزانییەکان و پەیوەندییە خوێنییەکان بکات و ببێتە شوێنی بازرگانی و پێشبڕکێ، لەهەمانکاتدا مودمینبوون لە سەریان و بە ئاسانیی بڵاوبوونەوەی فیلم و ڤیدیۆی بەدوور لە بەهاکان و تێکچوونی شیرازەی خێزان.

ئەم توێژینەوەیە بەو مەبەستەیە، کە لە گۆشەیەکی تایبەت و گرنگترەوە، تیشکبخەینە سەر لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، تاکو بەوریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکەین. لەبەرئەوەی کە پێشتریش بە دوو توێژینەوە و چەند وتارێکی گشتگیر تر لەبارەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بابەتمان بڵاوکردووەتەوە، بۆیە ئاماژەمان بە چەمك و تایبەتمەندیی و مێژووی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان نەکردووە، واتا بۆئەوەی دووبارە ڕوونەدات.

**. لایەنی ئەرێنیی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان:**

بێگومان بەکارهێنان و بەرکەوتن لەگەڵ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا، لایەنی ئەرێنیی و نەرێنیی خۆی هەیە، کە ڕۆژانە خۆمان هەستی پێ دەکەین. سەرەتا لە لایەنە ئەرێنی (ئیجابی)یەکانەوە دەستپێدەکەین، کە چەندین خاڵی گرنگ لە خۆدەگرێت، ئەوانیش بریتین لە:

**یەکەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وەک بەدیل**

دوای گەشەکردنی نەوەکانی تەکنۆلۆژیا و پەیدابوونی مۆبایلی زیرەک و بڵاوبوونەوەی کۆمپانیاکانی بواری ئینتەرنێت و گەیاندن بە جیهاندا، هەروەها کێبڕێکردن لەسەر هەرزانکردنی کارت و هاوبەشیکردنی مانگانە و ئاسان دەستپێڕاگەیشتی هاوڵاتیان، بۆیە ئێستا دەبینین لەگەڵ زیادبوونی ژمارەی بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، کە ڕۆژ بەرۆژ لە زیادبووندایە، هەنووکە وەرگر بۆ دەستکەوتنی هەواڵ و زانیاری پەنا بۆ کەناڵە کلاسیکە جیاوازەکانی میدیا (ڕۆژنامە و گۆڤار، تی ڤی و ڕادیۆ، سینەما و شانۆ، ... تاد) نابات، «لەبەرئەوەی بەکارهێنانیان ئاسانە، هەروەها بە تەنها مۆبایلێک، کە جێگەی «ژووری هەواڵ»ی گرتۆتەوە، دەتوانرێت پەیامەکە بڵاوبکرێتەوە و کاریگەریش دروست دەکات»(١).

هەروەها هەر لەبەر گرنگی ئەو تۆڕانە و وابەستەبوونی جەماوەر (وەرگر) پێیانەوە، ئێستا دەبینین چەندین پەیج بە مۆبایلێکی زیرەک و ستاندێکەوە پەخشی ڕاستەوخۆیان هەیە و ئامادەی کۆنگرە ڕۆژنامەنووسییەکان دەبن، لەوانە: (کۆباس، ئێستا، پۆڵەتیک پریس ....هتد). کەواتە دەتوانین بڵێین تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان توانیویانە ببنە بەدیل و جێگرەوەی کەناڵە تەقلیدییەکانی دیکەی میدیا.

**دووەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و بەبازاڕکردن:**

خاڵێکی دیکە لە لایەنە پۆزەتیڤەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، ئەو ڕۆڵەیە کە تۆڕەکان لە هاندان و پاڵشتکردنی کاڵا و خزمەتگوزارییەکاندا دەیگێڕن، تاکو کڕیارەکان بیانکڕن، هەروەها لە جوانکردن و تەوزیفکردنی بیروبۆچوونی پارت و ڕێکخراوەکان لای خەڵک. بۆیە ئێستا هەموو کۆمپانیا و دامودەزگا و ڕێکخراو و پارت و تەنانەت نەخۆشخانە و خوێندنگا و زانکۆ ئەهلییەکان پەیج و ئەکاونتیان لە ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا هەیە و بازاڕ بۆخۆیان پەیدا دەکەن، واتە بازاڕسازییەکی نوێ لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە سەریهەڵداوە، کە بێگومان تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کارەکتەری سەرەکیەتی. لەوبارەوە دکتۆر نەزاکەت حسێن، لە کتێبی (بازاڕگەریی و بازاڕگەری میدیایی)دا دەڵێت:»بەپێی توێژینەوەیەک لە (٧١٪)ی ئەو بەکاربەرانەی، کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنن بۆ پرسیار و داواکانیان لە بازاڕ، ڕاسپاردەی بەکاربەرانی تر دەکەن بۆ بەکارهێنانی ئەم ڕێگایە بۆ گەیشتن بە خزمەتگوزاریی و کاڵاکان بە ئاسانی و سەرکەوتویی».(٢)

**سێیەم/ شکاندنی بەربەرستە دەستکرد و واقیعییەکان و سنوورە جوگرافییەکان:**

بەهۆی خاسیەتی کارلێکی و جیهانێتیی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە، ئێستا شتێک نەماوە بەناوی سنوورە جوگرافییەکان، بەڵکو هەمووی لەژێر هەژموونی ئەو تۆڕانەدان.(٣) هەروەک پێشتر ئاماژەمان بۆ کرد کاریگەریی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەشێوەیەکە، کە چاوەڕواننەدەکرا بگاتە ئەو ڕادەیە، کە ئایپاد یان مۆبایلێکی زیرەک، سنوورە جوگرافییەکان بشێکێنێت و بسڕیتەوە، بێ چاوەڕوانی و فەرمووکردن خۆی بکاتە ناو ماڵ و سەر جێگەی دانیشتن و نووستن.

پرسی ئاوارەکانی سنووری پۆڵەندا- بیلاڕوسیا، کە نزیکەی (١٢) دوانزە هەزار کۆچبەر بوون و زۆربەیان هاوڵاتی هەرێم و عێراق بوون، سنوورە جوگرافییەکانی بڕیی و ڕایگشتی کاتیی دژی سیاسەتی بەڕێوەبردن لە هەرێمی کوردستان دروستکرد، پێیانوابوو کە گەندەڵی و نەبوونی هەلی کار و بێهوایی و گرانی و ....هتد، هۆکاری سەرەکی ئەو پرسەن.

**چوارەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وەک بڵندگۆی شۆڕش و ناڕەزایەتییە مەدەنییەکان**

دیوار و ئەژماری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بوونە سەکۆ و داینەمۆی هەڵگیرساندنی شۆڕش و ناڕەزایەتییە مەدەنییەکان بە وێنەی ڕووداوەکانی بەهاری عەرەبی لە: (تونس، میسر، لیبیا، عێراق، یەمەن، بەحرەین، سوریا و کوردستان)، هەروەها لە کاتی کۆدەتا شکستخواردووەکەی تورکیا؛ بینیمان بە تەنها ئایفۆن و ڤیدیۆیەکی ئەردۆگان، چ کاریگەرییەکی دروستکرد و دواجار لایەنگرانی ئاکپارتی ڕژانە سەرشەقام و کودەتاکە شکستی هێنا(٤).

هەروەها لە هەرێمی کوردستان، هەموو چین و توێژەکان بە جیاوازیی ئایدیا و بیرکردنەوەیانەوە (خوێندکاران، مامۆستایان، فەرمانبەران و فەرمانبەرانی گرێبەست، پێشمەرگە و پۆلیس ...هتد) سەرجەمیان بۆ ڕێکخستن و سازدانی خۆپیشاندان و ناڕەزایەتیەکانیان، سەکۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بەتایبەت فەیسبوک بووتە بڵندگۆیان و لێیەوە کات و سات و شوێنی ناڕەزایەتییە مەدەنییەکانیان دیاری دەکەن، هەر بۆ نموونە خۆپیشاندانی خوێندکارانی زانکۆ و پەیمانگاکان لە کۆتاییەکانی مانگی تشرینی دووەمی ساڵی ڕابردوو، کە داوای دەرماڵە و باشکردنی بەشە ناوخۆییەکانیان دەکرد و زۆربەی شارەکانی گرتەوە، تەنها دیمەنی کچێکی خوێندکاری زانکۆی سلێمانی، کە بە برینداری کەوتبوو، هەروەها شەق تێهەڵدانی ئەفسەرێکی ئاسایش لە سەری خوێندکارێکی تری خۆپیشاندەر، بوونە هاشتاگ و ناچار بە داوای لێبووردن و چوونە ماڵی خوێندکاران کران، هەروەها حکومەتی هەرێم ناچاربوو لە (٧ی کانوونی یەکەمی ساڵی ڕابردوو) بڕی حەوت ملیار و دوو سەدو پەنجا ملیۆن دیناری بۆ بڕینەوە. پاشان لە پرسی بەندکراوانی بادینان، کە بەبێ یەکلاییکردنەوەی کەیسەکانیان، چەندین مانگە دەستگیراکراون و

هەڕەشەیان لەسەرە، دیسانەوە لە ڕێگەی فەیسبووکەوە توانرا ڕێکخراوەکان و وڵاتان و میدیای نێودەڵەوتی بێنەسەرخەت و داوایان لە حکومەتی هەرێم کەیسەکانیان بە سیاسیی نەکرێت و ئازاد بکرێن.

**پێنجەم/ گەڕان بەدوای هەلی کار:**

بەپێی توێژینەوەیەک کە تایبەت بووە بە دۆزینەوەی هەلی کار لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا دەرکەتووە کە، تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان باشترین سەکۆی کۆمەڵایەتین بۆ گەڕان بەدوای هەلی کار و گەشەپێدانی توانای مرۆیی کارمەنداندا.(٥). زەمینەی بازرگانی و ئابووری لەسەر ڕووبەری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کراوەتر و پڕفرۆشترە.(٦) هەروەها لە هەرێمی کوردستانیش خەڵکانێکی زۆر لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا، عەوداڵی دۆزینەوەی هەلی کار و پڕکردنەوەی فۆڕمن، ئەو پۆستانەی کە باسی هەلی کارن زۆرترین بینەر و ڤیوەری دەبێ.

**شەشەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و خێرانووسین و بەهرەی نوێ:**

فراوانبوون و گەشەپێدانی مۆبایل و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بوونە یارمەتیدەری خێرانووسین (تایپکردن) لە سەر کۆمپیوتەر و مۆبایلە زیرەکەکان(٧)، چونکە بەهۆی چاتی بەردەوام و وەڵام و وەڵامدانەوە، هەروەها لایک و کۆمێنت و تویتەوە، کە بەکارهێنەران لە نێوخۆیاندا ئاڵوگۆڕی پێدەکەن، هەنووکە دەستیان ڕاهاتووە و پێشووتر هەرگیز بەوشێوازە نەبوون. هەروەها تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وەک خزمەتگوزاریی ژمارەیەک بەرنامە و ڤیدیۆی فێربوونی مۆنتاژکردن و ئیتکردن و زمان و پێشبڕکێ .....هتد، بۆ وەرگران بێبەرامبەر دابینکردووە.

پاشان سەکۆی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بوونە یارمەتیدەرێکی باش بۆ دەرکەوتنی وزەی نوێ لە بواری نووسین و ڕۆژنامەگەریدا. لەوچوارچێوەدا، ستران عەبدوڵڵا لە کتێبی (غەزەتەوە بۆ غەزای سۆشیال میدیا)دا، ئاماژە بە خاڵێکی دیکە دەدات و دەنووسێ: «دەرکەوتنی توانای تازەی بواری نووسین و ئەدەب و ڕۆژنامەنووسی، دەستەیەک شاعیر و نووسەر و ڕۆژنامەنووسی بەتوانا، کە لەسەرەتادا تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان سەکۆی دەرکەوتنی بەهرەیان بوو، پاشان لە سەکۆی میدیا تەقلدییەکانیش دەرکەوتن، دیاردەیەکی هەرە گەشی ئەم تۆڕانەیە.»(٨)

**حەوتەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و پرسی ئاوارە و زیانلێکەوتووان**

پرسی ئاوارە و زیانلێکەوتووان لە ڕێگەی لاپەڕە و ئەژماری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە لە دنیادا بابەتێکی گەرمە و هاوڵاتیانی زیانلێکەوتوو کۆمەک دەکرێن، ئێستا بە ملیۆنان پۆست و تویت و ڤیدیۆ... هتد، کە ڕۆژانە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دادەبەزێنرێن و پەخش دەکرێن، بەشێکی گەورەی مەبەستی مرۆیی و یارمەتیدان و کۆمەککردنی زیانلێکەوتوانی

ڕووداوە سروشتی و سەربازییەکانی لەپشتەوەیە، وەک ئەوەی لە شەقامی کوردی کرا بۆ ڕۆژئاوای کوردستان و کۆبانێ و زیانلێکەوتوانی لافاوەکەی مانگی ڕابردووی هەولێر، هەروەها لە کاتی (کۆڤید١٩)یشدا.

**هەشتەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و بەردەوامی لە پەیوەندییەکاندا**

پێش هەموو شتێک دەبێ ئەوە بزانین، کە لە دایکبوونی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە ئەمریکا، مەبەستێکی کۆمەڵایەتیی و بەردەوامیی لە پەیوەندییەکانیدا لە پشتەوە بوو، کە کۆمەڵە خوێندکارێکی زانکۆ بۆ ئاگاداربوون لە چالاکی ڕۆژانە و خشتەی تاقیکردنەوە و ئاڵوگۆڕی بیروبۆچوونەکانیان دایانهێنا(٩)، بەردەوام مانەوە لە کایە فەزاییە گریمانەییەکە و پەیوەندیکردن بە هاوڕێی و خزم و دۆستانەوە لە سەرانسەری جیهاندا ئامانجی سەرەکیان بووە(١٠).

> **بەکارهێنانی لەڕادەی پێویستی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، کاریگەریی لەسەر ئاستی خوێندن دادەنێت و کەسی بەکارهێنەر ئالـــوودە دەبێت، هــەروەك خـــووگرتن بە ماددەی هۆشبەر.**

**نۆیەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و خوێندن لەدوورەوە (ئۆنلاین):**

خوێندن لەدوورەوە (ئۆنلاین) لە جیهاندا تازە نییە، هەرچەندە تەمەنی خۆشی زۆرنییە، بەڵکو پەیوەستە بە گەشەکردنی بوارەکانی ئینتەرنێت و پەیوەندیکردن و گەیاندنەوە، بەڵام لە دوای سەرهەڵدانی ڤایرۆسی کۆرۆنا (کۆڤید ١٩)ەوە، لە جیهاندا تیشکی خرایە سەر و خەڵکی زیاتر ئاشنابوون بە بەرنامەکانی ( Zoom Meet ,Classroom , ...) و وەک جێگرەوەی خوێندنی ناوپۆل شوێنی گرتەوە، کە ئەوەش بە فەزڵی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان جێبەجێ دەکرێت.

**- لایەنی نەرێنی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان:**

لەگەڵ گرنگی ڕۆڵی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، کە لە پێشەوە ئاماژەمان بۆی کرد، ئاشکرایە بەکارهێنان و بەرکەوتن لەگەڵیاندا چەندین لایەنی نەرێنی (سلبی)یش بەدوای خۆیدا دەهێنێت، بوارێکی مەترسیدارە و پێویست دەکات بە هۆشیارانە مامەڵەیان لەگەڵدا بکەین.

یەکەم/ بڵاوکردنەوەی فیلم و دیمەنی نەشیاو (ئیباحی، سەربڕین، کوشتن):

بێگومان بڵاوکردنەوەی ئەو دیمەن و فیلمانە، زیانی گەورە بە پرۆسەی پەروەردە دەگەیەنێت، هەروەها ترس و دڵەڕاکێ لە نێو دەروونی خەڵکیدا بەجێدەهێڵێت، بەتایبەتی

منالآن و ئافرەتاندا(١١). بەپێی داتای نافەرمیی عێراق، ڕۆژانە نزیکەی سێ ملیۆن و سێ سەد و بیست هەزار کەس سەیری ڤیدیۆ سێکسییەکان دەکەن و لەو ڕێژەیەش بە خەملاندن ڕۆژانە لەسەردووی چوارسەد هەزار کەس لە هەرێمی کوردستان سەردانی ماڵپەڕی سێکسی دەکەن(١٢). هەروەها لە ئاستە نێودەوڵەتییەکانیشدا، «لە هەر چرکەیەکدا نزیکەی (٣) هەزار کەس سەیری پۆڕن (دیمەنی سێکسی/ هەژار) دەکەن لە جیهاندا»(١٣). هەروەک بڵاوکردنەوەی هەندێ دیمەنی سووکایەتیکردنی فێرخوازان بە مامۆستایان، ئەو حاڵەتە (کۆمەڵەی نەتەوەیی بۆ بەڕێوەبەرانی خوێندنگە)ی لە ئەمریکا هێنایە دەنگ و داوای ڕێگریکردن لە بڵاوکردنەوەی ئەو دیمەنانەیان دەکرد(١٣). لە نموونەی ئەو ڕووداوەی باسکرا، لە کوردستانیش چەند حاڵەتێکی لەو شێوەیە ڕوویداوە، کە قوتابیان بە مۆبایلێکی زیرەکەوە هەڵدەستن بە وێنەگرتنی مامۆستاکانیان و بەبێ گوێدانەدانە لێکەوتە خراپەکانی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بڵاویدەکەنەوە.

**دووەم/ بەفیڕۆدانی کات:**

بەفیڕۆدانی کات کارێکی ناپەسەندە، چونکە مرۆڤ بێ بەرهەم دەبێت و ... لە ئایینی ئیسلامیشدا بەفیڕۆدانی کات کردەیەکی هەڵەیە و مسوڵمان لەسەری لە ڕۆژی دواییدا، لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێت، لەوانەیە زۆربەمان ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەرمان محەمەد (د.خ) بیستبێ، کە دەفەرمووێ: (لا تزول قدما عبدٍ حتى يُسأل عن عمُرِهِ فيما أفناهُ، وعن علمِهِ فيما فعل، وعن مالِهِ من أين اكتسَبه وفيما أنفقَه، وعن جسمِهِ فيما أبلاهُ)* لە ڕۆژی قیامەتدا، هەنگاو نانێن، تاکو چوار پرسیارتان لێنەکرێ، یەکێک لەو پرسیارانە ئەوەیە، کە دەفەرمووێ: ئەو تەمەنەی پەروەردگار پێی بەخشی، لە چیدا بەڕێت کرد؟

هەروەکو وتراویشە: (الوقت كالسيف ان لم تقطعه قطعك) واتا کات بەوێنەی شمشێرە، گەر نەیبڕی، دەتبڕێ. بەمانای پێویستە بە پلان و بەرنامەیەکی ورد و چڕەوە ڕووبەڕووی ژیان ببینەوە و دووربکەینەوە لە کاری شپرز و بێئەرزش.

پاشان بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەر بە چوونە ناو تۆڕەکانەوە، ڕێژەیەک لە کاتیان دەڕوا، دواترش بە لایک و شەیر و کۆمێنت نووسین، هەروەها سەیرکردنی ڤیدیۆ... تاد، هەموو ئەوانە دەبنە هۆی بە فیڕۆدانی کات. بەگوێرەی چەند توێژینەوەیەک خوێندکاری زانکۆ هەیە نزیکەی (١٠) سەعات لەناو تۆڕەکاندا دەمێنێتەوە(١٥).

**سێیەم/ کێشە و گرفتە یاساییەکان:**

ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەبەرئەوەی زادەی کلتوور و شارستانێتی ڕۆژئاوایە، کە بە فەلسەفە و سیستمێکی لیبراڵ ئابووریی و سیاسیی و میدیاییەوە پاڵپشتی لێدەکرێت، ئاساییە کۆتوبەندی ڕۆژنامەنووسان و ئازادیی ڕادەربڕین و ڕێزگرتنی تاک، بەهیچ شێوەیەک بە وڵاتانی جیهانی سێیەم بەراورد ناکرێت. لەوبارەوە دکتۆر سامان

فەوزی لە کتێبی (هێڵە یاساییەکانی کاری ڕۆژنامەوانی)دا، ئاماژە بە گرنگترین بەرست و گرفتەکان دەکات و لە چەند خاڵێکدا سەرەکیدا ڕیزیان دەکات: (گلۆباڵی ئینتەرنێت و لۆکاڵبوونی یاساییەکان، گرفتی دیاریکردنی بەرپرس لە تاوانەکانی ڕۆژنامەنووس لە ئینتەرنێتدا)(١٦).

دەکرێت کێشە و گرفتە یاساییەکان توێژینەوەی فراوانتر و چڕوپڕتری لەسەر بکرێت، چونکە زۆر هەستیارە، لەبەرئەوەش کە تا هەنووکە یاسایەکی تایبەت بە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و ئینتەرنێتمان نییە، بۆیە کێشەکان دووبارە و چەندبارە دەبنەوە، هەرچەندە ساڵی ڕابردوو لە پەرلەمانی کوردستان هەوڵدرا یاسایەکی تایبەت بەو میدیا نوێیە دەربچوێنرێت، بەڵام نەتوانرا، کە ئێستا بۆتە کێشەیەکی کۆمەڵایەتی و یاسایی و ڕۆژانە یەخەی زۆربەمان دەگرێت.

**چوارەم/ ئالوودەبوون:**

بەکارهێنانی زۆر و لەڕادەی پێویستی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، کاریگەریی لەسەر ئاستی خوێندن دادەنێت و کەسی بەکارهێنەر ئالوودە دەبێت، هەروەک خووگرتن بە ماددەی هۆشبەر، ڕێژەی (٧٠٪)ی توێژینەوەکەی کاربنسکی دانیان ناوە بەوەی، کە ئالودەبوونیان لەسەر فەیسبوک، کاریگەریی نەرێنی کردووەتە سەر تێکڕای نمرەکانیان(١٧). هەروەها ئێستا لە جیهاندا بەپێی نوێترین داتا، کە ڕۆژی (٢٠ی تشرینی دووەمی ٢٠٢١)، کەناڵی ئاسمانی سپێدە، لە بەرنامەی (THE TECH)دا بڵاوبووەی کردەوە: تەنها تۆڕی فەیسبووک (٣٦٠) ملیۆن کەس ئالوودەی بوون. بێگومان ئەو داتایە تەنها بۆ یەک تۆڕ و تەنها بۆ ئالوودەبووانیش! دەنا ژمارەی بەکارهێنەرانیان زۆر زیاترە و گەیشتۆتە ملیار، بۆ نموونە فەیسبووک مارسی ئەمساڵ گەیشتۆتە (٢,٥) دوو ملیار و نیوی بەشداربووی مانگانەی هەیە، یوتوویب و وەتسئاپ دوو ملیار، مێسنجەر (١,٣) .... هتد.

**پێنجەم/ چاودێریکردنی ئەستەمە:**

چاودێریکردن و کۆنترۆڵکردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و ئینتەرنێت، لەڕووی یاسایی و کۆمەڵایەتیی و تەنانەت لە ڕووی کاری پیشەیی ڕۆژنامەنووسیشەوە، کارێکی زۆر زەحمەتە، چونکە لە دەرەوە - ئەمریکا و ئەوروپا-وە ئاڕاستە دەکرێت و سنووری وڵاتانیشی بڕیوە، هەرچەندە ژمارەیەک لە وڵات: (کۆریای باکوور, چین، ئێران ....) سانسۆریان لەسەر داناوە، بەڵام ئەوە نەبووەتە ڕێگر لە بەردەم دەستپێڕاگەیشتنی هاووڵاتیان بەو تۆڕانە(١٨)، بۆیە ئێستا بەهۆی نەبوونی هۆشیاریی یاسایی و کۆمەڵایەتی ڕۆژانە چەندین کەیسی ناوزڕاندن و تۆمەتبارکردن لە دادگاکان لەو ڕووەوە تۆماردەکرێن و وایلێهاتووە خێزانەکان تووشی لێکتزان و هەڵوەشانەوە بوون.





**شەشەم/ دەستوەردان لە ژیانی تایبەتی تاکەکان:**

یەکێک لەو کێشانەی هەر لە سەرەتای بەکارهێنانی تۆڕە کۆمەڵایەتییەکانەوە دروستبوو؛ چوونە نێو ژیان و تایبەتمەندیی بەکارهێنەرانی بوو، ڕۆژ بەڕۆژیش ئەم کێشەیە گەورەتر دەبێت، چونکە زۆربەی کات وێنە و ڤیدیۆی بەکارهێنەر دەبرێت، دواتر هەڕەشەی لێدەکەن؛ کە یان پارە بدا، یان ژیانی دەکەوێتە مەترسییەوە. توێژینەوەیەکی ئەڵمانی (٢٠١٠)، ئەوەی سەلماند، کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بە پلەی یەکەم فەیسبووک ڕێزی تایبەتمەندیی هاوبەشەکانی ناگرێت(١٩).

**حەوتەم/ زیانی ئابووریی (بەهەردەردانی پارە و سامان):**

لێرەدا مەبەست کڕینی کارتی هاوبەشیکردن نییە، بەڵکو شۆردنەوەی پارە (غسل الاموال) و دزینی هەژماری بانکی و کارتی دڵنیاییە بەناوی جیاجیاوە، لە ڕێگەی هەندێ یاریی و بازرگانی ئۆنلاینەوە(٢٠). هەروەها خاڵێکی دیکە، کە لێرەدا جێگەی هەڵوەستە لەسەرکردنە ئەو پارەیەیە، کە ناوبەناو، لێرەولەوێ، کەسانێک لە: (سیاسی، بازرگان، هونەرمەند، ڕۆژنامەنووس...) دەکەونە «تەڵەی سێکسی»ی باندە ناوچەیی و جیهانییەکانەوەیە، کاتێک وێنە و ڤیدیۆی ساختەیان بۆ دەنێرن، دواتر بە ئاشکرانی وێنە و ڤیدیۆکان هەڕەشیان لێدەکەن، دواجار هەزاران دۆلار دەڕوات بۆ ئەو باندانە، تاکو ڕازیان دەکەن.

پاشان لایەنێکی مەترسیدارتری بە هەردەردانی پارە و سامان، ئەوەیە کە سالانە پارەیەکی زەبەلاح لە بەرهەمهێنانی «نزیکەی (١١) یانزە هەزار فیلمی پۆڕن»دا بەهەدەر دەڕوات! کە یەکسانە بە ڕێژەی (٢,٨٤)ی داهاتی سەرجەمی سێکتەرەکان لە هەموو جیهاندا(٢١).

**هەشتەم/ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان زانیاریی و بەڵگەنامەکان**

خاڵێکی دیکە کە جێگەی هەڵوەستە لەسەرکردنە، ئەوەیە کە لەسەر ڕووپەڕی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەواڵ و زانیاریی بێ سەرچاوە و بەڵگە و دیکۆمێنتی ساختە بڵاودەکرێتەوە، وێنە و ناوی قوربانییەکان بێ یەکلایکردنەوەی کەیسەکانیان پەخش دەکرێن، زۆر کەمن ئەو هەواڵانەی، کە لەگەڵ سەرچاوە و بێ ناوزڕاندن بڵاوبکرێتەوە، چونکە سروشتی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان وایە کە «پانتایەکی بەرفراوانی هەیە بۆ بڵاوکردنەوەی پڕوپاگەندە و گواستنەوەی زانیاری گوماناویی، زۆر کەم بەڵگەکانی جێگەی متمانەن».(٢٢)

## سەرچاوە و پەراوێزەکان


١- زهر عابد، دور شبكات التواصل الاجتماعي في تعبئة الرأي العام الفلسطيني نحو التغيير الاجتماعي والسياسي، مجلة جامعة النجاح، مجلد ٢٦ (٦)/٢٠١٢، ص ١٣٩٥.

٢- د. نەزاکەت حسێن، بازاڕگەری و بازاڕگەری میدیایی، سلێمانی، چ١، ٢٠٢٠، ل٧٢.

٣- د. حسنى عوض، أثر مواقع التواصل الاجتماعي في تنمية المسؤولية المجتمعية لدى الشباب، جامعة القدس المفتوحة، ٢٠١٢، ص٦، /http://www.qou.edu/arabic/conferences socialResponsibilityConf/dr_ ho usniAwad.pdf.

٤- محمد المنصور، تأثير شبكات التواصل الاجتماعي على جمهور المتلقين، رسالة ماجستير غير المنشورة، الأكاديمية العربية المفتوحة في دانمارك، ٢٠١٢، ص١١٤.

٥- زهر عابد، دور شبكات التواصل الاجتماعي في تعبئة الرأي العام الفلسطيني نحو التغيير, المصدر السابق, ص ١٣٩٧.

٦- میدیا، دواهەمین جادووگەر، شێخ شەهید، ڕێنما/ سلێمانی، چ١، ٢٠٢٠، ل ١٤٨.

٧- وائل مبارك خضر، أثر الفيس بوك على المجتمع، الخرطوم, السودان, ٢٠١٢, ص٢٠.

٨- ستران عەبدوڵڵا: لە غەزەتەوە بۆ غەزای سۆشیال میدیا، بەرگ ٢، سلێمانی، چ١، ٢٠١٩, ل ٢١.

٩- ئیدریس سیوەیلی و هەژار حاتەم، گوتاری سیاسیی سەرکردە ئیسلامییەکان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، (فەیسبوک بە نموونە)، گۆڤاری جۆرنال، ژمارە (٢٣)/ نیسان ٢٠١٨، ل٨٧.

١٠- د. علي صالح القحطاني، أهداف برامج التواصل الاجتماعي، شبكة ظهران الدعوية/ ٢٠١٥/٩/٨/ http://www.dahran.net/dahran/articles.php?action=sho \=١٠٣٢

١١- د. عبدالباسط سلمان، الإعلام الرقمي في العراق، مجلة الباحث الإعلامي، العدد (١٣)، أيلول ٢٠١١، ص٧٣.

١٢- د. مەحمود تاوگۆزیی، کاریگەریی تەکنۆلۆژیا لە سەر پرۆسەی خوێندن و چۆنێتی بەکارهێنانی، گۆڤاری خاڵ، ژمارە (٢٨) ئایاری ٢٠٢٠، ل١٤٧.

١٣- سەربەست بورهان قادر، پۆڕن، تەڵە مەترسیدارەکە، فام، چ١، ٢٠٢١, ل١٤.

١٤- يوتيوب... تغيير اللعالم بهدوء، مجلة تواصل، العدد (١١)/آذار/٢٠٠٧، ص٧٢.

*أخرجه الترمذي، باب القيامة(٦١٢/٤) رقم (٢٤١٦). أخرجه البزاز (٢٦٦/٤) رقم (١٤٣٥)، والطبراني في الأوسط (٥/ ٧٤) رقم (٤٧١٠), وصححه الباني في السلسلة الصحيحة، رقم (٩٤٦).

١٥- ئیدریس سیوەیلی و هەژار حاتەم، گوتاری سیاسیی سەرکردە ئیسلامییەکان لە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان، سەرچاوەی پێشوو, ل٨٨.

١٦- د. سامان فەوزی، هێڵە یاساییەکانی کاری ڕۆژنامەوانی، سلێمانی، چ١، ٢٠١١, ل٣٦.

١٧- د. حسنى عوض، أثر مواقع التواصل الاجتماعي في تنمية المسؤولية المجتمعية لدى الشباب، المصدر السابق, ص١٠.

١٨- د. السيد بخيت، نحو صياغة مؤشرات تقييم الأدوارالسياسية لشبكات التواصل الاجتماعي، المنتدى السنوي السادس للجمعية السعودية الإعلام والاتصال، ١٥-١٦/ ابريل/٢٠١٢، ص٣.

١٩- ليلى أحمد جرار، الفيسبوك والشباب الغربي، مكتبة الفلاح، ط١، ٢٠١٢، ص٦٣-٦٦.

٢٠- حسين عبدالجبار، اتجاهات الاعلام الحديث والمعاصر، دار اسامة، ط١، ٢٠٠٩، ص٨٨.

٢١- سەربەست بورهان قادر، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.

٢٢- خالد گراوی، ژەهراوییبوونی ڕاگەیاندن، هەولێر، چ١، ٢٠١٥، ل٣٩.



دانا دارا حسێن

# بۆشایی یاسایی لە هەرێم
## تایبەت بە میدیا و سۆشیال میدیا

مرۆڤ چونکە بوونەوەرێکی گۆیایە و دەتوانێت گوزارشت لە ویست و ئارەزووەکانیی بکات، هەمیشە ئەم ویستەی پێویستی بە فەزایەك هەیە تا بتوانێت دەربڕینی تێدا بکات، جا ئەو دەربڕینە بە نووسین یاخود وتن و ئاماژە بێت. لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ڕێکخستنێك هەبێت بۆ هەموو ئەو چەمك و ماف و دەسەڵاتانەی کە پرسی دەربڕین لەخۆدەگرێت لەنێویاندا ئەوەی لە میدیاکانەوە دەگوزەرێت یاخود ئەوەش کە مرۆڤی سەردەم زۆرتر بەکاریدەهێنێت لەنێو سۆشیال میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان.

سەرەتا دەبێت ئەو ڕاستییە بزانرێت کە ئەم نووسینە کورتە تەنها کار دەکات لەسەر سۆشیال میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کە تیایدا تاك یاخود دامودەزگا لاپەڕەی خۆی هەیە و بەڕێوەی دەبات و تەواوی ئەو بۆشایی و یاسایانەی کە هەنووکە لە هەرێمی کوردستان هەیە تایبەت بە ڕێکخستنی ئەم بوارە توێژراوەتەوە.

ئەوەی جێی سەرنجە کە زۆرێک لەو بوارانەی بەهۆی شۆڕشی تەکنەلۆجیاوە دروستبوون و لەنێو تۆڕی جاڵجاڵۆکەدان سەرچاوە و (مەنشەء)یان کوردستان نییە، هەربۆیە ئاسان نییە کە تۆ یاسایان بۆ دەربکەیت لەکاتێکدا توانات بەسەریاندا قورس و گران بێت. هەرچۆن هەندێک وڵات لە جیهان وەک تورکیا بە یاسای تایبەتمەند لەسەر ئەو کۆمپانیا جیهانیانەی پەیوەندیکردنی پێویست کردووە کە لە خاکی تورکیا نوسینگەیان هەیە، ئەمەش بە ئامانجی ئەوەی کە خروقات ڕوویدا بتوانرێت بەرپرسیارێتی یاسایی هەڵبگرن و ڕووبەڕوویان ببنەوە.

هەرێمیش لەم ڕوانگەوە ئەگەرچی لەچوارچێوەی دەوڵەتێکی فیدراڵیدایە، بەڵام دەتوانێت یاسای تایبەت بە ڕێکخستنی میدیای ئەلیکترۆنی هەبێت، بەڵام بە وریایی زۆرەوە نەوەک دەستدرێژی بۆ سەر مافی کەسەکان بکات یاخود تەنها دەق بێت و نەتوانێت لەم جیهانە ئازادە فراوانەدا جێبەجێ بکرێت.

سەرەتا پێویستە هەریەکە لەم چەمکانە وەک خۆی بناسین و زانیارییەک لەبارەیانەوە بڵێین:

* مافی تایبەتمەندێتی (حق الخصوصية): یەکێکە لە ماددە لکاوەکان (لصيق) بە کەسایەتی مرۆڤەوە کە مانای ژیانی تاکی دوور لە دەستتێوەردان و هەرکارێک لەم شێوازانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

– ـ دەستتێوەردان لە ژیانی تاکەکەسی و خێزانی.
– ـ دەستێوەردان لە کەسایەتی و لە ئازادییە عەقلّی و پەرستشەکان.
– ـ خستنە ژێر فۆکەسی کەسەکان.
–ـ بڵاوکردنەوەی چەند ڕووداوی پەیوەندیدار بە ژیانی تاکەکەس و خێزانییەوە.
– ـ بەکارهێنانی ناو یان وێنەی کەسەکان.
– ـ جاسوسی کردن و گوێگرتن لە پەیوەندییەکان.
– ـ دەستێورەدان لەناو کار و پەیوەندیدارەکان کە بە نهێنی هێڵراونەتەوە.
–ـ بڵاوکردنەوەی هەر زانیارییەک کە بە دەستی بگات.

دەستوری عێراقساڵی ٢٠١٥ ماددەی ١٧، وا ئەم مادەی ڕێکخستووە.

* میدیا و سۆشیال میدیا:

میدیا هەموو ئەو بڵاوکراوانە بە هەردوو جۆری دەنگ و نووسین دەگرێتەوە (ڕۆژنامەی نووسراو تایبەتمەندی خۆی هەیە) کە ڕۆژنامەنووس تیایدا دەنوسێت. بەڵام سۆشیال میدیا سەرجەم ئەو بوارانە کە پەیوەند بکرێت بە تۆڕی جاڵجاڵۆکەیی کە سنووری جیهانییەکان ناناسیت دەگەیەنێت.

یاسایەک لە هەرێم بەرکارە لەم بوارەدا، ئەویش یاسای ڕۆژنامەگەری لە هەرێمی کوردستان ژمارە ٣٥ی ساڵی ٢٠٠٧ ە.

هەروەها یاسایەکی تر بۆ بوارەکانی پەیوەندیکردن بەناوی یاسای قەدەغەکردنی




خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندیکردن لە هەرێمی کوردستان ژمارە ٦ی ساڵی ٢٠٠٨ بەشێکی ئەو بوارانەی ڕێکخستووە.

* لە کوێدا بۆشایی یاسایی هەیە؟

ئامانجی دەرچواندنی یاساکان بۆ ڕێکخستنی ئەو بوارە ژیارییانەیە کە بۆ کایەکانی ژیان گرنگن و دروست دەبن، بەشێوەیەک پێویست دەکات لەسەر یاسادانەر کە هاوشان و هاوتەریب لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا ئەویش یاسای باش دابڕێژێت. ئەگەرچی ئێمە لە هەرێمدا یاسای ژمارە ٦ی ساڵی ٢٠٠٨ی قەدەغەکردنی خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکان پەیوەندیکردنمان هەیە لەگەڵ یاسای مافی دەسکەوتنی زانیاری لە هەرێمی کوردستان ژمارە ١١ی ساڵی ٢٠١٣ کە تائێستا ڕێنمایی بۆ دەرنەچووە و جێبەجێ نەکراوە، چونکە دەسەڵاتی جێبەجیکردن نایەوێت ئەم یاسایە وەک خۆی جێبەجێ بکات.

بەڵام ڕاستییەکی سەلمێنراوە کە بۆ بوارەکان سۆشیال میدیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کە لە ئێستادا زۆر بە بەرفراوانی لە جیهاندا بەکاردەهێنرێت یاسایەکی هاوچەرخمان نیە. پێویستیشە ئەم بۆشاییە یاساییە بە دەقێکی یاسایی کە حوکمێکی ئیلتیزامی (پابەندکار)ی تیادا بێت پڕ بکرێتەوە و هەریەک لەم ڕاستییانە لەخۆ بگرێت:

١ – میدیای هاوڵاتی و کاری ڕۆژنامەنووسی میدیای لەگەڵ تاکی هاوڵاتی جودا بکرێتەوە.

٢ – سەرجەم ئەو سایت و تۆڕەکۆمەڵایەتییانە پابەند بکرێن کە نوسینگەیان لە هەرێمی کوردستان بکەنەوە و نوێنەری یاسایی و بەرپرسیارێتی یاساییان دیاری بکرێت.

٣ – بە ماددەیەکی سەربەخۆ ئەو قەدەغەیە ڕوون بکرێتەوە کە سەرجەم سایتە ئابڕووبەرەکان (المواقع الإباحية) لەلایەن تۆڕەکانەوە قەدەغە بکرێن و ئەو دەرفەتە نەدەن کە بەکارهێنەر هەرکاتێک و لە هەر تەمەنێک بێت بتوانێت بەکاری بهێنێت.

٤ – بەهۆی تێکەڵی لە سەرجەم بوارەکانی پەیوەندییەکان بە تەکنەلۆژیاوە، وەک موبایل و هێڵەکان و هەموو بوارەکانی خزمەتگوزاری (وای فای) پێویستە لەسەر دیارترین ئەو تاوانە ئەلیکترۆنیانە (الجرائم الالكترونية) بوەستێت و وێڕای بە تاوان ناساندنی سزاشی بۆ دابنێت، چونکە پرەنسیپێک لەو تاوانانەدا هەیە ئەویش ئەوەیە کە (لا جريمة ولا عقوبة إلا بنص)، بەواتای هیچ کارێک بە تاوان دانانرێت یاخود سزاشی بۆ دانانرێت مەگەر بە دەقێکی یاسایی نەبێت، کەواتە ئەو دەقە یاسایە ئەو کارە نەشیاوانە دەکاتە تاوان و سزاشی بۆ دادەنێت.

٥ – چۆنیەتی مامەڵەکردن لەگەڵ تاوانێک کە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان یان لە میدیای جیهانییەوە دەکرێت ئاسان دەتوانریت سەرچاوەکەی بدۆزرێتەوە.

پێویستە هەموو ئەم ڕاستییانە ئەو بۆشاییە یاساییەی لەم بوارەدا هەیە پڕ بکەنەوە.



د.سارا محسن

# سۆشیال میدیا و لێکەوتەکانی

لە دوای ساڵی ٢٠٠٠ـەوە وەک بڵێیت سەرهەڵدانی نوێگەرییەکی سەرتاسەری لە جیهاندا ڕوویدات وابوو، لە ئاکامی ئەو نوێگەرییە سۆشیاڵ میدیا-تۆڕی کۆمەڵایەتی پەیدا بوو، دوای ئەوەی میدیای لە مێژینەی مرۆڤایەتی (تەلەفزیۆن و سەتەلایت) وردە وردە دەبووە هۆی بێزارکردنی تەماشاکارانی، خەڵکی دەکشانەوە لە تەماشاکردنی میدیا ئاسمانییەکان و بەرەو بەدواداچوون و تەماشاکردنی بەرنامە دیجیتاڵییەکاندا دەگەڕان، خواستی مرۆڤ لەسەر ئاسانترین ڕێگا گەیشتن بوو بە هەواڵ و زانیارییەکان تا بەشێوەیەکی ڕاستەوخۆ لەگەڵ ڕووداوەکانی ژیاندا تێکەڵ ببن.

سۆشیال میدیا دنیایەکی فراوانی تۆڕەکانی کۆمەڵایەتییە، لە ئاکامی پێشکەوتنی تەکنەلۆجیای ئینتەرنێت و چەقبەستوویی میدیای کلاسیک هاتە ئاراوە. دوای ئەوەی میدیای باو تاکەکانی بەرەو بێزاربوون و خۆونکردن و کەسایەتی و بەلاڕێدابردنی لە کایە مەعریفییەکانەوە بۆ ونبوونی شوناسی ڕاستەقینەی میدیا برد. تا لە دنیایەکی فراوانتر تاکەکان بڕواننە شتەکان و ڕاستەوخۆ لەگەڵیدا ئاوێزان بن و ببنە بەشێک یان ڕاستەوخۆ کاردانەوە دروست دەکات.

تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان فۆرمێکی نوێی میدیایە و بریتییە لەو تۆڕە بەرفراوانەی کە لە ئەنجامی گەشەی تەکنۆلۆجیای ئەنتەرنێتی، سەریهەڵداوە کە سەرجەم بەربەستە سیاسیی و جوگرافییەکانی تێکشکاندووە. واتە دیارترین فۆرمی گەشەی تەکنولوجیایە. سۆشیال میدیا لەڕووی پەیوەندی کۆمەڵایەتی، سیاسی، ئابووری کاریگەری زۆر گرنگی هەیە. لەڕووی پەیوەندی کۆمەڵایەتییەوە ئەوە لای هەموومان ئاشکرایە کە چەند ئاسانکاری هاتووەتە بەرهەم بەهۆی سۆشیال میدیاوە، هەر ئەم پەیوەندییانەی ئێستا ئێمە هەمانە بۆ ئەم گفتوگۆیانە بەم ئاسانییە بەرهەمی بوونی ئەو کەناڵانەیە، کرانەوەی کۆمەڵگە داخراوەکان بەڕووی دنیادا، و دەستڕاگەیشتنی نەوەی نوێ و گەنجان بە ئاڵوگۆڕە جیهانییەکان لەڕووی کلتووریی و فەرهەنگیی و زانستی و سیاسییەوە.

دەتوانین بڵێین سۆشیال میدیا ڕۆڵی بەرچاوی هەیە لە ژیانی ڕۆژانەماندا و کاریگەرییەکی فراوانی هەیە لەسەر تاکەکانی کۆمەڵگە. بۆ هەموو کەسێک دەرگایەکی کراوەیە، چونکە هەرکەسێک ئارەزوومەند بێت و پێویستی بێت دەتوانێت زۆر بە ئاسانی لە ڕێگەی ئەکاونتی خۆیەوە یاخود لاپەڕە ئەلیکترۆنییەکان و سایتە جیاوازەکانی سۆشیال میدیا بەگشتی سوودمەند بێت، هەموو ئەو زانیارییانەی کە دەیەوێت دەتوانێت بەدەستی بهێنێت یاخود زانیاری ببەخشێت. هەروەها یارمەتیمان دەدات بۆ فراوانکردنی پەیوەندییەکان لە نێوان تاکەکان لە چوارچێوەی وڵاتێک یاخود لە جیهاندا. جگەلەوە ڕۆڵێکی باڵا دەبینێت لە ژیانی ڕۆژانەی هاوڵاتیاندا چ لەڕووی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری یان فێربوون و بەستنی کۆنفرانس و سیمینار و وۆرکشۆپ و لە ڕێگەی لاپەڕە ئەلیکترۆنییەکان یان بۆ کات بەسەربردن لە سەیرکردنی وێنە و ڤیدیۆ و هۆکارەکانی تر. بێگومان بەشێوەیەکی بەرفراوان کاریگەری خۆی هەبووە لەسەر تاک و خێزانەکانی ناو کۆمەڵگە و هەموو لایەنەکان جا لایەنی (ڕۆشنبیریی و ئابووریی و کۆمەڵایەتی و تەندروستی پەروەردە و هتد...).

لە دنیای ئەم سەردەمەدا ئەم تۆڕەکۆمەڵایەتیانە و ئامێری سمارت“ زیرەکەکان“ ڕووی پێشرەوییەکی گەورە لە زەمینەی زانست و پەیوەندییەکاندا، دەخەنە ڕوو□ دیارە سودمەندی یەکەم لەم تۆڕانە کۆمپانیاکان و خاوەنی ئەو تۆڕانە، بەڵام ئەوە ئەو ڕاستییە

داناپۆشێت کە بەشداربووانیش بەشێوەی جۆراوجۆر سودمەندن لەو فەزایە کە تۆڕەکان خستوویانە بەردەست. تا ئێرە دیوێکی دنیای تەکنۆلۆژیی و ئەلکترۆنی و پێشڕەوی ئامێرە زیرەکەکانە کە قابیلی کەڵک لێوەرگرتن و فێربوونە.

بەهۆی تەکنۆلۆجیای پەیوەندی لە چرکەساتێکدا چەندین هەواڵ و زانیاری جۆراوجۆر بڵاودەبنەوە و پەیوەندی لەگەڵ دورترین مەودا دەبەستیت لە هەر شوێنێکی دنیا بیت. کە ئەمەش وەرچەرخانێکی گەورەیە لە بواری شۆڕشی پەیوەندیدا. یەکەم تۆڕی کۆمەڵایەتی بەناوی (classmates.com). لە ساڵی ١٩٩٥ کە هەستان بە دابەشکردنی هەر وڵاتێک بۆ کۆمەڵک شوێن کە هەرشوێنێک لە کۆمەڵێک قوتابخانە پێکهاتووە کە هەموو ئەو قوتابخانانەش لە لەسەر هەمان تۆڕ بەشداربوون کە ئەو تۆڕە وایکرد پەیوەندیی و یەکترناسین لە نێوان قوتابیان بە ئاسانی دروست ببێت جگەلە زیادبوونی بەردەوامی هاوڕێی نوێ. لەو ساڵانە بەدواوە کۆمەڵێکی تر لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دروست بوو لە نێوان قوتابیان هەتاوەکو دەرکەوتنی تۆڕی بەناوبانگ(my space)” کە بەیەکێک لە بەناوبانگترین تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان دادەنرێت لە ئێستادا.

پاشان دەرکەوتنی تۆڕی کۆمەڵایەتی (linked.in) لە ساڵی ٢٠٠٣، ڕێژەی بەشداربووانی گەیشتە ٢٥٠,٠٠٠٠٠٠ کەس کە زیاتر بۆ کاروباری پیشەیی و وەزیفی بەکاردەهات، دوابەدوای ئەو (facebook) دروست بوو لە ٤ی شوباتی ٢٠٠٤ لەلایەن مارک لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاکە لە ئێستادا و لە سەرانسەری جیهان بەکارهێنەری هەیە، بەهۆی پێشکەکشکردنی خزمەتگوزاری بەردەوام. دوابەدوای ئەو دەرکەوتنیtwitter.

لە کۆتاییدا، دەتوانین بڵێین هەریەک لەمماڵپەرانە بەئامانجێک دروستبوون بەبێ ڕەچاوکردنی سنووری جوگرافی جا لەسەر ئاستی ناوخۆ بێت یان جیهانی. سێ بەشی بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان درۆ دەکەن لە نوسینەوە و ئاشکرا کردنی زۆرێک لە بابەتەکانی ژیانیان کە ئەمەش بۆ سەرنجراکێشانی دەوروبەریانە.

کۆمەڵێک لە توێژەرانی ماڵپەری (بینک وارگ) ئەوەیان ڕونکردۆتەوە کە لە ٦٨٪ ی بەشداران ڕاستگۆ نین یاخود زیادەڕەویان کردووە لەسەر ڕووداوەکانی ژیانیان بەتایبەتی لەسەر (facebook) ئەو کەسانەش کە ڕاستگۆ نەبوون هەست بە شەرمەزاریی و خەمۆکی دەکەن.

توێژینەوەیەک کراوە لەسەر ٢٠٠ خێزان بۆ ( ٦) مانگدەرکەوتووە دایکان و باوکان منداڵەکانیان فەرامۆش دەکەن بەهۆی زۆری بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان. ئەو خێزانانەی گرنگی زیاتر بە منداڵەکانیان دەدەن دەرکەوتووە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان کەمتر بەکاردەهێنن و وایکردووە کە پەیوەندی سۆز و خۆشەویستی نێوانیان ڕوو

له زیادبوون بکات ، چونکە منداڵ لەو تەمەنە هەستیارەدا لەڕووی گەشەی هۆشیاری دەروونییەوە لە هەمووکات زیاتر پێویستیان بە گفتوگۆ و یاریکردن و گوێلێگرتن هەیە، بەڵام گرنگی نەدان بە منداڵ و ئالودەبوون بە تۆڕەکۆمەلایەتییەکان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بۆتە دیاردە، ئەم حاڵەتەش مەترسیدارە و تا دێت بەرەو خراپی دەچێت بەهۆی کەمی هۆشیاری خێزانەوە.

سۆشیال میدیا کاریگەری کردۆتە سەر میدیا لە کوردستان، لەگەڵ گەشەکردنی سۆشیال میدیا، دەبینین میدیاکانی کوردستانیش بەخۆداچوونەوەیەکیان بۆ خۆیان کردووە، گەیشتونەتە ئەو ئەنجامەی کە چیتر ناتوانن وەکو جاران بە ئاڕاستەیەکدا کار بکەن، کە خۆیان مەبەستیانە و دەیانەوێت، میدیای تەقلیدی دەبێت بەخۆیدا بچێتەوە، بچێتەوە ناو خەڵک و ئازادی ڕادەربڕین بەرفراوان بکات، زانیاری زیاتر ببەخشێت، چونکە لەم قۆناغەدا سەردەمی شاردنەوەی زانیارییەکان بەسەرچوون، چونکە ئەوەی تۆ بڵاوی ناکەیتەوە، سۆشیال میدیا بڵاوی دەکاتەوە، چیتر ناکرێت زانیارییەکان بشارێتەوە، چیتر ناتوانێت وەکو جاران ئەوەی مەبەستە بیگەیەنێت و ئەوی مەبەستت نییە نەیگەیەنێت، چیتر ناتوانێت دەنگی شەقام کپ بکات، چونکە شەقام ئامرازی و ئاڕاستەیەکی تری دۆزیوەتەوە و ئیشی لەسەر دەکات، ئەگەر سەیری ئەدای میدیایی لەئێستادا بکەین دەبینین میدیاکان بەخۆداچوونەوەیان بۆ کارەکانیان کردووە.

گرنگی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەڕووی بەکارهێنانەوە:

لەگەڵ پەیدابوونی سۆشیاڵ میدیا، میدیای ئەلکترۆنیش پەیدا بوو، لەبەر ئاسان بەکارهێنانی لەلایەن بەکارهێنەرانییەوە بەشێوەیەکی خێرا لەناو کۆمەڵگەدا تەشەنەی سەند و بینەرانیشی بەردەوام لە زیادبووندان، چونکە میدیا نوێیەکان بۆ هەموو کەسێک دەرگایەکی کراوەیە، هەرکەسێک ئارەزوومەند بێت دەتوانێت لە ڕێگای ئەکاونتی تایبەتی خۆیەوە یاخود پەڕە ئەلیکترۆنیی و سایتە جیاوازەکانی سۆشیال میدیاوە بەئاسانی بەوەی دەیەوێت، ئەم تۆڕە یارمەتیدەرە تا پەیوەندی ببەستی لە نێوان تاکەکانی یەک وڵات یان لە جیهاندا، جگەلەوە ڕۆڵێکی باڵا دەبینێت لە ژیانی ڕۆژانەی هاوڵاتیاندا لەڕووی ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری یان فێربوون و بەستنی کۆنفرانس، سیمینار، وۆرکشۆپ، هەروەها بۆ کات بەسەربردن لە سەیرکردنی وێنە، ڤیدیۆ و هۆکارەکانی تر، هەربۆیە هاوڵاتیان زیاتر گرنگیان بە میدیا نوێیەکان داوە وەک لە میدیای ئاسمانی، ئەم گرنگیپێدانەش ڕاستەوخۆ لەلایەن سیستمی سەرمایەدارییەوە ئاڕاستە دەکرێت، بۆ گەیشتن بە هەڵوەشاندنەوەی کۆمەڵگە و شێواندنی ئەخلاقی خێزانی، میدیای نوێش وەک ناوەندێک کاری کردووەتە سەر تاک بە تاکی خێزان و کۆمەڵگە، بەشێوەیەک:

١. جیهانی کردۆتە شاشەیەکی ئەلکترونی کە بە چرکە سات هەواڵ وگۆڕانکارییەکان دەزانیت.
٢. هێزێکی موگناتیسی هەیە و بارگاویت دەکات، هەروەها کۆنترۆڵی هەڵسوکەوتت دەکات چ بە خراپ یاخود باش.
٣. کۆمنیکەیشنی ئۆنلاین لەسەر بنەمای گریمانەیە، ئەوەش بەرهەمی گەشەی تەکنۆلۆجیایە.
٤. پاڵنەرەکان جیاوازن بۆ بەکارهێنان، بۆیە دەبێت بیبەستینەوە بەو مەبەستەی کە بەکارهێنەر بەکاریدەهێنێت.
٥. سروشتی سۆشیال میدیا مرونەتی زۆری تێدایە و بۆ هەرکەس و بوارێک بەکاردێت، بەڵام لە بنەڕەتدا بۆ سێ مەبەست دروست بوو، سەرەتا بۆ بواری زانستی و دواتر کۆمەڵایەتی و پاشان بازرگانی و ڕیکلام، لە خۆرهەڵاتی ناوەڕاستیش زیاتر بۆ ئامانجی سیاسی.

**گەشەی سۆشیال میدیا:**

سۆشیال میدیا، ئێستا لەو باسە سەرەکیيانەیە کە سەراپای کۆنفرانسی زانستیی و دیبەیت و سیمینارەکانی تایبەت بە میدیای داگیرکردووە، هەرجارەو هەرکەسە و هەر ناوەندێک لە ڕوانگەی خۆی و ئەو بوارەی کە سۆشیال میدیا بەرکەوتەی لەگەڵ کردووە باسی دەکات، تا دەگاتە ئەوەی هەندێک لە پسپۆڕان بە ئینقلاب بەسەر ژیانی واقیعی کۆمەڵایەتی و مرۆڤایەتی دایدەنێن، پێیانوایە ئەو کۆمەڵگە خەیاڵییەی سۆشیاڵ میدیا و میدیای نوێ دروستی دەکات، لە بەها و پێگەی کۆمەڵگە واقیعییەکە کەمدەکاتەوە. چەندین بۆچوون لە سەر میدیای نوێ و گەشەکردنی ئامرازەکانی لەڕووی مێژوویی و تەکنەلۆژیا جیاوازەکانەوە هەیە. بێگومان هەر کار و پیشەیەک تا بەرفراوانتر بێت، ئەوا کۆنترۆڵکردن و سەرپەرشتیکردنی سادە و ساکار نابێت بگرە ئاڵۆز و ئەستەمتر دەبێت، بەتایبەتی بابەتی سۆشیال میدیا کە بوارێکە هەر زوو تەشەنە دەکات، بەڵام ئەمەش مانای ئەوە نییە کە ئەم بابەتە بایەخی پێنەدرێت و سانسۆری لەسەر نەبێت، بەڵکو لەهەر شتێکی تر زیاتر پێویستە چاودێریی ئەم سێکتەرە بکرێت و ئاوڕی جدی لەم بوارە بدرێتەوە، چونکە سۆشیال میدیا پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی بەسەر هۆشیاریی تاک و کۆمەڵگە و تەنانەت بازاڕ و ئابووریشەوە هەیە. بۆ ڕێکخستنی ئەم بابەتە بەشێوەیەکی سەرەکی ئیش و کاری حکومەت و دەزگاکانی پەیوەست بە ڕۆشنبیریی و لایەنە پەیوەندیدارەکانی تر و ڕاگەیاندنی ڕەسمی و دیارەکانی حیزب و حکومەتە کە پێشەنگ بن لە بواری بەپیشەیی کردنی زیاتری سۆشیال میدیا، بۆئەوەی بەرهەمی باش و سوودبەخش پێشکەش بە خەڵک و کۆمەڵگە بکەن.

لە ئێستادا تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەتەنها پێویستییەکی حەتمی نین، بەڵکو بێ ویست

و ئیرادەی خۆمان کۆنترۆڵی بڕیار و هەڵسوکەوتی کردوین، بۆیە ئەو کەسانەی کە کاریگەرن لەنێو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەتوانن زۆر بەئاسانی ئاڕاستەی کۆمەڵگە بکەن بەوشێوازەی کە خۆیان مەبەستییانە. هەڵبەتە لە ئێستادا و بە پێی دوا سەرژمێری کە لە تەموزی ٢٠٢١ کراوە سەبارەت بە بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت و سۆشیال میدیا هەتا دێت لە بەرزبونەوەدایە کە زیاتر لە نیوەی جیهان تۆڕەکۆمەڵابەتییەکان بەکاردەهێنن، بەشێوەیەک لە ماوەی ساڵێکدا ڕێژەی بەکارهێنەران (٣١٦) ملیۆن بەرزبۆتەوە، هەروەها ٤,٤٨ ملیار کەس لەجیهاندا تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەکاردەهێنن، کە دەگاتە ٥٦,٨٪ دانیشتوانی گۆی زەوی. بەپێی ئەم ڕێژەیە و لەچوارجێوەی هەمان سەرژمێری لە ١٠ بەکارهێنەری تۆڕی کۆمەڵایەتی ٩ بەکاربەر تۆڕی کۆمەڵایەتی بەکاردەهێنن. هەڵبەتە لەم ڕێژانەش فەیسبووک پشکی شێری بەرکەوتووە.

> **گرنگی نەدان بە منداڵ و ئاڵودەبوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە کۆمەڵگەی ئێمەدا بۆتە دیاردە، ئەم حاڵەتەش مەترسیدارە و تا دێت بەرەو خراپی دەچێت بەهۆی کەمی هۆشیاری خێزانەوە.**

تەنهاماڵێکی مەجازیی نییە، بەڵکو پانتاییە. جیهانگیریی و فەزای سایبەریی توانستی ئەوەیان هەبووە کە زۆرینە لەنێو تۆڕی جۆربەجۆردا کۆبکەنەوە و لەوێوە پانتایی گشتی (الفظاء العام/Public Sphere) چێبکەن و بەشداری زیاتری هەمووان فەراهەم بکەن، لەکاتێکدا لە تێگەیشتنی پێشووتردا پانتایی گشتی زیاتر ب ناو شوێندا پەرتکرابوو.

مارک زوگەربێرک خاوەنی گەورە کۆمپانیای فەیسبووک ئاماژەی بەوەداوە کە فەیسبووک تەنیا ئامرازێک نییە بۆ بەیەکتر گەیشتن، بەڵکو هۆکارێکە کە توانیوێتی زۆر بەخێرای کۆنترۆڵی هەموو سێکتەرەکانی ژیان بکات، هەرئەمەو تموحی زیاتری زوگەربێرگ وایکرد کەناوی کۆمپانیاکەی بگۆڕێت بۆ (میتا) کە لە بەشی یەکەمی تەکنەلۆجیای (مێتاڤێرس) وەرگیراوە. میتا ڤێرس پێشتر بۆ خەیاڵی زانستی بەشێوازە کلاسیکییەکەی بەکاردەهێنرا و بەردەوامیش بەشێکی زۆری زانایان بیریان لەو شێوازە دەکردەوە، هەتا بەتایبەتی بۆ کەسانی کەمئەندام و خاوەن پێداویستی تایبەت دروستی بکەن، بۆئەوەی هەست بەوە بکەن کە دەتوانن بچنە هەموو شوێنێکەوە، بیرۆکەکە لە فیلمی «Ready Player One» بەتەواوی لە هزری زۆرینەی خەڵکی چەسپێنرا، کە

تێیدا بەڕوونی ئەوە خراوەتە ڕوو، کە چۆن لەڕێی چاویلکەیەکی زیرەک و پەیوەستکراو بە مۆبایلێکی زیرەک یان کۆمپیوتەرێکی پێشکەوتوو، دەتباتە نێو هەموو شوێنێکی سەر زەویی و گەردوون، بێ ئەوەی لە شوێنی خۆت جووڵە بکەیت.

هەڵبەتە ئامانجی یەکەمی ئەم گۆڕینەش ئەگەرچی لە ڕواڵەتدا گۆڕانکارییەکی ڕووکەشییە، بەڵام ستراتیجیەتی بەهێزی لە پشتە و هەوڵدەدات لە داهاتوودا بڕواتە نێو ئەم تەکنەلۆجیا وەهمیە ڕاستەقینەیە کە بە بۆمبی سەدەی بیستویەک ناسراوە و وەرچەرخانی گەورەی لێ پێشبینی دەکرێت. کە بە ملیارەها دیناری خەرج کردووە بۆ ئەم پڕۆژە تازەیە و لە پلانیدا هەیە ١٠ هەزار کارمەندی نوێ دابمەزرێنێ، بەوەش جیهانێکی تەواوئۆنلاین بۆ تەواوی سێکتەرەکانی ژیان دروستبکات. بەنموونە لە ماڵەکەی خۆتەوە کاری فەرمانگەکەت ڕایی بکەیت، بازاڕ و وەرزش بکەیت لە ڕێگای جوڵەی فیزیکییەوە بە بەکارهێنانی هەر (٥) هەستەکە، واتە تێکەڵکردنی زانستی ئەلکترۆنیی و زانستی فیزیکی.

بەگوێرەی خەمڵاندنەکان بەو گۆڕانکارییەی کە زوکەربێرگ دەیەوێت لە فەیسبووکدا ئەنجامی بدات، زیاتر لە ٢٨ ملیار دۆلاری ئەمەریکی قازانج دەکات، چونکە بەکارهێنەرانی پێویستیان بە کڕینی چاویلکەی زیرەک و هیدفۆنی زیرەکی تایبەت هەیە کە بەرهەمی خودی کۆمپانیای فەیسبووکن، ئەمەش وا دەکات بە ملیاران چاویلکە و کاتژمێر و هیدفۆنی زیرەکی فەیسبووک بفرۆشرێت، کە وردە وردە خەریکە کۆمپانیاکە وەبەرهێنانیان تێدا دەکات و لە ساڵانی داهاتوو نیازی وایە بیانخاتە بازاڕەوە.

بۆیە لە داهاتوودا وەڵامی ئەم پرسیارەمان دەستدەکەوێت بەوەی مێتاکەی زوگەربێرگ بەرەو کوێمان دەبات، چونکە ئەوەی لە تەکنەلۆجیای مێتاڤێرسدا هەیە تەنها بیرۆکەیە و لە داهاتوودا بۆمان ڕووندەبێتەوە کە چ کاریگەرییەک لەسەر بەکارهێنەرانی ئینتەرنێت دروست دەکات؟!



نەوزاد عەلی ئەحمەد
خوێندکاری دکتۆرا- زانکۆی سلێمانی

# سۆشیال مێدیا و کۆمەڵگەی حزبی

پێشەکی

پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆجیا زۆر بەخێرایی دنیای داگیرکرد و بەردەوامیشە لەو داگیرکارییە، وەک هەر هۆکارێکی تری ژیان هەر تەنیا سوودی بە مرۆڤایەتی نەگەیاندووە، بەڵکو ئەو کۆمەڵگایەی ڕووبەڕووی کۆمەڵێک گرفت کردۆتەوە، بەتایبەتیش بەرزبوونەوەی کێرڤی تاوان و تاوانکاریی. سۆشیال مێدیا بەرهەمی پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆجیای نوێیە، کە نزیکەی چوار ملیار کەس لە گۆی زەوی بەکاریدەهێنن و سوودی لێ دەبینن، سۆشیال مێدیا تۆڕێکی گەورەی گەیاندن و پەیوەندیکردنە، لەگەڵ داهێنان و بڵاوبوونەوەی ئینتەرنێت زۆر بەخێرایی بەشداربووە لە گلۆبالیزمەکردنی کۆمەڵگای مرۆڤایەتی، ناوەناوەش خۆی نوێدەکاتەوە.

پێشکەوتنە خێراکانی تەکنۆلۆجیا لە بواری چەک و مێدیادا(١)، بیرکردنەوە و پلانە ستراتیجییەکانی کۆمەڵگەی مرۆڤایەتی ڕووبەڕووی چەندان پرسیاری قورس و گومان کردۆتەوە، بەتایبەتیش لەنێو جیهانی گلۆبالیزمدا تائێستا مێدیای نوێ لە کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەفریقادا پەیامی خۆی تەندرووستانە نەگەیاندووە، نەخوازەڵڵا لە وڵاتە هەژارەکاندا، هەروەها نەیتوانیوە دیوارە پتەوەکانی وڵاتە سیستەم دیکتۆرەکانیش ببەزێنێت! لەم پنتە زۆر بچووکەی جیهاندا، کە بە کوردستانی عێراق، یاخود باشووری کوردستان ناودێرکراوە، تەکنۆلۆجیای نوێی مێدیایی پێش ڕووخانی دەسەڵاتی سەدام حوسێن بەخێرایی شەقامی ئێرەی داگیرکرد، کە سەرەتا بەهێنانی تەلەفۆنی سەتەلایتی دەستیپێکرد، پاشان پارێزگای سلێمانی بوو بە یەکەمین شار نەک لە باشووری کوردستان، بەڵکو لە هەموو عیراقدا تەلەفۆنمۆبایلی خستە بازاڕ، بەڵام پێویستە ئاماژەش بەوە بدرێت هەر لەگەڵ ڕاپەڕینی ١٩٩١، کە مام جەلال لە سنووری وڵاتی سوریا داخیلی پارێزگای دهۆک دەبێت، تەلەفۆنی سورەیا «پێروو»ی پێبووە، ئەوسا ئامێری وەرگرتن و پەیوەندیکردنەکە بە جۆرێک گەورە بووە، لەناو پیکابێک داندرابوو.

مێدیای نوێ، یاخود وەک لە جیهاندا بەناوی سۆشیال مێدیا(٢) ناوی هاتووە، بە جۆرێک لە جیهان و بەتایبەتیش لە باشووری کوردستاندا بڵاوبۆتەوە، توێژینەوە و بەدواداچوونە ڕۆژنامەگەرییەکان بۆ بەرزبوونەوەی تاوان و تاوانکاری، سۆشیال مێدیا بەهۆکارێکی سەرەکی دادەنێن. لەم بابەتەدا دەرگای لەسەر ئەو بابەتە لە کۆمەڵگەیەکی حیزبی دەکەینەوە، کە ئەو ئامێرە تازەیە و عەقڵی حیزبی چۆن کۆنترۆڵ دەکرێن، هیوادارم بتوانم هێڵێک بۆ چارەسەری ئەو پێکدادانانە بکێشم.

هەڵوەستەکردن لەسەر ئەو هۆکارە لە کوردەواری بەتایبەتیش لەو پارچەیەی بەناوی باشووری کوردستان ناودێرکراوە، خاوەنی کۆمەڵێک تایبەتمەندییە، کە لە کۆمەڵگاکانی تر ناچێت! بە تایبەتیش نائامادەیی فلتەر بۆ بەکارهێنانی هەستیارترین هۆکاری پەیوەندیکردن. فلتەر، نەک سانسۆر و دەسەڵاتی دەسەڵاتداران، تکایە با ئەو دوو زارەوەیە و ئەرکەکانیان تێکەڵاونەکرێن، فلتەر وەک جۆرێک لە موتابەعەکردن لەپێناوی کەمکردنەوەی تاوان و کاریی سیخۆریی!

بابەتەکە دابەشی دوو بەشکراوە، لە بەشی یەکەمدا زۆر بەکورتی باس لە زاراوەکانی سۆشیال مێدیا و کۆمەڵگای حیزبی کراوە، لە بەشی دووەمیشدا ئاماژە بە دەسەڵات و هەڵسوکەوتەکانی حیزب دەدرێت، سەرەڕای دۆزینەوەی چارەسەر، لە ئەنجام و ئامانجدا بابەتەکە پوختکراوەتەوە.




**بەشی یەکەم/ دوو زاراوەی نەگونجاو**

**یەکەم؛ سۆشیال میدیا**

لە بواری میدیادا، تازەترین پێشکەوتنە تەکنۆلۆجییەکان داهێنانی جۆرە میدیایەکە، کە بە میدیای کۆمەڵایەتی یاخود میدیای نوێ ناودێرکراوە و لە زۆربەی وڵاتاندا ناوە ئینگلیزییەکە واتە Social Media بەکاردەهێنرێت، ئەو میدیا نوێیە تەنیا لە ماوەی ١٠ ساڵدا ژمارەی بەشدابوو و بەکارهێنەرانی گەیشتووەتە نزیکەی چوار ملیار کەس، ئەمەش بەراورد بە میدیای کۆن ژمارەیەکی خەیاڵییە، بەتایبەتیش دوای پەخش و خێراکردنی هێڵەکانی ئینتەرنێت، یەکێک لە هۆکارە زۆر خێراییەکانی بڵاوبوونەوەی ئەو تۆڕە کۆمەڵەیەتییە، هەرزانی و خێرایی و دەوڵەمەندییە لە گەیاندن و پەیوەندیکردندا.

ئەو میدیا نوێیە جێگای بەرێژەی بەکارهێنەرانی ڕۆژنامەی کاغەزی «خوێندراو» و ڕۆژنامەی بینراو و ڕۆژنامەی بیستراو لەق کرد، هەر زوو هەر سێ جۆرە ڕۆژنامەگەرییەکە لە تەنیا یەک ئامێری زیرەک کۆکردەوە، لە تەنیا یەک چرکەدا هەواڵەکانی هەموو جیهان دەخاتە بەردەستمان.



**مێدیای نوێ لە کیشوەرەکانی ئاسیا و ئەفریقادا پەیامی خۆی تەندرووستانە نەگەیاندووە، نەخوازەڵڵا لە وڵاتە هەژارەکاندا، هەروەها نەیتوانیوە دیوارە پتەوەکانی وڵاتە سیستەم دیکتۆرەکانیش ببەزێنێت!**



شۆشیال میدیا یاخود هۆکاری پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان، نە یەکەم و نە دوابەرهەمی پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆجیا نیە، کە تەواوی مرۆڤایەتی بەبێ جیاوازی سوودی لێ بینیوە، تەنیا وڵاتە زۆر هەژار و سیستەم تۆتالیتارییەکان نەبێت دەرگای لەسەر ئەو بەرهەمە داخستووە. لە جیهانی پێشکەوتوودا ئەوەی زیاتری سوودی لێ بینووە، بازرگان و کۆمپانیاکانن، واتە پرۆژە ئابوورییەکان باشتر و وردتر و زیرەکتر سوودیان لەو تۆڕە بینیووە، سەرەتا وەک سەنتەرێکی ڕیکلام، پاشان بۆ گۆڕینەوەی پرۆژەی بازرگانی و گۆڕینەوەی فکرە و داهێنا، لە پاڵ ئەمانەشدا حیزب و سیاسەت و بزووتنەوە چەکدارییە و گرووپە ئیسلامییە فێندەمێنتالیستەکان، بەتایبەتیش دوای سەرهەڵدانی بەهاریی عەرەبی هەر لە ساڵی ٢٠١١ ئەو تۆڕەیان لە بەرژەوەندی پەیام و ئامانجەکەیان بەکارهێنا، ئەمە بوو بە خاڵێکی نێگەتیڤ و جێگای هەڵوەستە لەسەرکردن لەلای وڵاتە خاوەن پێگەکانی جیهان، بەڵام تا ئێستاش نەیانتوانیوە ئەو دۆخە بنبڕ و کۆنترۆڵ بکەن!

ئەگەرچی ڕێکخراوی قاعیدە سەرەتا لە ڕێگای نامە و پەیامی تۆمارکراوی دەنگی و ڤیدیۆیی، پاشان بەسوودوەرگرتن لە تەکنۆلۆجیای بەردەستی ئەوێ ڕۆژێ گەشەی بە فکرە و چالاکییەکانیدا، بەڵام سەرهەڵدانی «داعش» دەوڵەتی ئیسلامی لە عێراق و شام (isis) وڵاتە زلهێزەکانی خستە بەردەم مەترسی و پرسێکی گەورەی ڕۆژ، ئایا ئەو ڕێکخراوە چ عەقڵێکی سۆشیال میدیایی ئیدارەی دەدات و چۆن ئاوا بە خێرایی سوودی لە دوا مۆدێلە پێشکەوتنەکانی تەنکۆلۆجیای گەیاندن و پەیوەندیکردن بینووە!

لەنێو ئەو پێشکەوتنە خێراییەدا ژینگەی گەیاندن کاریگەریی ڕاستەوخۆی لە جۆر و شێوە و شێواز و ئامانجی کارەکەدا هەیە، ئەمەش پەیوەستە بە شوێن، ڕاستگۆیی، سەرنجڕاکێشان، پێگە یاخود دەسەڵات «الديهي، ٢٠١٥، ل١٧». لە هەناوی ئەو تۆڕەدا ناوە ناوە داهێنانێکی تازە لە دایک دەبێت، ئەگەر دوێنێ هەر تەنیا ئیمایل و تەلەفزیۆنی سەتەلایت سەرچاوەی گەیاندن و پەیوەندیکردن بووبن، بەڵام ئەمڕۆ خەریکە ڕۆڵی ئەو دوو ناوەندەش لاواز دەبن، ئەمەش دوای هاتنی فەیسبووک، یوتوب، ڤایبەر، ئینستاگرام، تویتەر، سناپچات و تیکتۆک، واتسئاپ و تێلیگرام، با چاوەڕێی داهێنانی تریش بین.

**کۆمەڵگای حزبی:**

لەگەڵ کاڵبوونەوەی شەڕی سارد، دەسەڵاتی حیزب و زاراوەی دەسەڵاتی تاکڕەوی حیزبی ئەو هێزەی نەما، کە پێشتر شانازی بە دەسەڵاتەکەی دەکرد، بەڵام ئەمە بەو واتایە نایەت، کە ژیانی پەرلەمانی و پێکهاتەی حکومەت بەدەر بێت لە حیزب و ڕێکخراوی سیاسی، چونکە بۆ شێوە پێکهاتەی تازەی حیزبی دەبێت بەدوای ئەڵتەرناتیڤێک بگەڕێین، کە ژیانی دیموکراتی بپارێزێت، نەخوازەڵلا بۆ هەڵبژاردنە پەرلەمانییەکان، ئەوەی من چاودێریم کردووە، لە وڵاتە دیموکراتەکانیشدا شێوە پێکهاتە و ئایدیۆلۆجیا و فەلسەفەی کاری حیزبی وەک پێشوو نەماوە، چونکە بەرنامەی حیزبەکان لەکاتی هەڵبژاردندا زۆر جیاوازیان نییە و لە چەندان بڕگە و ڕستە و دەستەواژە و چەمکدا لە یەکتر دەچن، تا ئاستێک کۆپی یەکن، ئامانجی حزبیی لە باشووی کوردستانیش پێناسە و ناسینەوەی حیزبی ئاڵۆز و ونکردووە.

پێشکەوتنە تەکنۆلۆجییەکان لە باشووری کوردستاندا دوای ساڵی ١٩٩١ دەرگای بۆ واڵاکرا، بەتایبەتیش دوای ئەوەی وشەیەک نەما بەناوی سانسۆر. هێشتا هەڕەشەکانی سەدام حوسێن مابوون، لە شاری زاخۆ و سلێمانی لە ڕۆژانی گەرمی ڕاپەڕیندا یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان بەسوودوەرگرتن لەو کەلوپەلە تەکنۆلۆجیایانەی کە ڕژێمی ڕووخاو بۆ بواری سیخوڕیی و سەربازی بەکاریدەهێنا دەستی بەدانانی تەلەفزیۆن کرد، پاشان حزبەکانی تریش کەناڵی تەلەفزیۆنی تایبەت بە خۆیان دامەزراند. لە ڕۆژگاریی شۆڕشی پێشمەرگانەشدا بەگوێرەی پێشکەوتنە تەکنۆلۆجیاییەکان سوود لە ئامێرە پێشکەوتووەکان وەرگیراوە وەک؛ بێتەل، تەلەفۆن، فاکس، چاپەمەنی «ئەحمەد، ٢٠١٧».

ساڵی ١٩٩٢ لە باشووری کوردستان هەڵبژاردن کرا و حکومەتی هەرێمی کوردستان پێکهات، هەر زوو پەرلەمان یاسای حیزبەکان و یاسای ڕۆژنامەگەریی دەرکرد، بەڵام ئەوە ٣٠ ساڵە ئەو کۆمەڵگایە لەژێر هەژموونی دەسەڵاتی حیزبی دەربازی نەبووە، بەڵکو ساڵ بە ساڵ حیزبەکان بە پلانی داڕێژراوی ڕێکخراو، پێگەی حیزبەکانیان لە بوارەکانی بازرگانی، ئابووری، میدیایی بەهێز دەکەن و لەوپێناوەدا شەڕی پێگەداکوتانی زیاتر دەکەن، ئەوە چەند ساڵێکە لەپاڵ کۆنترۆڵکردنی پێگەی ئابووری خۆیان، لە ڕێگای جۆرەها شێوە و شێوازی میدیایی بەتایبەتیش لە بواری سۆشیال میدیادا کوردەوارییان ڕووبەڕووی چەندان پرس و تەنگژە کردۆتەوە، کە کاریگەرییان لەسەر پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان هەیە، هاوڵاتی هەتا گومان لە پەیوەندییە تەلەفۆنییەکانیشی دەکات، تۆ بڵێیت تۆمار نەکرێن!؟ گومان کۆمەڵگە بەرەو نەخۆشی دەروونی دەبات و شیرازەی خێزانیش تێکدەدات.

ڕۆژانە هاوڵاتی چەندین پرسیار دەکەن، بۆچی ئەو حیزبانە ڕۆژانە پارەیەکی زۆر لە سۆشیال میدیا سەرف دەکەن؟ بۆچی تا ئێستا میدیایەکی نیشتمانیمان نیە؟ بۆچی ڕۆژانە ڕێژەی توندوتیژی و تاوان بەرزدەبێتەوە؟ ئەگەر شیرازەی کۆمەڵگە تێکچوو، بە چ هۆکار و ئامێر و شێوازێک ئەو کۆمەڵگایە تەندروست دەکرێتەوە؟ ئایا ئەو سەدان بەرنامە تەلەفزیۆنی و سۆشیال میدیایەی ڕۆژانە پێشکەش دەکرێن، چڵێسی گەنج و دۆخی خراپی ئابووری لە زاکیرەی هاوڵاتی دەسڕنەوە؟ ئەمانە ئەو پرسانەن لە قەوارەیەکی بێ پێناسەدا، حیزب و ژیانی حزبی دروستی کردوون.

**بەشی دووەم/ حیزب و میدیا**

**کانتۆنی میدیای حزبی:**

ڕووبەرێک هەیە ناوی هەرێمی کوردستانی عێراقە، سی ساڵە حیزب جومگەکانی مۆنۆپۆڵی کردووە، ئێرە نموونەیەکی زۆر شازە لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا، مەگەر لە مێژووی دوێنێی بلۆکی سۆشیالیستی نموونەی لەو جۆرە هەبووبێت، بەڵام خۆ ئەوان پەرلەمانێکی هەڵبژێردراویان نەبوو!

بەهاتنی میدیای نوێ و پێگەداکوتانی گلۆبالیزم، حزبی کوردی تەنیا دیوێکی ئەو سیستەمەی وەرگرت، کە لە بەرژەوەندیدایە، پارەیەکی بێشومار خراوەتە خزمەتی ئەو بوارە بەبێ ئەوەی ناوەندێکی ڕەسمی بتوانێت چاودێری سەرچاوەی دارایی ئەو پارەیە بکات! لەگەڵ پێشکەوتنەکانی تەکنۆلۆجیادا حیزبی کوردی سوودی لە دواجۆر و مۆدێلەکانی ئەو تەکنۆلۆجیایە بینووە، سەرەڕای ئامێرە حەساسەکان، ماوەیەکە بۆ وێنەگرتن و بەدواداچوونی ڕووداوەکان ئامێری درۆن بەرەو ئاسمان دەفرێنێت! بەخوێندنەوەی وردی دۆخەکە دەگەینە ئەو ئەنجامەی، کە حیزبی کوردی لە بواری سۆشیال میدیادا هەڵگری زاراوەی کانتۆنی میدیایی تایبەت بەخۆیەتی، ڕۆژانە چەندان

پەیج و سایت و پێگەی ئەلیکترۆنی نوێ دەکاتەوە و بەجۆرەها ناو و ناونیشان و لۆگۆ گەمە بە ژیانی دەروونی تاکی کورد و خەڵکی کوردستان دەکات.

هەتا ئێستا لە هەرێمی کوردستاندا سۆشیال میدیا نەیتوانیوە ڕای گشتی کوردستانی دروست بکات، چونکە هەر لە سەرەتاوە، ئەو میدیایە کلێشەیەکی حیزبی بۆ دووراوە و ڕووداوەکان بەو کلێشەیە ساز دەکات، بەڵام لە وڵاتاندا «ئەو جۆرە میدیایە بە جۆرێک تەفاعولی لەگەڵ کۆمەڵگە کردووە، شوێنپێی بە حیزب و پێگەی حیزب و کۆمەڵی مەدەنی لەق کردووە، کە توانای سەرکردایەتیکردنی ڕایگشتی هەیە. «الدخیل، ٢٠١٩/١/١، جريدة الغد (alghad.com)».

لە هەرێمی کوردستاندا، هەر تەنیا حیزبێک یاخود دووان و زیاتر، خاوەن کانتۆنی سۆشیال میدیایی نین، بەڵکو زۆربەی حیزبەکان بەگوێرەی گیرفان و سەرچاوەی ئابوورییان جۆرێک لە کانتۆنی میدیایان هەیە و ڕۆژانە پەیام و ئامانج و بانگەوازیان دەبینین و گوێمان لێیان دەبێت، ئەو توندوتیژیی و لێکحاڵینەبوون و ئاڵۆزییەی ڕۆژانە کێرڤی لە کوردەواری بەرزدەبێتەوە، سەرچاوەکەی بریتییە لەو کانتۆنە میدیاییانە.

**یاسا چی دەکات؟**

میدیای ئێمە تووشی تەنگژەی پێناسە و پەیامی پیشەیی بووە، ڕێژە هەرە بەرز و زۆرەکە بۆ ڕۆژنامەگەریی تەرفیهی دەچێت! مەگەر لە وڵاتی تورکیا و وڵاتە عەرەبییەکاندا بەو جۆر و ڕێژە زۆرە گرنگی بە ڕۆژنامەگەریی تەرفیهی بدرێت! ئامانجی ئەو وڵاتانەش ڕوون و ئاشکرایە، کە بە چ مەبەستێک دەرگایان بۆ ئەو جۆرە میدیایە کردۆتەوە، من دژی ڕۆژنامەی تەرفیهی نیم، بەڵام پێویستە بە یاسا و بڕیار و ڕێنمایی کارەکانیان ڕێکبخرێت، لە وڵاتە دیموکرات و پێشکەوتووەکاندا ئازادی تاک بەواتای لە یاسا دەرچوون نیە!

پەرلەمانی کوردستانی عێراق ساڵی ١٩٩٢ دامەزراوە و دامەزراوەی یاسادانان و بەدواداچوونە، بۆ بواری ڕۆژنامەگەریی و ڕۆژنامەنووسان تائێستا ئەم یاسایانەی دەرکردووە؛ (یاسای چاپەمەنی، یاسای بڵاوکردنەوەی لە ڕۆژنامەی ڕەسمی وەقائیعی کوردستان، یاسای سەندیکای ڕۆژنامەنووسانی کوردستان، یاسای سندوقی ڕۆژنامەنووسی، یاسای خراپ بەکارهێنانی ئامێرەکانی پەیوەندیکردن، یاسای مافی بەدەستهێنانی زانیاری، یاسای ڕێکلامی بازرگانی)، هەروەها (یاسای بەرەنگاربوونەوەی تیرۆر)، کە ئەمەش لە چەند برگەیەکیدا پەیوەستە بەکاری ڕۆژنامەگەرییەوە، لە ڕۆژانی ڕابردووشدا خوێندنەوەی دووەم بۆ (یاسای پاراستی بەڵگەنامە لە هەرێمی کوردستاندا) کراوە، شەش مانگ لەمەوبەریش خوێندنەوەی یەکەم بۆ (یاسای میدیای ئەلیکترۆنی) کرا، بەڵام لێکناحاڵیبوونێک بۆ پرۆژە ئاساکە لەلای چەند ناوەندێکی میدیایی و ڕۆژنامەنووسان هەبوو، بۆیە لیژنەی ڕۆشنبیری لە پەرلەمانی کوردستان پێشنیازی بۆ سەرۆکایەتی




پەرلەمان کرد، کە جارێ ئەو پڕۆژە یاسایە ڕابگیرێت، بەگوێرەی زانیارییەکان بەمزووانە جارێکی تر ڕەشنووسەکە دەخرێتەوە بەرباس و گفتوگۆوە.
ئەگەرچی ئەو یاسایانە، وەک هەر یاسا و بڕیارێک لە جیهاندا لەکاتی پێویستدا هەموارکراونەتەوە، بەڵام بۆچی گلەیی لە جێبەجێنەکردنی یاسا بەسەر تەواوی تاکەکانی کوردەواری دەکرێت؟ ئەو کەموکورییەش وابەستە دەکەین بە دەستێوەردانەکانی حیزب لە کاروباری دادگادا، کە لەپێناو پێگەی حیزبی خۆی هانا بۆ چەند کار و کردەوەیەک دەبات، وێنەی ئەم هەرێمەی لە دۆسێی نێودەوڵەتیدا لاواز و تا ئاستێک ناشیرین کردووە، پێویستە پەیوەندی دادگا و کاری ڕۆژنامەنووسی و ڕۆژنامەگەریی لە حاڵەتەوە بۆ دیاردە بگۆڕدرێت.

## چارەسەر چییە؟

لەم چەند ڕستەیەدا چارەسەرەکان کورتدەکەمەوە؛
- لە بواری ڕۆژنامەگەریی، کاری سۆشیال میدیا بە یاسا ڕێکبخرێت.
- دەستێوەردانی حیزبی لە پەیوەندی دادگا و کاری ڕۆژنامەنووسی نەمێنێت.
- بڵاوکردنەوەی هوشیاریی کاری سۆشیال میدیایی، بزانرێت ئەو دیکتاتۆرە تازەیە لە جیهاندا چۆن مامەڵەی لەگەڵ بکرێت.
- پاراستنی بەها نەتەوەیی و نیشتمانییەکان، لەپێناو پاراستنی کوردەوارییەکی تەندرووستدا.
- ئابووری سەربەخۆ لە کاری میدیادا.
- پێویستە باجدان بواری میدیاش بگرێتەوە.

پوختەی بابەت:

لە کۆتایی ئەم باسەدا پوختەکەی بەم شێوەیە هاتە ئەنجام؛
- میدیای ئێمە، بەتایبەتیش سۆشیال میدیا لە تەنگژەیەکی گەورەدا دەژی.
- هاوڵاتیان و ڕۆژنامەنووسانی بواری سۆشیال میدیا، ئەو میدیایە تەنیا وەک کەناڵێکی تەرفیهی دەناسن.
- سۆشیال میدیا، کوردەواری ڕووبەڕووی پەرتەوازیی کردووە و زیانی لە بەهاکانی کۆمەڵگە داوە.
- حیزب و ڕێکخراوە سیاسییەکان لە هەرێمی کوردستاندا، خاوەنی کانتۆنی سۆشیال میدیایی تایبەت بە خۆیانن و بە ڕێکخراوەیی کاری لەسەر دەکەن.
- سۆشیال میدیا پێناسەی کاری ڕۆژنامەگەریی ڕاستەقینەی ئاڵۆز و ونکردووە.
- بەهۆی خراپ بەکارهێنانی سۆشیال میدیا ڕێژەی تاوان لە بەرزبوونەوەدایە.
- نەبوونی یاسای تایبەت بەو کەناڵە میدیایە، خەڵک باوەڕی بەو میدیاییە لاواز بووە.

## پەراوێزەکان

١ - زاراوەی « مێدیا»م لە زاراوەی «میدیا» پێ ڕاستترە، لەو ڕووەوە دەکرێت سەیری بابەتێکم لەم کتێبەم بکرێت: نەوزاد عەلی ئەحمەد، ڕۆژنامە لە کتێبدا، بەرگی چوارەم، هەولێر ٢٠١٤، ل١٨٠.

٢ - ئەگەرچی لە زمانی ئینگلیزی سۆشیال مێدیا Social Media به دوو وشە نووسراوە، واتە بۆشایی لەنێوان سۆشیال و مێدیادا هەیە، کە خۆی لە بنەمادا دوو وشەی سادەن، دوای لێکدانیان یەک واتا دەگەیەنن، کەواتە ئەگەر پێڕەوی یاسای جۆرەکانی ناو لە زماندا بکەین، پێویستە هەردوو وشەکە لێکبدرێن.

## سەرچاوەکان


١- نەوزاد عەلی ئەحمەد، ڕۆژنامە لە کتێبدا، بەرگی چوارەم، هەولێر، ٢٠١٤.

٢- نەوزاد عەلی ئەحمەد، مێدیای نوێ لە سوید و باشووری کوردستان، لێکۆڵینەوەیەکی بەراوردکارییە لە دوو کۆمەڵگای جیاوازدا ( ساڵی ٢٠١٧ تەنیا لە کۆنفرانسێکدا پێشکەشکراوە تا ئێستا بڵاونەبۆتەوە).

٣- زايد الدخيل، مواقع التواصل تتقدم على الاحزاب و تتفوق عليها بقيادة الراي العام، جريدة الغد، ٢٠١٩/١/١، (alghad.com)

٤- محى الدين اسماعيل محمد الديهي، تاثير شبكات التواصل الاجتماعى الاعلامية على جمهور المتلقين، الطبعة الاولى، الناشر مكتبة الوفاء القانونية، مصر الاسكندرية، ٢٠١٥.



كاروان عەبدوڵڵا هەورامی

# ستراتیژی بەڕێوەبردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە خێزاندا

## مرۆڤەکان ئامرازگەلێک دەسازێنن کە دواتر دەبنەوە سازێنەری مرۆڤەکان

پێشەکی

یەکێك لە گرنگترین ڕارایی و خەیاڵەکانی خێزان بۆ پەروەردەکردنی نەوەکان لەم سەردەمی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و هاتنە ئارای فەزای مەجازیی ئەو ژیانە گریمانەییەیە کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دروستیان کردووە، هاوکات لەگەڵ ئەو گۆڕانکارییانەی کە لە ساتی ڕوودانداندا. دونیای گریمانەیی و لەنێویدا تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان سیستم و مەودایەکی فراوانی گەشەکردووە کە تەواوی لایەنەکانی ژیانی مرۆڤایەتی گرتووەتەوە، بارودۆخێکی زۆر دژوار و ئاڵۆزی دروستکردوە و دەستی وەرداوەتە تەواوی سێکتەرە جیاوازەکانی ژیانی مرۆڤایەتی. لەنێو ئەو سێکتەرانەدا بابەتی پەیوەندیی و کۆمینیکەیشنی سەد دەرسەد گرتووەتە دەست و کۆنترۆڵی کردووە، تەواوی زانیاریی و گەیاندن و وەرگرتنی زانیارییەکان و دروستکردنی پەیوەندییەکان لەڕێگەی ئەوەوە دەبن، تەنانەت میدیای کلاسیك وەك تەلەفزیۆن و سەتەلایت گواستنەوەی زانیارییەکانیان لە ڕێگەی لینك و بەستەری (تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان)ەوە ئەنجام دەدەن، بەو مانایەی ڕژاونەتە نێو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و لەوێوە پەیوەندی لەگەڵ وەرگردا دروست دەکەن.

سێکتەری دووەم کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و ئەو دونیا گریمانەییەی کە دروستیکردووە و دەستێوەردانی تێدا دەکەن، بابەتە فێرکارییەکانن لە ڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و بەڕێوەبردنی پرۆسەی فێرکردن لە فەزای مەجازیدا، کە ئەم هەنگاوەیان لە چەند ساڵی ڕابردوودا بەشێوەیەکی بەرچاو گەشەی کردووە، بەتایبەت دوای هاتن و بڵاوبوونەوەی نەخۆشی کۆرۆنا پرۆسەی فێرکاریی و خوێندن گوازرایەوە بۆ نێو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و ئەو دنیا گریمانەییەی کە هاتووەتە ئاراوە.

سێکتەرێکی تر بابەتی سەلامەتی و تەندروستییە کە، ساڵانێکە هەوڵ بۆ ئەوە دەدرێت بەتەواوی ئەم سێکتەرە لەلایەن تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە کۆنترۆڵ بکرێت، دیسانەوە بڵاوبونەوەی ڤایرۆسی کرۆنا گوژمەیەکی باشی بە بەرەو پێشچوونی ئەم بابەتەدا. هەروەک سێکتەری ئابووریش بەهەمان شێوە دەستێوەردانی بەرچاوی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی بەخۆوە بینیوە، کە لەم سێکتەرەدا بە بابەتی بلاکچین و بیتکوین و هاوشێوەکانی دەستپێکردووە. ئەم بارودۆخەی کە هاتووەتە ئاراوە وایکردووە، کە نەتوانین ناوی هیچ سوچ و بەشێکی ژیان ببەین کە (تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان) دەستی پێنەگەیشتبێت. لەسەر ئەم بنەمایە ڕەتکردنەوە و وەلانانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەتایبەت و دنیای گریمانەیی بەگشتی لەنێو ژیانی مرۆڤایەتیدا لە هیچ بارودۆخێکدا ناگونجێ.

ئەوەی دەکرێت و مرۆڤ ئەمڕۆ کاری لەسەر دەکات لە بەرانبەر پێشکەوتنەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان مامەڵکردنە لەگەڵیدا بە ستراتیژ و هەنگاوگەلێک کە ئاڕاستەی کار و بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەرەو شەقامی سودوەرگرتن ببات لەنێو خێزان بەتایبەتیی و ژیانی مرۆڤایەتی بەگشتی. بەڕێوەبردنی دروستی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەنێو خێزاندا بابەتێکە کە لەم سەردەمەدا و لە ناوەندە ئەکادیمییە کۆمەڵایەتیی و میدیاییەکاندا کاری لەسەر دەکرێت و بووەتە ڕشتەیەکی هاوبەشی نێوان کۆمەڵناسیی و ڕاگەیاندن.

لەم نوسینەدا لەبارەی بەڕێوەبردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەنێو خێزاندا چەند ستراتیژێک دەخەینە ڕوو بەئامانجی دۆزینەوەی ڕێکارەکان بۆ بەڕێوەبردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەنێو خێزاندا.

## دیارترین تایبەتمەندی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان:

ئەم دنیا گریمانەییە نوێیە مەودایەکی فراوانی بۆ پرۆسەی فێرکاری هێناوەتە بوون، هەرشتێک لە زانیاریی و بابەتی فێربوون بخوازین لەڕێگەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە دەتوانین دەستی پێ بگەیەنین، ئەم فەزایە پەیوەندی تاک و گرووپەکانی بە ئاستی باڵا گەیاندووە و شوێن و کوچەیەک نەماوە کە نەتوانین دەستمان پێی بگات. لەگەڵ ئەوەشدا بووەتە مەیدانی بنکۆڵکردن و بەدواداچوون و لێکۆڵینەوە لەسەر هەر بابەتێکی زانستی و ڕەفتاری کە بمانەوێت. زیاد لەمەش فەزای مەجازی بووەتە گەورەترین مەیدانی خەرج و بەکارهێنان لە بواری فەرهەنگیی و کۆمەڵایەتی و بوونییەکانی تری ژیان کە هەر لەوەوە شکڵی خۆیان وەردەگرن.

**ناهەمواریيەکانی فەزای مەجازی بۆ خێزان:**

لەگەڵ تایبەتمەندییە پڕ گەوهەرییەکەی ئەم فەزایەدا چەندین ناهەمواری بەدەنی و دەروونی بۆ تاکی نێو خێزان هێناوەتە ئاراوە. لە گرنگترین دەرکەوتەی ناهەمواری ئەم فەزایە بۆ تاکی خێزان بەهەدەردانی کات و ناهەوسەنگی ڕەفتارەکانە، زۆرکات تاک نیوەی ڕۆژی لەنێو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و فەزای مەجازیدا بە هەدەر دەگوزەرێنێ، چوون ڕوون نیە لای بەدوای چیدا وێڵە لەم فەزا فراوانەدا، یاخود توانای سودوەرگرتنی لەو ئامراز و هەلەی لەبەردەستیدایە نییە، ئەگەرچی لە ئەمڕۆدا بەرنامە و ئەپلیکەیشنی زۆر هاتوونەتە ئارا کە ئاڕاستەی ئەوەمان بکەن سود لەو هەل و ساتانە وەرگرین کە لە بەردەمماندان. نا هەمواری دووەم و دیاری تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە بەردەوام و بەبێ لەپێشچاوگرتنی حاڵەتە جیاوازەکانی بەدەن و ڕۆحی مرۆڤ دەچینە نێو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و فەزای مەجازییەوە و دەرگیر دەبین لەگەڵ ڕووداو و کارەسات و ڕا و بۆچوونە جیاوازەکاندا، ئەمەش جگەلە دروستکردنی گرفتی بەدەنی ئاڵۆزی لە بیر و ڕۆح و دەروونماندا دروست دەکات.

لەلایەکی ترەوە ڕەخسێنەری زەمینە و بارودۆخی لەبارە بۆ زیادەڕۆشتن و زیادەڕەوی (انحراف) لە زۆر لایەنی ژیانی مرۆڤایەتی بەتایبەت توندئاژۆیی و لادانی جنسی و خەرج و مانەوەی لە خەڵوەتی واقیعیدا، مامەڵە فەرهەنگیی و کۆمەڵایەتی و فیکریی و ڕەوشتییەکان، چونکە مرۆڤایەتی بەزۆری بە ڕێکاری واقیعی دەستی بە حاڵەت و ڕەفتارەکانی نێو ئەو دنیایە نەگەیشتووە.

لە دنیادا کۆمپانیاگەلێکی گەورە هەن کە بۆ ڕێگری لە زیادەڕەویی و ئینحیراف کار لەسەر مۆدێلەکانی ژیان دەکەن، هەروەها بەرنامە و ئەپلیکەیشنی جۆراوجۆر بۆ ئەو مەبەستە بەرهەم دەهێنن، تا بتوانن بەشێک لەو زیادەڕەویان کەم بکەنەوە، بەشەکەی تری دەگەڕێتەوە بۆ خودی مرۆڤ و ئەو ئیرادەیەی کە هەیەتی.

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەگەڵ ئەو تایبەتمەندییانەی کە وایکردووە پێشگیری لە ژیانی کۆمەڵایەتی و هەنگاوەکانی تاک بکات بۆ پێشکەوتن خاوەنی چەندین تایبەتمەندیشن کە وایکردووە هەل بڕەخسێنێت لە بەردەم تاک و کۆمەڵ بۆ سودوەرگرتن لێی لە قۆناغ و لایەنە جیاوازەکانی ژیاندا، یەکێک لەو هەلە بەرچاوانە کە لە ئەمڕۆی گەشەی فەزای مەجازیی و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە بەردەم تاک و کۆمەڵگەدایە بریتییە لەو تایبەتمەندییەی کە وایکردووە دەرگا بەڕووی پرۆسەی فێرکردن و وەرگرتنی زانست و زانیاری بەڕووی کۆمەڵگادا بکاتەوە بەڕێکاری ئاسان لە گەیاندن و ڕوونی لە فێرکردندا، بەجۆرێک تاک دەتوانێت لەڕێگەی ئەم دنیا گریمانەییەوە ئاشنای هەر بابەتێک بێت کە لەهەر گۆشەیەکی دنیادا خرابێتە ڕوو و باسی لەسەر کرابێت، لەهەمانکاتیشدا دەتوانێت فێربێت و هەموو ڕێکارەکان

لێوەی وەربگرێت، هەروەک ئەوەی لە زانستگەیەکی پێشکەوتوودا فێری دەبێت.

ئەم فرسەت و هەلە بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی لە خزمەت هیچ نەسلێکدا نەبووە. ئەمە بە جیاکاری لە پێغەمبەران کە پەیوەندییەکی بەهێزی جیاکارییان لە گەردووندا هەبووە، هەربۆیە ئەم تایبەتمەندییە بێوێنە و نادرە لە مێژووی بەشەریەتدا و پڕ سودە بۆ ژیانی مرۆڤایەتی ئەم سەردەمە، ئەگەرچی هەتا ئێستا زۆرێک لە مرۆڤایەتی نەیتوانیوە ئەو سودە لەم دنیا گریمانەییە ببینێت. لەلایەکی ترەوە تایبەتمەندی تۆڕەکۆمەڵایەتیان هەلێکی تری خستووەتە بەردەم مرۆڤایەتی کە بتوانێت لە کەمترین کات و لە دورترین شوێنی دنیاوە پەیوەندی لەگەڵ تاک و کۆمەڵدا دروست بکات، کە پەیوەندییەکیماڵتی میدیاییە و لە ڕێگەی دەنگ و ڕەنگ و نوسینەوە بەرقەرار دەبێت.

جگە لەمە تایبەتمەندی زیادکردنی هەلی کار بۆ تاکی کۆمەڵگە و کردنەوەی دەرگای بازاڕی فراوان بەڕووی کاسب و کاری خەڵکدا کە بە هەزاران کەسی خستووەتە کار، ئەگەرچی بازاڕی کلاسیکی بەرەو ئاقاری داڕمان دەبات، بەڵام هەلی کاری زۆر بەرەو پێش و زیاد بردووە. بەجۆرێک کەسانێک کە ئەم ڕاستییەیان درک پێکردووە و توانیویانە بچنە نێو ئەو بازاڕەوە و سودی زۆریان لێ بینیوە و بوونەتە بازرگان و سەرمایەی زۆریان بەدەستهێناوە. تەنانەت ئەو تایبەتمەندییە وایکردووە کە ئازادییەکی بەرفراوانی بازاڕی هێناوەتە ئارا بەجۆرێک کە کاری لەسەر گۆڕینی زۆر یاسای بازاڕ و بازرگانی کردووە و هەندێک لە وڵاتان یاسای نوێیان لەوبارەوە دەرکردووە.

**خێزان لە سەردەمی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا:**

بەلەبەرچاوگرتنی ئەو هەڕەشانەی کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەیانە لەسەر خێزان ئەو فرسەت و هەلانەی کە بۆ خێزانی دروستکردووە، لەلایەک تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەنێو خێزاندا بارودۆخێکی سەختی هێناوەتە ئارا بەوەی کە گرفت و کێشەی لەنێو خێزاندا زیادکردووە و خستویەتییە بەردەم چەندین کێشەی نوێی کۆمەڵایەتی و دەروونی و بەدەنییەوە، لەلایەکی ترەوە چەندین هەل و دەرفەتی خستووەتە بەردەم خێزان بۆ گەشەی تاک و خێراتر و ئاسانترکردنی پرۆسەی فێرکردن و ئاڵوگۆڕی زانیاریی و گەشەی پەیوەندییەکان.

لەم نێوەندەدا خێزان دەخاتە بەردەم داڕشتن و ئیجراکردنی چەندین ستراتیژی نوێ لەنێو خێزاندا بۆئەوەی بتوانێت مامەڵە لەگەڵ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بکات و دەرگایان لێبکاتەوە بەجۆرێک کە زیان لە ژیانی تاک و خێزان نەدات و سودیش لەو هەلە گرنگانە وەرگرێت کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان پێشکەشی دەکەن، بەمەش دەوترێت بەڕێوەبردنی ستراتیژی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەنێو خێزاندا.




## ستراتیژیەتی بەڕێوەبردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە خێزاندا:

بونیاد و پێکەوەنانی خێزان لە زانستی کۆمەڵناسیدا لەو هەموو سیستمە هاوبەشە کۆمەڵایەتییە پێکدێت کە تاکەکان پێکەوە دەبەستێتەوە و بەردەوام گەشە بە پەیوەندییەکانی نێوانیان دەدات و پەیوەستی بەهێز لە نێوان ئەواندا دروست دەکات، ئەو بونیەیە چ دین بێت یان هەر سیستمێکی تر کە پەیڕە بکرێت وەک فەرهەنگ و سیستمە کۆمەڵایەتییەکانی تر، هەموو ئەمانە بەپێی قۆناغە مێژووییەکان دەکەونە بەردەم گۆڕانکارییەکانی ژیانی مرۆڤایەتی و بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ لە ڕەوتی ژیانیدا، بۆ هەر سات و گۆڕانکارییەکیش ڕێکار و ستراتیژی نوێ لەنێو خێزاندا دێنە ئارا بۆ بەڕێوەبردنی ئەو گۆڕانکارییە لەپێناو مانەوەی خێزان و ئەو پەیوەستییەی کە هەیانە.

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و فەزای مەجازی لەم سەدەیەدا یەکێکە لەو گۆڕانکارییە تەکنەلۆژییانەی کە هاتووەتە نێو خێزان و کاریگەری ڕەفتاریی و دەروونی و بەدەنی لە ژیانی تاکی خێزاندا دروستکردووە، خێزان وەک هەر گۆڕانێکی تر گەورە یان بچووک هەوڵی مامەڵەکردن دەدات لەگەڵ گۆڕانکارییەکە و بەرگری لە پاراستنی پەیوەستییە خێزانییەکە دەکات لەنێو تاکەکانیدا، بۆ ئەمەش پەنادەباتە بەر داڕشتنی ستراتیژی نوێ بۆ سەوداکردن لەگەڵ ئەو گۆڕانکاریی و کاریگەرییەدا.

بۆ ئەمەش زانستە پەیوەستدارەکان بە لایەنی گۆڕانکاریی و خودی خێزان دەست بە داڕشتنی ستراتیژی نوێ دەکەن بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو گۆڕانە و بەرگریکردن لە کاریگەرییەکانی و خۆکەناردان لە زیانەکان و ئەو هەڕەشانەی ڕووبەڕووی دەبنەوە، هەروەها کەڵوەرگرتن لە دەرفەت و هەلانەی کە گۆڕانکارییەکە دەیانڕەخسێنێت. لێرەدا چەند ستراتیژێک بۆ بەڕێوەبردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لە خێزاندا دەخەینە ڕوو:

### یەکەم. تێگەیشتنی دروست

لە خێزاندا دایک و باوک و گەورەکانی تر تێگەیشتنی دروست بەرانبەر بە گۆڕانکارییەکان پەیدا بکەن، بەجۆرێک هەموو لایەنەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بەو بارودۆخانهی کە دەیخولقێنن و ئەو فرسەت و هەلانەی دەیخەنە بەردەم خێزان. تا ئەو ڕادەیەی ئەبێت بگەینە ئەو تێگەیشتنەی کە ڕەتکردنەوە و ڕێگری لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەنێو خێزاندا هەوڵێکی ناکام و نەگونجاوە، زیاد لەوەش تێبگەین کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان تەنها فەیسبووک و تیلیگرام نین، بەڵکو مەودا و بوارێکی زۆر پێشکەوتوو و گەشەکردووی دژوار و ئاڵۆز و درێژخایەنە، هەروەکو چۆن پێویستە ئەو تێگەیشتنەشمان هەبێت کە فەزای مەجازی بەردەوام لە گەشەکردن و فراوانتر بووندایە، ئەگەر ئەم تێگەیشتانەمان بۆ دروست نەبێ ناتوانین بزانین کە چ ڕووداوێک لەم نێوەندەدا ڕوودەدات، خێزان لە بەردەم چ گۆڕانکارییەکدایە.

**دووەم: ئاشنایی تەواو بە لێهاتوویی و تواناکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان**

بۆئەوەی خێزان بتوانێت بەتەواوی دەرکی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان بکات و کار بە ستراتیژی یەکەم بکات ئەبێ زۆر ئاشنای ئەو توانا و لێهاتووییانە بێت کە لە دەروونی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان حەشاردراوە و هەمووان کاری لەسەر دەکەن، بەو واتایەی کە خۆیان لەنێو ئەم کایەدا ڕاهێنان بکەن، بەجۆرێک بەکارهێنەربن و بزانن چی لەبارادایە و ئەو گرفت و دژوارییانە چین بەهۆی ئەم تۆڕەکۆمەڵایەتییانەوە دەرژێنە خێزانەوە.



**تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لەلایەك بارودۆخێکی هێناوەتە ئارا بەوەی کە گرفت و کێشەی لەنێو خێزاندا زیادکردووە و خستویەتییە بەردەم چەندین کێشەی نوێ لەلایەکی تروە چەندین هەلی خستووەتە بەردەم خێزان بۆ گەشەی تاك و ئاسانترکردنی پرۆسەی فێرکردن و ئاڵوگۆڕی زانیاریی و گەشەی پەیوەندییەکان.**



گەورەکانی خێزان بەو تێگەیشتنەی کە هەیانە بۆ ئیدارەدانی خێزان پێویستە بەشێک لە کاتیان ڕۆژانە خەرجی ئەو کایە کۆمەڵایەتییە بکەن و کوچە و کۆڵانەکانی شارەزابن، چونکە کاتێک کە ناتوانرێت دەرگای چوونە نێو ئەو کایە ببەندرێت پێویستە ڕێنیشاندەری نەوەکان بێت بۆ ئاڕاستەکردنیان بە کۆڵانە ڕۆشنەکانی ئەو کایە کۆمەڵایەتییە. بەپێچەوانەوە گەر ئاشنا نەبیت و نەشتوانی دەرگاکەی دابخەی ئەو کات هیچ ئیدارەدانێک لە دەست پەروەردەکاردا نییە.

**سێیەم: بەهرەگیری لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان**

ئەو بەهرانەی کە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکاندا بوونەتە دەستکەوتێکی گشتی و بەکارهێنانی توانا تیایاندا گەشەی زانستی و پیشەیی دەداتە وەرگران، پێویستە کە گەورەکانی خێزان فێریان ببن و ئاشنایان بن، کە زیاتر خۆیان لە گەشت و پەرەپێدانی پەیوەندییەکان و بەهرەکانی تەکنەلۆژی بازاڕی تەکنەلۆژییە، ئاشنایی بەمانە واتە ئیدارەدانی بەکاربەری ناو خێزانەکەی بۆ بەکارهێنانی ئەم کایە لە پەرەدان بە پیشە و کار و گەشەی ڕۆشنبیر و پەیوەندییەکان، چۆن ئاشنایی دایک یان باوک بۆ پرۆگرامەکانی خوێندن لە پرۆسەی پەروەردەدا دەبێتە هۆی گەشەی فێربوون بۆ نەوەکانی هەرواش ئاشنایی و بەهرەگیری لەم کایەدا مایەی گەشەی بەکاربەرانە لە کایەکەدا تا بەهرەکان ببەخشێتەوە بەنێو خێزاندا.

### چوارەم: توانای پلان و بەرنامەدانان

هەموو ستراتیژ و بابەتە ستراتیژییەکان بۆ بەڕێوەبردنی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان تەنها لەنێو کایەکەدا نین، بەڵکو هەندێک لە ستراتیژەکان لە دەرەوەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە کار لەسەر سیستمی بەڕێوەبردنی خێزان بۆ تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەکەن، هێز و توانای بەرنامەڕێژی بۆ خێزان و نەوەکان حاکمە بەسەر کۆنترۆڵی هەر دیاردەیەکی باو یان نا باو لە خێزاندا، پەروەردەکاران ئەبێ توانای پلانی نێو خێزان و بەرنامەڕێژییان هێندە بەهێز بێت کە بتوانێت کاریگەربێت لەنێو خێزاندا هەتا بتوانن لە کایەی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانیشدا پارێزەر و گەشەپێدەری خێزان بن.

### پێنجەم: تێگەیشتن لە ژیانی سەردەم

پێویستە باوک و دایک ڕۆحیەتی قبوڵکردن و پەسەندکردنی شێوەی ژیانی سەردەم لەخۆیاندا بەهێز بکەن بۆئەوەی بتوانن لەوە تێبگەن کە ژیانی سەردەم گۆڕاوە و ببنە هاوکاری ژیانکردنی نەوەکانیان بەپێی گۆڕانکارییەکان، لەوە تێبگەن کە منداڵانی ئەمڕۆ وەک ئەوانەی دوێنێ ناتوانن ژیان بکەن و پێویستە تێکەڵ بەکایەکانی سەردەم بن بەشێوەی دروست و ڕێکخراو، ئەوەی ڕاستییە لەم سەردەمەدا ئەوەیە کە نەوەکان بەجۆرێک لە جۆرەکان کۆچیانکردووە بۆ ئەو فەزا مەجازی و ژیانەگریمانەییەی کە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دروستیانکردووە، بەجۆرێک نەوەکان لەو ژیانەدا گەورە بوون، بارودۆخی تایبەتییان هەیە، بەتێگەیشتن لەو بارودۆخە دەتوانین ئیدارەی ژیانیان بدەین.

### شەشەم: تەریب بەتوانای نەوەکان هەنگاو بنێین

باوک و دایک بۆ ڕێکخستنی کارەکانی خێزان پێویستە ڕێگە بەوەنەدەن کە لە دوای نەوەکانیانەوەبن لەئاست تێگەیشتنیان لە فەزای مەجازی، نەک نەوەکان لە پێشەوەی ئەوانەوە بن و ئەمان لێرەوە داوای دارشتنی ستراتیژ بکەن، کاتێک لە پرۆسەیەکی زانستی دوادەکەوی ڕێکار و ستراتیژەکان لەدەست تۆی دواکەوتوودا نامێنێ، لانی کەم پێویستە هاوئاست بیت، ئەوکات سود لە هێزی باوکایەتی دەبینی بۆ دارشتنی ستراتیژی خێزانی.

### حەوتەم: بەخشینی دڵنیایی و دورکەوتنەوە لە ڕاڕایی

باوکان و دایکان لەنێو خێزان و بەرانبەر بە بەکارهێنانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان پێویست ناکات ڕاڕایی بەرانبەر بەو جۆرە ژیانە دروست بکەن، لەجێی ئەوە دڵنیایی بدەن بە ئەندامانی خێزان بەرانبەر بەو جۆرە ژیانە کە خاڵی نییە لە ئازایەتی و باشیەتی و بەهرە و توانای ژیرانە، هەروەک چۆن هەر کردە و کارێکی تر دووسەرە لە بەکارهێنان و لایەنی ئەرێنی و نەرێنی هەیە ئەم جۆرە ژیانە و تێکەڵبوونیشی هەمان تایبەتمەندی

هەیە، بە دروستکردنی ڕارایی خواست لە بەکارهێنان بە نەرێی زیاد دەبێت، چونکە ئەوکات هەموو لایەنەکانی بە نەرێنی دێتە پێشچاو و هیچ دڵنیاییەک لەبارەی بوونی لایەنی ئەرێنی نابینرێت، بەمەش ڕەوتی ئیدارەدان دەگۆڕێت لە ئیدارەدانێکی دروست بۆ زەوتکردنێکی زۆردارانە.

لە ستراتیژی بەڕێوەبردنی هیچ دیاردەیەکدا دروستکردنی ڕارایی کار ناگەیەنێتە ئەنجامی دروست، شارەزایانی بواری بەڕێوەبردن هەمیشە ئەوە بەیان دەکەن کە ڕارایی بێ مەبەست لە هیچ بوارێکدا نیشان نەدەین، بەڕێوەبردن لە دەرەوەی ڕارایی تاک گەشە پێ بدەین، ئەگەر هەستیاریی و ڕارایی لە کاری بەڕێوەبردنماندا بوونی هەبێت منداڵەکان یان بابڵێن کارمەندانی بەردەستمان بەهەر ڕێگەیەک بێت خۆیان قوتار دەکەن، بەجۆرێک دەچنەوە نێو ئەو فەزا مەجازییە کە ئەسڵەن بەبیری ئێمەدا نایەت، ئەگەر سترێس و هەستیاری بەرانبەری تۆختر بکەینەوە بەجۆرێک ڕەفتاری ئەگۆڕێت کە ئەسڵەن لەگەڵ ڕەفتاری ئێمە و نیازی ئێمە ناگونجێت، کاتێک چاودەکەینەوە نازاین چی ڕوویداوە.

هەشتەم: پاراستنی هاوسەنگی نێوان ژیانی حەقیقی و ژیانی گریمانەیی

مەبەست لە پاراستنی ئەو دوو جۆرە ژیانە لەنێو خێزاندا دۆزینەوە و ڕەخساندنی هەلی گەڕان و یاریی و کاری تر بۆ منداڵان کە دووریان بخاتەوە لە ژیانی مەجازیی و بێنەوە ناو حەقیقەت، بەوەی کە گەشتی جۆربەجۆر بۆ منداڵان بڕەخسێت و کەرەستەی یاریی و کاری جیاواز بخرێتە بەردەمیان بۆئەوەی بە بەردەوام لەنیو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان نەمێننەوە و تەواوی ژیان نەبێتە مەجازی. ئەگەرچی گەشەکردنی پرۆگرام و ئەپەکان لە دنیای مەجازیدا وایکردووە کە زۆرێک لە کارو یارییەکان لەڕێگەی ئەوانەوە ئەنجام بدرێت، بەڵام پێویستە ئەو دەرفەتە برەخسێنین کە بەشێک لەو یارییانە لەنێو فەزای حەقیقیدا ئەنجام بدرێت، تا بتوانین هاوسەنگی بپارێزین.

**نۆیەم: گەشەپێدانی پەیوەندییە سۆزدارییەکان**

پێکەوەبوون و پێکەوە خواردن و خەوتن و گەشت و گەڕان لەنێو خێزاندا سیستمێکی بەڕێوەبردنی بەهێزی نێو کایەکانی خێزاندارییە، یەکێک لەو بنەمایانەی کە ئەو پێکەوە بوونە دەیخولقێنێ پەرەدانە بە هەستی سۆزداریی و هاودەمی و هاوکاریی و خۆشەویستی، ئەم بنەمایە ستراتیژێکی کاریگەرە لە بەڕێوەبردنی فەزای مەجازی لەنێو خێزاندا، کە زۆرکات دەبێتەوە بە بابەتی ئەو فەزایە و پەرەپێدانی لەنێو تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان، بوونی ئەو جۆرە بابەتە لە ژیانی واقیعدا دەگوازرێتەوە بۆ مەجازی، بەمەش واقیعیەتێکی دروست دەبێتە مەجازێکی پەسەند.

**پوختە:**

بەڕێوەبردنی تۆڕی کۆمەڵایەتی و فەزای مەجازی لەنێو خێزاندا جیا لەهەر کایەیەکی تر پێویستی بە ستراتیژی نەرم و باو هەیە بۆ گوزەراندنی ژیانی مەجازی نەوەکانی خێزان. بڕوابوون بە گۆڕانکارییەکان و تەسلیمبوونیان بە ستراتیژی هاوچەرخەوە یەکێکە لەو تایبەتمەندییانەی کە سیستمی بەڕێوەبردنی خێزان لە بەرامبەر تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان هەیەتی، ئەوەی وادەکات کە ستراتیژی بەڕێوەبردنی نوێ بێتە ئاراوە و جیا لە هەر ستراتیژێکی کایەیەکی تر، ئەوەیە کە هێزی بەڕێوەبردن هیچکات ناتوانێ و ڕێ بەخۆی نادات ئەو کایە چەسپیوە ڕەتبکاتەوە، یان دەرگای لێ دابخات، بۆیە ناچار سەودایەکی نوێ و ستراتیژێکی نەرم و هاودەمی لەگەڵدا بەکاردەهێنرێت.

## سەرچاوەکان


- احدیان، محمد (١٣٨٤ شمسی). مقدمات تکنولوژی آموزشی. بشری. تهران.
- باقریان پور، مصطفی (١٣٩٤ شمسی). کاربرد فناوری در آموزش مهارت‌های تفکر. مجله ڕشد تکنولوژی آموزشی. شماره ٨.
- تری گریسون و آندرسون، دی آر (١٣٨٤ شمسی). یادگیری الکترونیکی در قرن بیست‌ویکم: مبانی نظری و عملی. ترجمه زارعی زوارکی و صفایی موحد. مؤسسه انتشاراتی علوم و فنون. تهران.
- علي شمری و علي اسماعیل و..... تکنیک مدیریت فضای مجازی، مجله پذوهش علوم و تکنلوجی، ٢٠١٦.
- ابوالقاسم اکبری و مینا اکبری؛ آسیبشناسی اجتماعی؛ تهران: انتشارات رشد و توسعه، ١٣١١شمسی.
- ریحانه ایزدی ١٣١٤ شمسی، مدیریت پرنده ها مهارت استفاده از اینترنت، رشد معلم، دوره ٣٤، آبان ماه، شماره ٢١٢.
- علی دژبانی،١٣٣١ شمسي، آسیبهای نوپدید، شبکهای اجتماعی مجازی وخانوادهی ایرانی، مجموعه مقالت نخستین کنگره ملی فضای مجازی و آسیب های.



پ.ی.د.بەهادین ئەحمەد
مامۆستای زانکۆی پۆلیتەکنیکیی سلێمانی/ بەشی تەکنیکیی میدیا

# کاریگەریی و هەژموونی تەکنەلۆژیا و سۆشیال میدیا لەسەر تاك و کۆمەڵ

پێشەکی:

بێگومان شۆڕشی زانیاریی و پەیوەندیکردن و تەکنەلۆژیای هاوچەرخ، گۆڕانکارییەکی بێ وێنە و ناوازەی لە بوارەکانی چاپ و پەخش و بڵاوکردنەوە هێناوەتە کایەوە و، شێوە و شێواز و سیستەمی کار و پرۆژەکانی گۆڕیوە، بەشێوەیەك کاریگەریی و بارگاویبوونی جیهان بەتەکنەلۆژیاوە بەسەر سەرجەم بوار و کایەکانی ژیانەوە بە ئاشکرا و ڕوونی دیارە.

کتێبی ئەلکترۆنیش لە ڕۆژگار و سەردەمی ئەمڕۆدا، بوارێکی گرنگ و جێی قسە لەسەرکردن و هەڵوێست وەرگرتنە، چونکە زادە و بەرهەمی تەکنەلۆژیای نوێیە و، دەچێتە چوارچێوەی مەودایەکی فراوانترەوە، کە پێی دەوترێت ڕۆشنبیریی ئەلکترۆنی (Electronic Culturing). چەمکی ڕۆشنبیریی ئەلکترۆنیش خۆی لە ماڵپەڕ و پێگە و کتێبخانە و یانە ئەلکترۆنییەکان و ڕۆژنامەنووسیی ئەلکترۆنی و پەخشی ژمارەیی (Digital) و ئەلکترۆنی ئێزگە و کەناڵە ئاسمانییەکان (Satellite) و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی وەکو (Face book ,Twitter & You tube) و...هتد دا دەبینێتەوە.

بێگومان دیاردەی سەرهەڵدانی کتێبی ئەلکترۆنی بەشێکە لە خزمەتگوزارییەکانی تەکنەلۆژیای هاوچەرخ، کە کتێبە بەبێ کاغەز و مەرەکەب! لە ڕابردووی مرۆڤایەتی و لە مێژووی زانین و مەعریفەت و زانستدا، کار و دیاردەی لەم جۆرەیان بەخۆوە نەدیوە؟! بۆیە بەندە لە ڕێگەی ئەم بابەت و باسەوە هەوڵدەدەم تیشکێک بخەمە سەر ئەم دیاردە و داهێنانە نوێیە و قۆناغەکانی سەرهەڵدان و گەشەکردنی و بڵاوبوونەوەی بەجیهاندا و، هەروەک لە ئێستادا لەلایەک کێبڕکێی بەهێز و توند لە نێوان خوێنەرانی کتێبی کاغەز و کتێبی ئەلکترۆنی دا هەیە. لەلایەکی ترەوە لە بەرەنجامی گەشەکردنی تەکنەلۆژیادا و هەژموون و کاریگەییەکانیدا دیاردەیەکی نوێی میدیای لە ڕۆژگاری ئەمڕۆماندا سەریهەڵداوە، کە ئەویش چەمکی بەجیهانیبوونی میدیایە (Media Globalization). لەمڕووەوە کێبڕکێیەکی بەهێزیش لە نێوان میدیای کۆن و کلاسیکی و میدیای نوێی ئەلکترۆنی و سۆشیاڵ میدیادا لەلایەکی ترەوە هاتۆتە ئاراوە.

### وێستگەی یەکەم: کێبڕکێی کتێبی کاغەز و ئەلکترۆنی(E-book)

- **پێناسەی چەمکی کتێبی ئەلکترۆنی:**

لە سادەترین پێناسەیدا کتێبی ئەلکترۆنی: بریتیە لە کتێبێکی ژمارەیی و چاپی ئەلکترۆنی، کە هەڵگری دەق یان نووسین و وێنەیە یاخود هەردووکیان پێکەوە و، دەتوانرێت لە ڕێگەی بەکارهێنانی کۆمپیوتەر یان ئامێری ئەلکترۆنیی هاوشێوەیەوە پەڕە ئەلکترۆنییەکانی هەڵبدرێتەوە و بخوێنرێتەوە.

- **کورتەیەکی مێژوویی:**

لە ساڵی ١٩٤٥دا (فانر بوش) یەکەم شێوەی سەرەتایی کتێبی ئەلکترۆنی ناسراو بە (میمکس)ی داهێنا. کە میمکس لە ژمارەیەک لە فیلمی بچووک (مایکرۆ فیلم) و شاشەیەک، کە دەتوانیت لە ڕێگەی ئەو شاشەیەوە نووسینە تۆمارکراوەکانی سەر فیلمەکان بخوێنیتەوە. هەروەها دەتوانیت دەق و وێنە و بەڵگەنامەکان لەسەر ئەو فیلمانە بپارێزیت و هەڵبگریت یاخود ئەمبار(سەیڤ)یان بکەیت.

هەروەها لە ساڵی ١٩٦٨دا کتێبی (دیانای ئەلکترۆنی) بۆ خوێندکاران داهێنرا، تاوەکو بتوانن بۆ خوێندن و خوێندنەوە بەکاری بهێنن، کە بریتیی بوو لە شاشەیەک و کیبۆردێکی گەورە وەکو کۆمپوتەری لاپتۆپی ئێستا وابوو، دەتوانی زانیارییەکانی خۆتی لەسەر تۆماربکەیت و دواتر بیخوێنیتەوە.

***کتێبی مرۆیی سۆنی (Sony Book Man)**

لە ساڵی ١٩٩٢دا کتێبی مرۆیی سۆنی (Sony Book Man) لەلایەن کۆمپانیای سۆنی ژاپۆنییەوە داهات، کە لەو ساڵەدا یەکەم بەرهەمی کتێبی ئەلکترۆنی خۆی بەناوی (Walk Man) خستە بازاڕ و بەردەستی خوێنەرانی کتێبی ئەلکترۆنییەوە، بەڵام بەهۆی گرانی نرخەکەی و زۆری بڕی تێچوونییەوە بەرهەم و کڕیاری لە بازاڕەکانی جیهاندا وەکو پێویست نەبوو، کە کەمترین نرخی فرۆشتنی دوای داشکاندنی بڕی (١٨٠٠) دۆلار بوو!

**کتێبی ئەلکترۆنی مووشەکی (Rocket Electronic Book) و کتێبی نەرم (Soft Book)**

لە ساڵی ١٩٩٨دا کۆمپانیای (نۆفۆ میدیا) بەرهەمێکی نوێی کتێبی ئەلکترۆنی بەناوی کتێبی ئەلکترۆنی مووشەکی (Rocket Electronic Book) یان کتێبی نەرم (Soft Book) خستە بازاڕەوە، کە تاڕێژەیەکی باش لەلایەن کڕیاران و خوێنەرانی کتێبی ئەلکترۆنییەوە لە بازاڕەکانی جیهان بەگەرمی پێشوازی لێکرا و کڕدرا و لە خوێندنگە و ناوەندە ئەکادیمیی و ڕۆشنبیریی و ڕاگەیاندنەکاندا جێگەی خۆی کردەوە.

ئەمازۆن (Amazon) و هەڵکشان بەرەو لووتکە!

لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٧دا کۆمپانیای ئەمازۆن (Amazon) یەکەم بەرهەمی ئەلکترۆنی خۆی لە بواری کتێبدا بەناوی (Kindle) خستە بازاڕەوە، کە بەهۆی سووکی و کەمی کێشەکەی و قەبارەی و خێرایی و توانای زۆری لە تۆمارکردنی زانیاریی و بوونی سیستەمی ناهەوایی (لاسلکی) و، گونجاوی نرخەکەی لە ماوەی ٥ کاتژمێردا، سەرجەم دانەکانی لە بازاڕدا نەمان و فرۆشران!

هەمان کۆمپانیای ناوبراو لە شوباتی ٢٠٠٩زدا بەرهەمێکی نوێتری (Kindle)ی خستە بازاڕەکانی جیهانەوە و، لە تەممووزی ٢٠١٠ بۆ جاری سێیەم هەمان بەرهەمی ئەلکترۆنی بەهەندێ داهێنانی نوێوە خستەوە بازاڕەوە، هەروەک لە تشرینی دووەمی ٢٠٠٩شدا سیستەمی یارییە ئەلکترۆنییەکانی ناسراو بە نووک (Nook) بۆ زیاد کرد، کە لەم ڕێگەیەوە خوێنەری ئەلکترۆنی دەیتوانی سەرەتا وێنەی ڕەش و سپی کتێبە چاپکراوە کاغەزییەکە ببینێت و دواتر ئەم سیتەمە گەشەی پێ درا و بەرکەوتنی ئەلکترۆنی دەستی و سیستەمی ڕەنگاوڕەنگی بۆ زیادرا، بەم هۆیە خوێنەر دەیتوانی وێنەی ڕەنگا و ڕەنگی کتێبەکە بەشێوەی ئەلکترۆنی وەکو خۆی ببینێت و بخوێنێتەوە.

## ئای پاد (I pad) و ئای فۆن (I phone)و کێبڕکێی تەکنەلۆژیای نوێ

لە نیسانی ٢٠١٠دا بەرهەمی یەکەمی ئامێری ئای پاد (I pad) خرایە بازاڕەوە بووبە هۆی سەرنجی خوێنەرانی کتێبی ئەلکترۆنی و کڕینی، کە تەنیا لەو ساڵەدا زیاتر لە (٥) ملیۆن دانەی لە بازاڕەکانی جیهاندا لێ فرۆشرا! ئەم جۆرە پێشوازییە گەرمە لە ئامێری (ئای پاد) لەلایەن بەکارهێنەرانییەوە، وای لە هەردوو کۆمپانیای (Noble & Spurred Barnes) کرد و هانیدان، کە کتێبی (Nook)ی ئەلکترۆنی بە شاشەیەکی ڕەنگاوڕەنگ و بەرکەوتن (لمس)ی پەنجە لە تشرینی دووەمی ٢٠١٠ بخەنە بازاڕەوە.

لە ئێستادا ئەم داهێنانە نوێیانە ساڵانە لەلایەن کۆمپانیا ئەلکترۆنییە هاوشێوەکانی جیهانەوە بەردەوامە، لەم بوارەدا کێبڕکێی یەکتردەکەن لە داهێنان و نوێگەریدا و خەسڵەت و تایبەمەندی تری بۆ دەدۆزنەوە و زیاد دەکەن. بێگومان ئەمەش هاوشانە لەگەڵ داهێنانە نوێکان لە ئامێری پەیوەندییکردنی مۆبایل (Mobile) و جۆرەکانی وەکو (I phone) و (Galaxy) و ئامێری (MP3 , MP4) و سەرجەم ئامێرە تەکنەلۆژییەکانی تری بواری پەیوەندیکردن و میدیای هەمەچەشنە (Multi Media) و...هتد دا.

### *کێبڕکێی کتێبی کاغەز و کتێبی ئەلکترۆنی:

لەکاتێکدا مارکۆنی ئیتاڵی لە ساڵی ١٩١٦ دا ڕادیۆ (ئێزگە)ی داهێنا نەیتوانی وەکو داینەسورەکان ڕۆژنامە و گۆڤارەکان بۆ لاپەڕەکانی مێژوو بپێچێتەوە و بیانخاتە یادەوەرییەکانە. هەروەک تەلەفزیۆن داهات نەیتوانی کاریگەری ئێزگە لەسەر دڵ و مێشکی گوێگرانی بسڕێتەوە. کاتێک ڕۆژنامەنووسیی ئەلکترۆنی و ناکاغەز سەریهەڵدا، نەیتوانی بەتەواوی جێ بە ڕۆژنامەی کاغەز لێژ بکات و بیخاتە خانەی نەمان و لەبیرچوونەوە!

هەروەک کاتێک کەناڵە ئاسمانییەکان دامەزران نەیانتوانی بەتەواوی تام و بۆی خۆڕسکی کەناڵە تەلەفزیۆنی و ئێزگە ناوچەییەکان (لۆکاڵییەکان) نەهێڵن، بۆیە بەهەمان شێوە بەڕای بەندە کتێبی ئەلکترۆنیش ناتوانێت کتێبی کاغەز بپێچێتەوە و نەهێڵێت بمێنێت، بەڵکو وەکو هەر کار و پیشە و پیشەسازییەکی تر دەتوانێت کێبڕکێی بکات. هەرچەندە ڕای (دیک براس) بەرپرسی بەشی بڵاوکردنەوەی کۆمپانیای (مایکرۆسۆفت) پێچەوانەیە، کە لە ساڵی ٢٠٠٠دا لە وتەیەکیدا ڕایگەیاند،» ٣٠ ساڵی ئایندە مەرگی کتێبی کاغەز دەبێت و، شتێک نامێنێت بەناوی کتێبی کاغەزەوە و هەمووی دەبێت بە کتێبی ئەلکترۆنی!». لەگەڵ ئەوەشدا من پێچەوانەی ئەم بۆچوونەم، بەڵام کتێبی ئەلکترۆنی تارادەیەک ڕێگە دەگرێت لە دیاردەی پیسبوونی ژینگە و برینەوەی ملیۆنان تەن لە دار و سەوزایی ڕووبەری دارستانەکانی جیهان بۆ بەرهەمهێنانی کاغەز و کەرەستە خاوەکانی چاپکردن. هاوکات کەمکردنەوەی کات و خەرجی و ماندووبوونی ناپێویست و بەگەڕنەخستنی کارگە و مەکینە و چاپخانەکان و، دەستگرتنەوە بەسەرچاوەکانی وزەی کارەبا و نەوتەوە لە وڵاتانی جیهاندا.

## وێستگەی دووەم: میدیای ئەلکترۆنی  و بەجیهانیبوون

ئینتەرنێت (Internet)، کە کورتکراوەی دەستەواژەی (International Net Work) ە و بەواتای تۆڕی نیودەوڵەتی دێت.  ئەو تەکنەلۆژیا سەرسوڕهێنەرەیە، کە بۆ یەکەمجار لە ساڵی ١٩٦٩ بۆ مەبەستی خزمەتی سەربازیی و بەکارهێنانی لە بواری پەیوەندیکردن و ئاڵوگۆڕکردنی زانیاری نهێنیدا لە نێوان یەکە سەربازییەکانی وەزارەتی بەرگریی ئەمریکا (پنتاگۆن) لە سەردەمی (د.ئایزنهاوەر) و بەفەرمانی ئەو، لەلایەن دەزگای توێژینەوە و پرۆژە پێشکەوتووەکانی پنتاگۆن (ARPA)ەوە دامەزراوە.

دامەزراندنی ئەم تەکنەلۆژیایە لەکاتێکدا بوو، کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەکاتی شەڕی ساردا بوو لەگەڵ یەکێتی سۆڤیەت، حکومەتی واشنتۆن ئەگەر و مەترسی ئەوەی هەبوو لە مۆسکۆ، کە چەکی ئەتۆمی لە هێرشکردنە سەر وڵاتەکەیدا بەکاربهێنێت، بەوهۆیەوە سەرجەم تۆڕەکانی پەیوەندیی کلاسیکی لە نێوان یەکە و هێزە سەربازییەکانی وڵاتەکەیدا بپچڕێت، بۆیە بیری لە داهێنانی تەکنەلۆژیایەکی سەربازی پێشکەوتوو کردەوە لە بواری پەیوەندییکردنی سەربازیی و ئاڵوگۆڕکردن و گواستنەوەی زانیارییە نهێنییەکاندا، بەشێوەیەک هێزەکانی دوژمن نەتوانن دزە بکەنە ناو ئەو تۆڕی پەیوەندییکردنە و کۆدەکانی بشکێنن !

دواتر لە ساڵی ١٩٧٢ دا، ئەم خزمەتگوزاییە نوێیە خرایە بواری مەدەنییەوە و، نزیکەی (٧٠) زانکۆ و ناوەندی توێژینەوەی ئەمریکی بەشدارییان کرد لە بەکارهێنانی ئەو تۆڕەدا. لە قۆناغی ئێستادا و لە سەردەمی هاوچەرخدا لە سەرتاسەری جیهاندا حکومەت و پارت و ڕێکخراو و ناوەندە جیاوازەکان و زۆربەی هاووڵاتیان خزمەتگوزاری ئینتەرنێت بەمەبەستی جیاواز و لە بواری هەمەجۆردا بەکاردەهێنن و خاوەنی پەیج و ماڵپەری تایبەت بەخۆیانن.

داهێنان و کاریگەری ئینتەرنێت، یەکێکە لە بەرهەمەکانی پێشەکەوتنی جیهان لە بواری تەکنۆلۆژیادا، هاوکات یەکێکە لە کەرەستە و سیما دیارەکانی دیاردەی بەجیهانیبوون (Globalization)، کە لە بەرەنجامی ئەم تەکنەلۆژیایە و پەخشی مانگە دەستکردەکان و  سیستەمی ژمارەیی Digital System)) و سەرهەڵدانی کەناڵە ئاسمانییەکان (Satellite)، هەروەکو  زانای بەناوبانگی کەنەدی (مارشاڵ ماکلۆهان) دەڵێت: «لەژێر سایەی تەکنەلۆژیادا دونیا وەکو گوندێکی گەردوونی (Global Village)ی لێ هاتووە!».

لەم ڕوانگەیەوە داهێنانی ئینتەرنێت خۆی لەخۆیدا خاڵێکی وەرچەرخانی گرنگە لە بواری شۆڕشی زانیاریی و چاخی تەقینەوەی زانیارییەکان و سەرهەڵدانی بەجیهانیبوونی ڕاگەیاندن (Media Globalization) و، بچووکبوونەوەی پانتای ئەلکترۆنیی گۆی زەویی و کەمکردنەوەی مەودا و دوورییەکان و خێرای و، شکاندنی سەرجەم دیوار و کۆسپە سیاسی و نەتەوەیی و کلتورییەکان و، پەلهاویشتن و بەکارهێنانی ئەم تەکنەلۆژیایە لە سەرجەم لایەن و بوارەکانی ژیانی ئابووریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیریی

و هونەری و...هتد. تەنانەت یەكێك لە بەكارهێنانە گرنگ و بەرچاوەكانی ئینتەرنێت، بریتییە لە بەكارهێنانی لەبواری ڕاگەیاندنی ئەلكترۆنی (Electronic Media) و پەخشی ئینتەرنێتی ئێزگە و كەناڵە ئاسمانییەكاندا.

لەڕاستیدا ئینتەرنێت بریتییە لە میدیای هەمەجۆر(Multi Media)، كە لاپەرە و وێبسایت و فایلی دەنگی و وێنە و ڤیدیۆ و بانكی زانیاریی و كەرەستەی پەیوەندیكردنە لە ڕێگەی ئیمەیل و چات و وتوێژكردنی ڕاستەوخۆی ڤیدیۆییەوە، جگە لە پەخشی ئێزگەی و تەلەفزیۆنی و نمایشكردنی ڕۆژنامەی كاغەزەوە و پیشاندانی ڕۆژنامەی ئەلكترۆنی، بەبێ كاغەز و مەرەكەب(Paperless Journal) و، بەبێ وابەستەبوون بەچوارچێوەیەكی دیاریكراوە. جگە لە توانای گەڕان (Search) و پێكەوەبەستن (Links) و نووسینی وەڵام و توانج (comment) و بەكارهێنانی دەقی باڵای ئەلكترۆنییەوە (Hyper Texts). هەموو ئەمانە وایكردەوە، كە ئینتەرنێت خاوەنی جەماوەرێكی بەرفراوان بێت، كە ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژمارەیان لە زیادبوون و زۆربووندا بێت و، ببێتە هۆی گەشەكردنی پەیوەندییە ئەلكترۆنییەكان و ڕاگەیاندنی ئەكترۆنی و جێ پێ لێژكردنی ئامێری پەیوەندییكردن و ڕاگەیاندنی كلاسیكی و ڕۆژنامەنووسیی كاغەز(News paper).

ئەمڕۆ لە بەرەنجامی بڵاوبوونەوەی خزمەتگوزاری ئینتەرنێت و بەكارهێنانی بەرفراوانییەوە، ڕاگەیاندنی ئەلكترۆنی گەشەیەكی بەرچاوی بەخۆوە بینیوە و، پەخشی هەواڵ و زانیاریی و بەرنامە هەمەچەشنەكانی كەناڵە جیاوازەكانی ڕاگەیاندن، بەشێوەیەكی سەرسوڕهێنەر زیادی كردووە و، ئامادەگی و دەستپێشخەری ڕۆژنامەنووسیی بۆتە چركە سات و، لەسایەی ئەم تەكنەلۆژیاوە دونیا وەكو شاشەیەكی ئەلكترۆنی بچووكی لێ هاتووە، كە لە كەمترین ساتەوەختدا ڕاگەیاندنە ئەلكترۆنییەكان و ماڵپەرەكان ڕووماڵی نوێترین ڕووداو و گۆڕانكارییەكانی جیهان دەكەن بۆ جەماوەر بە زمانی جیاواز و بۆ دوورترین پێگە و ناوچەی گۆی زەوی دەگوازنەوە! لەمڕووەوە، دامەزراوە و دەزگاكانی ڕاگەیاندن كێبڕكێی بەهێزی یەكتر دەكەن و لە هەوڵی كۆكردنەوەی زۆرترین جەماوەردان بۆ خۆیان، لە ڕێگەی كاریگەری دروستكردن لەسەر جەماوەر و بەكارهێنەرانی ئینتەرنێت.

### وێستگەی سێیەم: سۆشیاڵ میدیا و جەماوەری ئەلكترۆنی

لەئێستادا زۆرینەی ڕۆژنامەكان ناتوانن خۆیان بژێنن و، ئەو جەماوەری ساڵانی ڕابردوویان نەماوە، ئەمەش بەشێكی بەهۆی كێبڕكێی بەهێزی نێوان ڕۆژنامەنووسیی كاغەز و میدیای ئەلكترۆنییەوەیە لەسەر تۆڕی ئینتەرنێت و دامەزراندنی تۆڕەكۆمەڵاتییەكان لەسەر ئەو تۆڕە نێودەوڵەتییە لەم ساڵانەی دواییدا وەكو (تویتەر و یوتیوب و فەیس بووک).بەپێی ئامارێك لەم ساڵدا تەنیا بەكاربەرانی تۆڕی فەیسبووک (Face book) لە جیهاندا گەیشتووەتە یەك ملیار كەس!

زۆرجار فەیسبووک وەکو گەورەترین تۆڕی کۆمەڵایەتی لە ئینتەرنێت ناودەبرێت، تۆڕێکی کۆمەڵایەتی، کە ژمارەیەکی یەکجار زۆر ئەندامی چالاکی هەیە و، ڕۆژ بەرۆژ ژمارەیان لە زیادبووندایە، کە لەم ساڵدا ڕێژەیان گەیشتۆتە یەک ملیار کەس لەجیهاندا.

لە ساڵی ٢٠٠٤دا هاووڵاتی ئەمریکی (مارک زوکربێرگ) و ژمارەیەکی تر لە هاوڕێ خوێندکارەکانی لە زانکۆی (هاڤارد) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا، بناغەی فەیسبووکیان دانا. فەیسبووک لە سەرەتادا وەک تۆڕێکی تایبەت بۆ خوێندکاران کەڵکی لێ وەردەگیرا و، هەر لەسەرەتاشەوە بۆ هەمان مەبەست دامەزرابوو، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٥ بەدواوە، ئیتر ئەم تۆڕەکۆمەڵایەتییە گەیشتە دەرەوەی زانکۆ و هەموو ئەمریکا و دواتر هەموو جیهان.

> **کتێبی ئەلکترۆنی تـــارادەیەک ڕێگە دەگرێت لە دیاردەی پیسبوونی ژینگە و بڕینەوەی ملیۆنان تەن لە دار و سەوزایی ڕووبەری دارستانەکانی جیهان بۆ بەرهەمهێنانی کاغەز و کەرەستە خاوەکانی چاپکردن.**

لە ساڵی ٢٠١٠دا ژمارەی بەکارهێنەرانی لە جیهاندا گەیشتە نزیکەی یەک ملیار کەس. فەیسبووک تۆڕێکە کە سەرجەم چین و توێژەکانی کۆمەڵگە جیاوازەکان لە سەرتاسەری جیهاندا بەبێ جیاوازی زمان و ڕەگەز و تەمەن دەتوانن تێیدا ببنە ئەندام و بەکارهێنەری. بەتایبەتی ئەم تۆڕەکۆمەڵایەتییە زیاتر گەنج و لاوان لە جیهاندا بەکاربەرین و لەم ڕێگەیەوە پەیام و وێنە و زانیاری و بیر و ڕای خۆیان بەیەکتر دەگەیەنن و پەیوەندییەکانیان پێکەوە گرێ دەدەن. تەنانەت ئەم تۆڕە ئەلکترۆنییە هیچ مەرجێکی تایبەتی نییە و بۆ بوون بە ئەندام تێیدا، بۆیە هەموو کەس دەتوانێت ببێتە ئەندام لەم تۆڕە نێودەوڵەتییەدا، جگەلەوەی بەکارهێنانی زۆر ئاسانە و بەزمانی جیاواز دەتوانیت هەواڵ و زانیاریی و وێنە و پەیامی خۆت بگەیەنیتە دوورترین مەودای جوگرافی و نەتەوەیی جیهان و، دەتوانیت بڕیاریش بدەی، کە کامە زانیاریت ئەندامی فەیسبووک دەتوانێت ببینێت و کامە ئەندامی تری دەتوانیت نەهێڵیت ببینێت.

هەروەها فەیسبووک لە دونیای ئەمڕۆدا چووەتە بواری پەیوەندیی سیاسی و حکومەتی و نێودەوڵەتییەوە و، زۆربەی حیزب و ڕێکخراو و بەرپرسە سیاسیی و جکومییەکان پەڕەی تایبەتیان لەم تۆڕەدا هەیە و ململانێی سیاسی یەکتر دەکەن ، هەروەک بۆ

دوو جارە لەسەر یەک (باراک ئۆباما) سەرۆکی ئەمریکا لە ڕێگەی بەکارهێنانی ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییەوە توانی سەرکەوتن لە هەڵبژاردنە سەرۆکایەتییەکانی وڵاتەکەیدا بەدەستبێنێ، کە لەڕاستییدا ئەمە نهێنی و سیحری سەرکەوتنی بوو لەو پرۆسەیەدا کە لە ڕێگەی سەرنجراکێشانی گەنجانی وڵاتەکەیەوە و کۆکردنەوەی زۆرترین دەنگ بۆ خۆی و لیستەکەی سەرکەوتنی دووبارە و بەردەوام بەدەستبهێنێت. لەلایەکی دیکەوە زۆربەی ڕۆژنامەنووسان و دەزگا و دامەزراوەکانی ڕاگەیاندن بۆ زۆرکردنی جەماوەری خۆیان و کیبرکێی یەکتر پەیجی تایبەتیان لەسەر ئەم تۆڕە هەیە. هەروەک کۆمپانیا بازرگانییەکان بۆ برەودان بەکاڵا و خزمەتگوزارییەکانیان و ململانێی توندی بازرگانی یەکدیی و ڕیکلامکردن پەنایان بردۆتە بەر بەکارهێنانی تۆڕی فەیسبووک، بەپێی ئامارێکی ساڵی ڕابردوو داهاتی ڕیکلامکردنی تۆڕی فەیسبووک (٧٥٠) ملیۆن دۆلار بووە و بەپلەی یەکەم هاتووە لەپێشی تۆڕی گوگڵ (Google) و ئەپڵەوە، کە گوگڵ (٦٥٧) ملیۆن دۆلار بووە بە پلەی دووەم هاتووە و ئەپڵ (Apple) بەپلەی سییەم هاتووە، کە کۆی بڕی داهاتی ڕیکلامکردنی (٥٥٠) ملیۆن دۆلار بووە لە ساڵی ڕابردوودا.

**وێستگەی چوارەم: تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و سۆشیاڵ میدیا (Social Media):**

لەم ساڵانەی دواییدا ئینتەرنێت، ماڵپەڕی کۆمەڵایەتیی هەمەجۆری لەخۆگرت بەتایبەتی لە دوای ساڵی ٢٠٠٤، ئەمجۆرە ماڵپەڕ و تۆڕانە لە ڕوانگەی بوار و ئامانجی بەکارهێنانیانەوە جیاوازن، لەئێستادا ژمارەی بەکارهێنەرانیان بەپێی دوا ئاماری ساڵی ٢٠٢١ لە جیهاندا گەیشتۆتە ٣ ملیار کەس یان بەکارهێنەر، لە هەندێ وڵاتی دنیا تاوەکو ئێستا چاودێری توند و فلتەریان لەسەرە لەوانە چین، کوریای باکوور، ئێران و سعودیە و... هتد. لە نموونەی ئەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە وەک: مای سپەیس (My Space)، فەیسبووک و تویتەر و یوتیوب و ئینستگرام و...هتد. ئەم تۆڕانە تاڕادەیەک بیرۆکەیەکی نوێن، تا ئەندازەیەکی باش و بەرچاو لە وڵاتانی جیهاندا سەرکەوتنیان بەدەستهێناوە، چونکە توانیویانە بچنە هەموو ماڵ و کوچە و کۆڵانێکەوە و، سەرجەم بەربەست و کۆسپە کلتووریی و نەتەوەیی و سیاسی و کۆمەڵایەتییەکانیان بەزاندووە یان تێکشکاندووە! هەروەک ئەندامبوون لەو تۆڕە کۆمەڵایەتییانە و بەکارهێنانی هەندێکیان بەخۆڕاییە وەکو فەیسبووک و یوتیوب و مای سپەیس و، هەندێکی تریان بە پارەن و، پێویستە بەکارهێنەر بەرامبەر بە بەکارهێنانی وەکو پشکداری (اشتراک) بڕێک پارەی دیاریکراو دەدات.

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان دەکرێ بەوە پێناسە بکرێ: (تۆڕێکی ئەلکترۆنی نێودەوڵەتییە، کە گرووپێکی بێسنوور لە خەڵکی بەکارهێنەر و بەشداری لەسەرتاسەری جیهاندا پێکەوە دەبەستێت. لەو ڕێگەیەوە ئاڵوگۆڕی زانیاریی و بیروڕا دەکەن. هەواڵ و وێنە و چالاکی تاکەکەسی و گرووپی خۆیان بڵاودەکەنەوە و پێکەوە پەیوەندییەکان لە نێوان خۆیاندا بەشێوەی ئەلکترۆنی بە دەنگ، ڕەنگ و وێنە یان نووسین بە چات و کۆمێنت ئەنجامدەدەن).

**جۆرەکانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان:**

یەکەم: مای سپەیس (My Space): ئەم تۆڕە لەلایەن (کریس دی وۆڵف) و (تۆم ئاندەرسن)ەوە دامەزراوە. هەردووکیان مافەکانیان بۆ (مای سپەیس) بەبڕی ٥٨٠ ملیۆن دۆلار فرۆشتە کۆمپانیای زەبەلاحی (نیوس کۆرپۆرەیشن). مای سپەیس هەر ساڵێک بڕی ١٠٠ ملیۆن دۆلار داهات بەدەستدەهێنێت. زۆرینەی بەکارهێنەرانی تەمەنیان لە نێوان (١٤-٢٥) ساڵاندایە.

دووەم: فەیسبووک (Face book): ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییە زۆرجار بەگەورەترین تۆڕی کۆمەڵایەتی لە ئینتەرنێت ناودەبرێت، چونکە زۆرترین ژمارەی بەکارهێنەری لە جیهاندایە، کە نزیکەی ٢ ملیار کەسە بەپێی ئاماری ٢٠١٧ی تۆڕەکە، جگەلەوەی ڕۆژانە ژمارەی ئەندامانی زیاد دەکات و لەبەرزبوونەوەدایە. لە دەسپێکی ساڵی ٢٠٠٠ گەنجانی سوید لە دەوری تۆڕێکی ئەلکترۆنی کۆبوونەوە، کە ئەودەم پێی دەوترا کومیونیتی (Communities) وەک: لونارسترۆم، پلەی هێد و ئاپ بێرگێت و...هتد. دواتر لە ساڵی ٢٠٠٤ مارک زۆکەربێرگ (Mark Zuckerberg) و ژمارەیەک خوێندکاری تر لە زانکۆی هارڤاردی ئەمریکی بەشێوەیەکی سنووردار ئەم تۆڕەیان لە نێوان خۆیان بەکارهێنا و، بەردی بناغەی ئەم تۆڕە کۆمەڵایەتییە بەناوبانگ و بەربڵاوەیان دانا.

فەیسبووک لە سەرەتادا وەک تۆڕێکی پەیوەندییکردنی کۆمەڵایەتی و تایبەت بۆ خوێندکارانی زانکۆ کەڵکی لێ وەرگیرا و هەر لەسەرەتاشەوە بۆ هەمان مەبەست دامەزرا، بەڵام لە ساڵی ٢٠٠٥ بەدواوە ئیتر ئەم تۆڕە گەیشتە دەرەوەی زانکۆ و هەموو ئەمریکا و دواتر سەرتاسەری جیهان. لەئێستادا داهاتی ساڵانەی بە زیاتر لە ٥٠ ملیۆن دۆلار دەخەملێنرێت.

سێیەم: تویتەر (Twitter): یەکێکی ترە لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانی ئینتەرنێت لە سەرەتای ساڵی ٢٠٠٨ دامەزرا. لەوکاتەوە کەس و گرووپە چالاکەکان لە جیهاندا دەستیانکرد بە بەکارهێنانی وەکو تۆڕێکی نوێ لە بواری ئاڵوگۆڕی زانیاریی و پەیوەندیی ئەلکترۆنیی کۆمەڵایەتیدا. تویتەر خزمەتگوزارییەکی نووسینی بچووک و سنووردارە بۆ ئاڵوگۆڕکردنی زانیاریی و ناردنی پەیام لە شێوەی ئاگاداریی و کورتە هەواڵ لە نێوان بەکارهێنەرانیدا، کە نابێت نامەکە لە (١٤٠) وشە زیاتر بێت. دەکرێ تویتەر وەک تێکەڵاوێک لە نێوان بلۆگ و ژووری دەمەتەقێ (Chatt) بناسێنرێت.

چوارەم: یوتیوب (You Tube): یوتیوب لە ڕۆژی ٢٠٠٥/٢/١٤ لەلایەن سێ کەس بەناوەکانی (جاد هیرلی-ئەمریکی) و (ستیڤ چێن-تایوانی) و (جاوید کەریم-بەنگالی) ەوە دامەزراوە. سەرەتای دەستپێکردنی ئەم تۆڕە لە شاری (Menlo Park)ی ویلایەتی کالیفۆرنیای ئەمریکا بوو، دوای تەواوکردنی ڕێ و شوێنەکان لە ئایاری هەمان ساڵدا خزمەتگوزارییەکانی خرایە بەردەستی بەکارهێنەرانی.

ئەم تۆڕە شوێنی خەڵکانێکە کە ئارەزوومەندی کۆکردنەوە و پەخش و بڵاوکردنەوە یان تەماشاکاری فیلم و بەرنامەی فلیم و ڤیدیۆی کلیپی گۆرانییەکانن لە ئینتەرنێدا کە هەموو کەسێک دەتوانێت سەردان و تەماشای بکات. هەروەها هەموو کەسێک دەتوانێت وێنەی ڤیدیۆیی و فیلمی هەڵبژێردراوی خۆی لەم تۆڕە دابنێ و، خەڵکی تر تەماشای بکات و بیروڕای خۆی دەربڕێ، بەڵام بۆئەوەی هەر کەسێکی بەکارهێنەری لێی سوودمەند بێت، پێویستە سەرەتا ژوورێکی ئەلکترۆنی بۆ خۆی لەناو تۆڕەکە بکاتەوە و بەخۆڕاییە.
ساڵی ٢٠٠٦ لەلایەن کۆمپانیای گوگڵەوە کڕدرا و بوو بە بەشێک لە موڵک و خزمەتگوزارییە ئەلکترۆنییەکانی ئەو کۆمپانیا زەبەلاحە ئەلکترۆنییە بەناوبانگەی جیهان. بەپێی توێژینەوەیەک کە لە ساڵی ٢٠٠٩ لە وڵاتی سوید ئەنجامدراوە، ڕێژەی ١٦٪ ی کوڕان و ٩٪ی کچانی ئەو وڵاتە سەردانی ئەم تۆڕەیان کردووە.
بەپێی ئامارێک یوتیوب لە دوای (Yahoo, Google) بە سێیەمین ماڵپەڕی جیهانی دادەنرێت و، ڕۆژانە ١٠٠ ملیۆن کەس لە وڵاتانی دنیادا لەڕێگەیەوە تەماشای فیلمەکان دەکەن. تەنیا لە کانوونی دووەمی ٢٠٠٨ دا ٧٩ ملیۆن بینەری بەکارهێنەری تەماشای ٣ ملیار فیلمی بڵاوکراوەیان لەسەری کردووە. هەر لەو ساڵەدا خەرجی ڕۆژانەی (یوتیوب) بە نزیکەی ١ ملیۆن دۆلار خەملێنراوە.
بەپێی هەواڵێکی ئابی ٢٠٠٦ کە لە ڕۆژنامەی (The Wall Street Journal) بڵاوکراوەتەوە ماڵپەڕی You Tube)) ٦ملیۆن و ١٠٠ هەزار تراکی ڤیدیۆی بە قەبارەی (٦٠٠) تیرا بایت کە دەکاتە (٦٠٠٠٠٠) گێگا بایت بووە.
•مەرجەکانی خزمەتگوزاری یوتیوب (You Tube):
١. نابێت ئەو ڤیدیۆ و فیلمانەی لە ماڵپەڕەکە بڵاودەکرێتەوە مافی بڵاوکردنەوەیان پارێزراوبێت بۆ هیچ کەس و لایەنێک.
٢. ماڵپەڕەکە ڕێگە بە بڵاوکردنەوەی فیلمی سێکسی و ڕووت نادات.
٣. ڕێگە بە بڵاوکردنەوەی فیلمی ئابڕووبەر و ڕیکلامی بازرگانی و، هەروەها ڕێگەش بە بڵاوکردنەوەی ئەو فیلمانە نادات، کە زیان لە کەسێتییەکی دیاریکراو دەدات.
٤. ڕێگە بە بڵاوکردنەوەی ئەو فیلمانە نادات، کە هانی تاوان و تیرۆر و توندوتیژی دەدەن.
٥. ماڵپەڕەکە ڕێگە بە هەندێ فایلی دەنگی و ڤیدیۆی گونجاو دەدات.

دیاردەی ئاڵوودەبوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان

میدیای نوێ و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان لە بەرەنجامی تەکنەلۆژیای هاوچەرخ و بەربڵاوی تۆڕی ئینتەرنێت و بەکارهێنانی لە وڵات و ناوچەکانی جیهاندا هاتووەتە کایەوە و، جگە لە خزمەتگوزاری جیاواز و هەمەجۆری لە بوارەکانی بەکارهێنانیدا، ئەم تەکنەلۆژیا و تۆڕەکۆمەڵایەتییە نوێیە دیاردە و لایەنێکی نەرێنی بەدوای خۆیدا هێناوە بەتایبەتی لەناو توێژی گەنجان و هەرزەکاراندا، کە دیاردەی ئاڵوودەبوون بە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان یان

ئینتەرنێت ناودەبرێت.

تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان خزمەتگوزاریی و داهێنانێکی نوێیە لە بواری تەکنەلۆژیای هاوچەرخدا، بەهۆی هەرزانی نرخی ئینتەرنێت و خێرایی و ئاسانی بەکارهێنانی و بەربڵاوی بەکارهێنانی و سەرنجراکێشییەوە، ژمارەیەکی زۆری لە خەڵکی ئەندام و بەشداری یان بەکارهێنەری تەواو سەرقاڵکردووە بەخۆیەوە و، دووچاری حاڵەت و دیاردەیەکی کردوون کە پێی دەوترێت ئاڵوودەبوون بە تەکنەلۆژیای ئینتەرنێت یان تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان. بۆ یەکەمجار پزیشکی بەناوبانگ (ئیڤان گۆڵد بیرج) ئەم زاراوەی لە نووسینی کۆمێنتی دەمەتەقێ (چات)ێکی ئەلکترۆنی خۆیدا لەگەڵ هاوڕێکانی بەکارهێنا، کاتێک لێکچوونێکی بینی لە نێوان دیاردەی ئاڵوودەبوون بە مادده هۆشبەرەکان و ڕەفتار و سەرقاڵی بێ ئەندازە و زیادەی بەکارهێنەرانی تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان لای گەنجان و هەرزەکاران، بەڵام بۆ یەکەمجار وەکو چەمک و زاراوەیەکی زانستی یەکەم کەس کە لەسەر چەمکی ئاڵوودەبوونی ئینتەرنێت (Internet Addiction) کردووە، زانای دەروونناسی بەناوبانگی ئەمریکی د.کیمبرلی یۆنگ (Kimberly Young) بوو لە ساڵی ١٩٩٤ دا کاتێک توێژینەوەی لەسەر ئەم دیاردەیە لەویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا ئەنجامدا، دواتر سەنتەرێکی توێژینەوەی زانستی و ڕاهێنان و چارەسەری تایبەتی بۆ هەمان مەبەست لەو وڵاتە دامەزراند، بەم شێوەیە پێناسەی ئەم چەمکەی کردووە، کە دەڵێت:» بریتییە لە بەکارهێنانی ئینتەرنێت بۆماوەی زیاتر لە (٣٨) کاتژمێر لە هەفتەیەکدا».

- **پێناسەی دیاردەی ئاڵوودەبوون بە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان:**

بەکارهێنانی ناهاوسەنگ و ناتەندروست و بێ ئەندازە و زیاد لە پێویستی ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانە بەتایبەتی لای توێژی گەنجان و هەرزەکاران لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی شڵەژانی دەروونی و کۆمەڵایەتی و زیانی تەندرووستی.

- **نیشانەکانی ئاڵوودەبوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان:**

١. زیادەڕۆیی: بەکارهێنەر بەردەوام ئارەزوو دەکات بۆ کاتێکی زیاتر بەدیار ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە بێت بۆ تێرکردنی ئارەزووەکانی کە جاران بەکاتێکی کەمتر دەگەیشتە حاڵەتی تێربوون.

٢. وابەستەبوون: لە نێوان ئینتەرنێت و بەکارهێنەردا بەهۆی زیاد لە پێوستی بەکارهێنانییەوە دروست دەبێت بەشێوەیەک ئەو کەسە ناتوانێت لێی داببڕێت و، هەرکات بۆ ماوەیەکی دیاریکراو لێی دوور بکەوێتەوە تووشی بارێکی دەروونی و جەستەیی نالەباری دەکات وەک: دڵەڕاوکێ و شڵەژان، ئەگەر ماوەکە درێژ بخایەنێت دووچاری خەمۆکی و دڵتەنگی دەکات.

٣. گۆشەگیری: ئاڵوودەبوون وادەکات لە کەسی تووشبوو دەستبەرداری ئەرکە خێزانی

و کۆمەڵایەتی و وەزیفییەکانی بێت، کەمتەرخەمی بنوێنێت لە کارەکانیدا وەکو لە هەندێ فەرمانگەی حکومی لای هەندێ فەرمانبەر دەیبینین.

٤، تێکچوونی پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکان یان دواکەوتن لە چوونە سەر کار و تەمبەڵی.

٥، کەمخەوی یان کەمبوونەوەی ماوەی خەو، زۆربوونی حاڵەتی خەوتن بەدانیشتنەوە و بەدیار ئینتەرنێتەوە، بەئاگاهاتنی لەناکاو و لەپڕ سەیرکردنی پۆستی ئەلکترۆنی و پۆستەکانی لە تۆڕەکۆمەڵایەتییەکان و تەماشاکردنی لایک و کۆمێنتەکانی.

٦. بەردەوام قسەکردنی بێ هۆ و بێ مەبەست لە کۆڕ و کۆبوونەوەکاندا بۆ کەسانی دەوروبەری دەربارەی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان و ئەکاونتەکەی لە فەیسبووک بۆ نموونە و پۆست و وەڵامەکانی.

**- هۆکارەکانی ئالوودەبوون بە تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان**

١. دەستبەتاڵی و بەسەربردنی کاتێکی زۆر بەبێ ئەنجامدانی کارێک ئەو کەسە تووشی بێزاری دەکات و بەدوای شتێکدا دەگەڕێت کە ئەو کاتە زۆر و بەتاڵەی بۆ پڕبکاتەوە.

٢. تەنیایی و نەبوونی هاوڕێ یان دوورەپەرێزیی و حەزنەکردن بە هاوڕێیەتی.

٣. بوونی کێشە و گرفتی ئابووری و بێکاریی و هەژاری، کە دواتر تووشی فشاری دەروونی دەکات، بۆ خۆدزینەوە و و ڕاکردن لە واقیع خۆی سەرقاڵ دەکات بەبەکارهێنانی ئینتەرنێت و تۆڕەکۆمەڵایەتییەکانەوە.

٤. هەرزانی و خێرایی و ئاسانی بەکارهێنان و سەرنجڕاکێشی ئینتەرنێت و تۆڕە کۆمەڵایەتییەکان.

٥. بوونی هەندێ نەخۆشی دەروونی و ناتەواوی جەستەیی پاڵنەر و هۆکارن بۆ کەمکردنەوە و لەبیرکردنی خەم و مەینەتییەکان لەلایەن کەسی بەکارهێنەرەوە بۆ ماوەیەکی کاتی.

**کاریگەرییە نەرێنییەکانی بەکارهێنانی سۆشیال میدیا:**

**یەکەم: کاریگەرییەکانی لەڕووی تەندرووستییەوە:**

١. کەمخەوی یان کەمبوونەوەی ماوەی خەوتن و نارێکی لە خەودا و خەوزڕان و، هەستکردنی بەردەوام بەماندوویێتی و لەش داهێزران و خەواڵوویی.

٢. زیانی تەندرووستی و ئازاری جەستەیی بەتایبەتی لە مل و مەچەک و پەنجەکانی دەست و چاو و بڕبڕەی پشت، بەهۆی بەکارهێنانی کیبۆرد و ماوس و زۆر دانیشتن و جووڵەنەکردن و چەمانەوەی مل و پشت بۆ ماوەیەکی زۆر، هەروەها ئەو تیشکە زیانبەخشانەی کە لە شاشەی کۆمپیوتەرەکەوە دەردەچێت.

٣. قەڵەوی، بەهۆی ئالوودەبوون بەئینتەرنێت و زۆر دانیشتن بەدیارییەوە و وەرزش و جووڵەنەکردن.

**دووەم: کاریگەرییەکانی لەڕووی دەروونییەوە:**

١. چوونە نێو جیهانی خەیاڵ و ئەندێشە و ئەو گریمانانەی کە تۆڕی ئینتەرنێت پێشکەشی دەکات و دوورکەوتنەوە لە ژیان و واقیعی کۆمەڵایەتی.

٢. لاوازبوونی تواناکانی تاک بۆ درووستکردنی کەسێتییەکی دەروونی جێگیر و هاوسەنگ و بەهێز، تاوەکو بتوانێ بەشێوەیەکی دروست مامەڵە و کارێک لەگەڵ کۆمەڵگەی دەوروبەریی و واقیعدا بکات.

**سێیەم: کاریگەرییەکانی لەڕووی کۆمەڵایەتییەوە**

١-ئاستی کارلێکی کۆمەڵایەتی و خێزانی تاک بەرەو لاوازی و کەمبوونەوە دەچێت و زیاتر حەز بەداخران و دوورکەوتنەوە و گۆشەگیری دەکات.

٢-کەمبوونەوەی ئاستی چاودێری خێزانی بۆ مناڵ.

٣-زیادبوونی ڕێژەیی هەڵوەشانەوەی خێزان و پچڕانی پەیوەندی خێزانی و شیرازەی کۆمەڵایەتی.

٤-دزەکردنی بەها کۆمەڵایەتییە نامۆ و نەگونجاو و خراپەکان بۆ ناو خێزان و کۆمەڵگە و، کارلێکردن لەگەڵ کلتووری هاوردەی بیانی و جیهانی دەرەوە، هاوکات بڵاوبوونەوەی بەها و نەریت و دیاردەی ناجۆر و ناپەسەند لە کۆمەڵگەدا.

دوا وێستگە: بێگومان هەروەکو تەکنەلۆژیا؛ سیستەمی بازرگانی و پەروەردە و ڕاگەیاندن و هەموو ئەوانەی گۆڕیوە و هەموویانی کردووە بە ئەلکترۆنی وەکو بازرگانی ئەلکترۆنی، پەروەردەی ئەلکترۆنی و خوێندن لە دوورەوە (التعليم عن بعد) و ڕاگەیاندنی ئەلکترۆنی (Electronic Media). بەهەمان شێوازیش کاریگەری بەرچاوی هەیە لەسەر گۆڕینی دابونەریتی کۆمەڵایەتی و بەها ڕەوشتی و کۆمەڵایەتییەکان و ڕەفتار و پۆشاک و مۆدێلی خۆڕازاندنەوە و سەرهەڵدانی توندوتیژی کۆمەڵایەتی و خێزانی و...هتد. لەمڕووەوە چەندین زاراوەی نوێ هاتووەتە کایەوە وەکو سێکسی گەردوونی (Cyber Sex) و لاقەکردنی گەردوونی (الاغتصاب الكونى) (Cyber Rape) و هەڕەشەی کۆمەڵایەتی (التهديد الاجتماعى) و...هتد.

هەروەها هەموو تاکێک لەمڕۆدا دەتوانێت بەشێوەی ئەلکترۆنی و بە چەندین شێوازی جیاواز لە ڕێگەی بەکارهێنانی خزمەتگوزارییەکانی ئینتەرنێتەوە وەکو ئیمەیڵ و چات و سکایپ و ڤیدیۆ کۆنفرانس و ماڵپەڕ و پەڕە ئەلکترۆنییەکانەوە پەیوەندییە کۆمەڵایەتییەکانی لەدوورە و بەشێوەی ئەلکترۆنی (Electronic social relation) لەگەڵ بەرامبەردا ئەنجامبدات و ئاڵوگۆڕی زانیاریی و بیروڕا لەگەڵ یەکتردا بکەن.

# سەرچاوەکان


**یەکەم/ سەرچاوە عەرەبییەکان:**

١-د.اديب محمد خظور، علم الاجتماع الإعلامی، دار المسيره للنشر والتوزيع، عمان،٢٠١٥.

٢-د.بلقاسم سلاطنية واخرون، علم الاجتماع الإعلامی، دار الفجر للنشر والتوزيع، القاهرة، ٢٠١٢.

٣-د.موسى على الشهاب، علم اجتماع الإعلام، دار أسامة للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١١.

٤-د.منال ابوالحسن، اساسيات علم الإجتماع الإعلامی، دار النشر للجامعات، القاهره، ٢٠٠٧.

٥- د.محمد على البدوی، دراسات سوسيو اعلامية، دار النهضة العربية، بيروت، ٢٠٠٦.

٦-د.سناء جبور، الإعلام الإجتماعی، دار اسامه للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١٠.

٧-عزام ابوالحمام، الإعلام والمجتمع، دار اسامه للنشر والتوزيع، عمان، ٢٠١١.

٨-د.منى سعيد الحديدی ود.سلوى امام علی، الإعلام والمجتمع، الدار المصرية اللبنانية، بيروت، ٢٠٠٤.

٩- د.حسن عماد مكاوی، تكنولوجيا الإتصال الحديثة فی عصرا لمعلومات،مطبعة دار المصريه اللبنانية، الطبعة الثالثة، القاهره، ٢٠٠٣.

١٠- جعفر حسن جاسم الطائی، التطبيقات الإجتماعية لتكنولوجيا المعلومات، مطبعة دار المناهج، عمان، ٢٠٠٦.

١١- د.ذياب البداينة، الامن وحرب المعلومات، مطبعة دار الشروق، عمان، ٢٠٠٦.

١٢- اعمال ندوه الإختراق الإعلامی للوطن العربی، (القاهره، ٢٣-٢٤/ تشرين الثانی / ١٩٩٦)، الطبعة الثانية، (بدون اشاره الى اسم المطبعة ومكان الطبع)، ١٩٩٩.

١٣- د.حسن رضا النجار، علم المعلومات، المنهج الدراسی للمرحلة الثالثه للطلاب كلية الإعلام / جامعه بغداد، ٢٠١٤.

١٤- سلطان مسفر مبارك، دور شبكات التواصل الإجتماعی فی خدمة العمل الانسانی، بحث مقدم لملتقى العمل الانسانی بالمملكة العربية السعودية، المركز الدولی للابحاث والدراسات، السعودية، ٢٠١٥.

١٥-عبدالكريم على الدبيسی و زهير ياسين الطاهات، دور شبكة التواصل الإجتماعی فی تشكيل الرأی العام لدى طلبه الجامعات الاردنيه، مجله دراسات العلوم الإنسانية والإجتماعية، المجلد ٤٠، العدد ١، عمان، ٢٠١٣.

١٦-د.بشرى جميل الراوی، دور شبكات التواصل الإجتماعی فی التغيير، مجله الباحث الإعلامی، العدد ١٨، جامعة بغداد، ٢٠١٣.

١٧- احمد مغربی، شبكات التواصل الإجتماعی جزء من ذواتنا الممتدة، مجلة الإنسانی، العدد ٥٨، شتاء ٢٠١٥.

١٨- وليد خالد احمد حسن، الإنترنيت والمنظومة التكنو-اجتماعية، مجله تواصل، العدد ١٥، تموز ٢٠٠٧.

١٩-د.سعود الكاتب، الكتاب الالكترونی، مجله تواصل، العدد ١٩، كانون الاول ٢٠٠٧.

**دووەم/ سەرچاوە کوردییەکان:**

٢٠- د.حەمید جاعد دلێمی، کۆمەڵناسی ڕاگەیاندن، و.محەمەد عەبدوڵڵا کەلاری، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێرن ٢٠١١.

٢١- پێشچوونە میدیاییەکان، و. لەسویدییەوە سیاوەش گۆدەرزی، چاپخانەی دەزگای ئاراس، هەولێر، ٢٠١٢.

٢٢.عەبدولخالق ئیبراهیم، میدیای کوردی لەسەردەمی ئاسمانە کراوەکاندا، چاپخانەی دەزگای موکریانی، هەولێر، ٢٠١٤.

٢٣-فائیز ئیبراهیم محەمەد، کۆمەڵناسی، چاپخانەی ڕۆژهەلات، هەولێر، ٢٠١٣.

بیرەوەرییەکانی
مەولود باوەمراد

ئەڵقەی نۆیەم و کۆتایی
بەشی یەکەمی یاداشتەکان





پاش نزیکەی پێنج ساڵ مانەوە لە ئێران لە مانگی ١١ی ١٩٩١ لە ئۆردوگای کامیارانەوە بەماڵەوە گەڕامەوە بۆ کوردستان.

## چالاکیەکانم  پێش ڕاگەیاندنی یەکگرتوو

پاش گەڕانەوەم لە ئێران ئەرکی ڕێکخستن و کاری ناوخۆیی ڕێکخستنی ئەم هێڵەم نەبوو، ئاگام لە هیچ کار و چالاکییەک نەبوو، ئەوەندە نەبێت دەمزانی مامۆستا سەڵاحەدین بەرپرسی ئەم هێڵە ئیخوانییەی کوردستانە، ئیتر کێ ئەندامی شورایە و ڕێکخستن چۆن ڕێکخراوە؟ کێ بەپرسە لە بەشەکانی؟ کۆبوونەوەکان چۆن دەکرێن و ناوەڕۆکی مەنهەج چیە و چۆن پیادە دەکرێت؟ کاری سەرەکیم بریتی بوو لە بەڕێوەبردنی ناوەندی ڕۆشنبیر و بەرپرسی بنکەی سەرەکی کۆمەڵەی نووسەران، و ڕاپەڕاندنی کارەکانی گۆڤاری پەیام وەک گۆڤاری کۆمەڵەکە و وەک جێگری سەرنووسەر و پاشان سەرنووسەر.

زۆربەی کۆبوونەوە و بەیەکگەشتنی ڕۆژانەی بەرپرسانی کۆمەڵەی ئیخوانی کوردستان لە بارەگای کۆمەڵەی نووسەرانی ئیسلامیی کوردستان و گۆڤاری پەیام و دەزگای ڕابیتە بەڕێوە دەچوو. دواتر لیژنەیەکی سیاسییان دامەزراند مامۆستا محەمەد فەرج بەرپرسی بوو، بەندەش لەو لیژنەیە بوومە ئەندام، هەرجارە بابەتێک کە مامۆستا محەمەد دەسنیشانی دەکرد دەخرایە بەرگفتوگۆ و قسەلەسەرکردن، چەند خاڵێک وەک ئەنجامی گفتوگۆکان یاداشت دەکران.

شرۆڤەی سیاسی هونەرێکی سیاسی گرنگە، بۆ پێشبینی ڕووداوەکان و خەملاندنی ئاڕاستە و پاڵنەری جوڵەی کارەکتەرەکانی و گریمانەی ئامانجەکان، دەستنیشانکردنی ڕادەی پەیوەندی ئەو ڕووداو و پێشهاتانە بەو حیزب و ڕێکخراوەوە و کاریگەرییەکانی لەسەری، تائێستەی سەردەمی تەکنەلۆجیای زانیاریی و پەیوەندی تۆڕی ئەنتەرنێتی جیهانی، کە هەر هەواڵ و ڕووداوێک لە چرکەیەکدا ئەمسەر و ئەوسەری جیهان دەکات، ڕەونەق و بایەخی خۆی لەدەستنەداوە و بووەتە کاری پسپۆڕیی سەدان ناوەند و دامەزراوەی لێکۆڵینەوەی جیهانی و ناوخۆیی، کەرەسە و ئامرازی سەرەکی ئەم هونەرە «زانیاری و داتا»ی ڕاست و دروستە لە سەرچاوەی متمانەپێکراوەوە بەدەستبهێنرێت. بەڕای بەندە تا ئەمڕۆشی لەگەڵدا بێت حیزب و کۆمەڵەی ئیسلامیی لەم بوارەدا هەژار و دەستکورتە، لەلایەک تووشی شۆکی ڕووداوەکان دەبێت و لەلایەکی ترەوە عەقڵیەتی پیلانگێڕی بۆ هەموو شتێکی گەورە و بچووک بەکاردەهێنێ، خۆی دەداتە پەنای ئەو قەناعەتەی کە ئەوەی لێی ڕوودەدات و بەسەریدا دێت، شەڕی حەق و باتڵە و دوژمنانی دینی خوا لە پیلان و دژایەتی دین و ئەهلی دین ڕاناوەستن؟ ئەگەر گریمانەی ئەوە بکەین ئەم ڕوانین و تەفسیرە بۆ هەموو کات و بۆ هەموو ڕووداوێکیش ڕاست بێت، خۆ ڕێگرنییە لەوەی ئەم ئامرازەی هونەری سیاسەتکردن بەکاربهێنرێت؟ ڕاستییەکە ئەوەیە گرفتی هەبوونی زانیاریی و داتا هەیە.

هەر لەوماوانەدا ناوەناوە وەک موحازیر لە خولەکانی ڕێکخستندا بەتایبەت

خولەکانی ڕێکخستنی قوتابیان و خولێکی ڕاگەیاندن کە ڕابیتەی ئیسلامیی ڕێکێخستبوو بەشداریم دەکرد. بە ساڵێک پێش ڕاگەیاندنی حیزبی یەکگرتوو، کرامە بەرپرسی «کەرت» کە گەڕەکی مامۆستایان و بەشێک لە گەڕەکی کارێزە وشکی دەگرتەوە، بەڕێز مامۆستا «حەمەڕەشید ماوەتی» بەرپرسم بوو، نەشمدەزانی و نەشمپرسی ئەو لە چ جومگەیەکی ڕێکخستنەوە بەرپرسی بەندەیە کە منی تیا بوومەتە بەرپرسی ئەم کەرتەی ڕێکخستن؟ بەڵام لەبەرئەوەی پێشتر شارەزای ڕێکخستنی ئیخوان بووم، دەمزانی مامۆستا حەمەڕەشید بەرپرسی ناوچەیە، چونکە هەرناوچەیەک لە چەند کەرت و هەرکەرتەش لە چەند ئوسرە و هەر ئوسرەیەکیش وەک یەکەی بنچینەیی ڕێکخستنی ئیخوانی چەند ئەندامێک لەخۆدەگرێت.

وەک تاکەکەس ماوەیەکی کورت لەو سەرەتاوە پەیوەندیم لەگەڵ کاک سۆران سێوکانی و کاک کوردستان سێوکانی هەبوو، هەر لەو سەروبەندەدابوو کاک کوردستان سێوکانی کرایە سەرۆکی لقی سلێمانی ڕابیتەی ئیسلامیی کوردستان.

### بەرائەتی من و تورەیی محەمەد ئەحمەد ڕاشد

لە نیسانی ١٩٩٣دا کەسایەتی ناوداری کۆمەڵەی ئیخوان موسلمینی عێراق، نووسەرێکی بەناو و دەنگی بواری بانگەواز، کە ئەوکات بەرپرسی ڕێکخستنی ئیخوانە عێراقییەکانی دەرەوە بوو «محمد احمد ڕاشد» سەردانی کوردستانی کرد، تەواوی ڕێکخستنەکانی ئیخوانی هەرێمی بەسەرکردەوە لە شارەکان سلێمانی و هەولێر و هەڵەبجە و دهۆک، ژمارەیەک موحازەرە و کۆڕ و سیمیناری ناوخۆیی پێشکەش کردین، بەشێکی زۆرمان لە ڕێگەی زنجیرە کتێبەکانی »أحياء فقه الدعوة« مونتەلەق و عەوائق و ڕەقائقەوە، زۆر پێشتر دەماننناسی، بەندە لە قۆناغی سێیەمی کۆلێژی ئیدارە و ئابووری  زانکۆی موسڵ بووم، لەگەڵ قوتابیەکی یەمەنی بووینە ناسراو، کەسێکی سەر بە ڕەوتی ئیخوانی ئەو وڵاتەبوو، کاتێ ویستی بۆ پشووی نیوەی ساڵ بگەڕێتەوە داوای ئەو زنجیرە کتێبەم لێکرد، ماڵی ئاوا بۆی هێنام و کۆڵێک دڵخۆشی کردم.

بۆ هەندێ کاروباری ناوەندی ڕۆشنبیر چووبوومە هەولێر، سەردانی بارەگای ڕابیتەی ئیسلامیم کرد، دەبینم شێخ ڕاشد -محمد احمد راشد- لەوێ کۆبوونەوەی بۆ سازدراوە، پاش کۆبوونەوە دوور لە تەبیعەتی خۆم کە زەوقی خۆ عەرزکردن و خۆنمایشم نییە، گووتم بە مامۆستا صەڵاح دەمەوێت هەندێ باسی کاروچالاکی ناوەندی ڕۆشنبیری بۆ بکەم، گووتی باشە و مۆڵەتی بۆ وەرگرتم: دەستم بەقسەکردن کرد، لەمیانی قسەکاندا گووتم: نامەی هاوکاریمان بۆ  دکتۆر توتنچی بەرپرس لە مەعهەدی عالەمی بۆ فیکری ئیسلامیی نووسیوە و هاوکاری کردوین، کتێبەکانیان لەڕووی فیکری ئیسلامییەوە باشن و دەمانەوێت، چاپیان بکەین! قسەکەم تەواوکرد و

گنەکرد، زۆرتوند تورەبوو، ووتی: ئەمانە کار لە دژی ڕێکخستنی ئیسلامیی و کاری ڕێکخستن دەکەن و ئەمانە کاریان مەشبوهە و کەس نازانێ بەمکارەیان خزمەت بەکێ دەکەن، پێویست نییە نووسین و بیری ئەمانە لەناو جەماعەتدا بڵاوبکرێتەوە و بایەخی پێبدرێت و ...هتد، منیش هەڵبزڕکام و نەمزانی چۆن وەڵامی ئەم هەڵچوونە کتوپڕە چاوەڕوان نەکراوە بدەمەوە، مامۆستا صەڵاح کە لە تەنیشتمانەوە وەستابوو، بەکوردی گووتی: تۆ بۆگەشتیتە ئەوێ ؟ گووتم: جا جوزانم وامزانی قسەیەکی باش دەکەم؟

**لێکترازانی کۆتایی**

کاتێک برایانی هێڵی مامۆستا صدیق لە هەوڵەکانیان بۆ بەدەستهێنانی ڕەسمیەتی کارکردن بەناوی ئیخوانەوە، بەهەر شێواز و سیغەیەک بێت، گەیشتنە بەردەم درگای داخراو، لە کۆبوونەوەیەکی فراوانی ژمارەیەک سەرکردە و کادیری هێڵەکەدا لە سلێمانی و لە ڕۆژی ٢٢/ ١١/ ١٩٩٢دا هەڵوێستی کردەیی خۆیان بە دامەزراندنی کۆمەڵەیەکی ئیسلامیی بەناوی «بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی لە کوردستان» لەمیانەی بەیاننامەیەکدا بە زمانی عەرەبی نیشاندا. واتە میانە زەمەنی نێوان نامەکەی «دکتور ئەبولەیس» کە لەبری قیاد ئیخوانی دەرەوە نووسیبووی، تیایدا ڕایگەیاندبوو ئەوان تەنها ئەو کەسانە بە ئیخوان دەزانن کە لەژێر قیادەی «ئەبو پەیام»دا کاردەکەن، لە ١٩ی نیسانی١٩٩٢ وە بۆ ڕاگەیاندنی بزوتنەوەی ڕاپەڕین ١٩٩٢/١١/٢٢ بەڕۆژیش حسابکرێت دەکاتە (٧) مانگ.

**ئەم تەڕەدستی و خێرا هاتنەدەستە بۆ ڕاگەیاندنی کۆمەڵەیەکی سیاسی ئاماژەی دوو شتە:**

یەکەم: ئەو بڕیار و هەڵوێستەی قیادەی ڕێکخستنی ئیخوانی عێراقیان لا چاوەڕوانکراو بووە، خۆیان بۆ ئامادەکردووە، پێشتریش لە ناوەوەی هێڵەکەدا ئەوڕایە هەبوو، کە ئەم پەیوەندییە ئەو هەموو ڕاکە ڕاک و مەجبوربوونەی ناوێت، وەک ئەو هەموو حیزبەی کوردستان ئێمەش حزبێکی سیاسی تەشکیل دەکەین؟ دەبێ ئەوەش بڵێین بەشێکی ڕەگی پاڵنەری ئەم تێگەشتن و بۆچوونەی حیزب دروستکردن و جیابوونەوەیە لەناو خاکی پشتبەستن بە بزوتنەوەی ئیسلامیی و مەیلی چەکدارییەوە ئاوی دەخواردەوە، چونکە هەرکاتی دامەزراندنی بزوتنەوەی ئیسلامیی و مشتومڕەکانی ناو ئۆردوگای سەریاس ژمارەیەکی بەرچاو لە برایانی ئێمە لە هێڵی مامۆستا صدیق لەسەر ئەو ڕایە بوون و بەو ئاراستەش پاڵیان بە گفتوگۆ ناوخۆییەکانی خۆمانەوە دەنا، کە لەگەڵ مەرحومی مامۆستا مەلا عوسمان چەک هەڵگرین، بەو ئیعتبارەی مەرحومی مامۆستا ئەمیری کاری ئێمەی ڕێکخستنی ئیخوانی کوردستانە و ئێستە فەتوا و فەرمانی بەجیهاد کردووە، پێویستە گوێڕایەڵی بین.

دووهەم: هەبوونی ڕێکخستنێکی کارای ئامادە لە چوارچێوەی پەیکەرێکدا، ئەرک

و پێگە و پلەکانی ئەندامانی تیا دابەشکراوە، بەهەندێ ڕێکاری ئاسایی لەچوارچێوەی پەیڕە و پرۆگرامێکی ناوخۆ دەبێتە حیزب، بەڵام ڕاگەیاندنی کۆمەڵەیەکی سیاسی!! لەژێرزەمینەوە بۆ سەرزەمین و لە ماڵی خۆیەوە بۆ بەردەم جەماوەر و ڕای گشتی ئەوە ساتەوەختی لەدایکبوونی ڕاستەقینەی هەر حیزب و کۆمەڵەیەکی سیاسییە بۆ دەستبەکاربوونی ئەرکە ڕاستەقینەکانی، گرانترین ئەرکە حیزب و کۆمەڵەی سیاسی ڕووبەڕووی دەبێتەوە، مەرج و پێویستی و ئامراز و توانا و تەکنیکی کارکردنی جۆراوجۆری گەرەکە، دواتر ئاماژەی بۆ دەکەین...

بزوتنەوەی ڕاپەڕین وەک قەوارەیەکی ڕێکخراوی ئیسلامیی بوویە دەرهاویشتەیەکی کردەیی بەرجەستەکردنی ئەو دابڕان و نەسازان و ململانێ ناوخۆییەی نێوان دووهێڵی ئیخوانی هەرێم کە لە هیچ قۆناغێکیدا ڕەگ و دەماری جیاوازی فیکریی و ئەندێشەیی نەبووە، هەر لەسەرەتاوە پرسی هەبوون یان نەبوون؟ کارکردن یان کارنەکردن بەئامراز و تەکنیکی ڕێکخستن، بوویە بنکەی ڕاگری ئەم جیاوازییە و دواتر جۆرەها شتی کەسی و دەروونی و پەنابردن بۆ دەرەوەی خودی کارەکتەرە کوردییەکە و بابەتی شەرعیەتی کارکردن بە مۆڵەتی ئیخوانی و....هتدی تێوەگلاو کەلێنە دەروونی و ڕێکخراوەییەکەی نێوان هەردوولای هێندە قوڵ و بەرین کرد، توانای بەیەکگەشتنەوە و ڕێگەی پێکەوە سازان و پێکەوە کارکردنی ئەستەم کرد. ئەگینا مەگەر کەسێک ڕێژەیەکی ماقوڵ گەوج بێت! هۆکاری فیکریی و مەنهەجی و ڕێکخستن، بداتە پاڵ ئەم ناکۆکی لێکدابڕانەی ئەوکات لە زەمەنەکەی خۆیدا.

### کاردانەوە جیاوازەکان

کاردانەوە ناوخۆییەکانی هێڵی مامۆستا سەڵاح، بەرامبەر ڕاگەیاندنی کۆمەڵی «بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی کوردستان» لەبەرئەوەی هێڵەکە ئەوکات خۆشی هێشتا لەچوارچێوەی قەوارەیەکی ئاشکراو ڕاگەنراودا نەبوو، لەلایەکی ترەوە کۆبوونەوەی بڕیاری ڕاگەیاندنی بزوتنەوەکە وەک کارێکی ناوخۆیی هێڵی مامۆستا صدیق لە ماڵی یەکێک کادیرە پێشکەوتووەکانیدا لە سلێمانی ئەنجامدرا، بێ بەستنی کۆنگرە و کۆنفرانس و لافیتە و بڵاوکراوە.

ڕای کەسە سەرکردە و خاوەن پێگەکان لەسەر ئەم ڕووداوە ئەوەندەی بەندە ئەو کات لێی ئاگاداربووم دابەشببوون بەسەر ئەم چەند بۆچوونەدا:

١- ئەندامە کارا و مەیدانییەکانی ڕێکخستن، ئەوانەی بەزەم و غەیبەت و تانە و توانج و تەنانەت شتی هەڵبەستراویش لەکار و کاردانەوەی هەردوو هێڵدا برژابوون، ڕایانوابوو درگایەکی خراپ لەکاری ئیسلامیی کوردستان کرایەوە، ئیتر لەمەودوا هەر بۆ وەڵامدانەوەی ئەو پرسیارەی ئەمانە کێن و بۆچی لە ئێوە جیان؟ لەلایەن خەڵکە

دۆست و هەوادارەکانمان و بەشێکی ئەڵقە سەرەتاییەکانی ڕێکخستن لەلای ئێمەوە؟ لەلای ئەوانیشەوە ئێوە کێن بۆچی لەگەڵ برایانی ئیخوانی جەماعەتی مامۆستا سەڵاح نین؟ جیاوازیتان چیە؟ درگای هەمبانەی هەزاران ناو و ناتۆرە و غەیبەت و تانە و ڕکابەری ناتەندروست بەپاساوی خۆجیاکردنەوە و نیشاندانی جیاوازی دەکەوێتە سەرپشت و بە ڕەوایەتی زەرورەتی خۆجیاکردنەوەش پاساو دەدرێت.

٢-هەندێکیش لەسەر ڕا کۆنەکەی سەرەتا بوون، پێیانوابوو مامۆستا صدیق هەر لە سەرەتاوە کە خۆی نەداوە بەدەست ڕێکخستنی ئیخوانی عێراق لە دەرەوەی وڵات-ئێران- و پابەند نەبووە، و ئەم هەموو پێداگریەشی لە ئێستادا لە کوردستان بۆ بەدەستهێنانی مۆڵەتی فەرمی کارکردن بەناوی ئیخوانەوە، لەبەرخاتری بەدەستوەبوونی ڕێکخستنێکی ئیسلامییە کە جەمسەری نێودەوڵەتی و ناوبانگی فراوانی وەک ئیخوانی هەبێت، لەبەرخاتری براکانیەتی و بۆ دابینکردنی پشتیوانێکی ڕێکخراوی مەدەنی بۆ بزوتنەوەی ئیسلامیی، ڕاگەیاندنی بزوتنەوەی ڕاپەڕین هەمان ئەو ڕۆڵە دەبینێ.



**بزوتنەوەی ڕاپەڕین وەك قەوارەیەكی ڕێكخراوی ئیسلامیی بوویە دەرهاویشتەیەكی كردەیی بەرجەستەكردنی ئەو دابڕان و نەسازان و ململانێ ناوخۆییەی نێوان دووهێڵی ئیخوانی هەرێم كە لە هیچ قۆناغێكیدا ڕەگ و دەماری جیاوازی فیكریی و ئەندێشەیی نەبووە.**



٣-بەشێکی تر ئەوەندە گوێیان بەخاڵی سەرەوە قانگدرابوو، دەیانپرسی کە لەگەڵ برایان نەگەیشتنە ئەنجامێک، چۆن نەچوونەتە ناو بزووتنەوە؟ لەکۆی گشتیدا بە خاڵی کۆتایی کێشە و ناکۆکییەکی ناو ماڵی ڕێکخستنی ئیخوانی کوردستان سەیر دەکرا، نەبووە جێگەی باس و گفتوگۆی ناوخۆیی، بەڵام سەرکردە و کادیرە مەیدانییەکانی ڕێکخستن بەهەستیارییەوە چاودێری کاردانەوەکانی پاش ئەم هەنگاوە و دەرهاویشتەکانیان دەکرد.

### کاردانەوەکانم لە ڕاگەیاندنی (بزووتنەوەی ڕاپەڕین)دا

بەدڵنیایی تێگەشتن و ئەزموون و مەعریفەی سیاسی ئێستا و (٣٠) ساڵی ڕابردوو جیاوازی زۆرە، زەمەن لە جوڵان و ڕۆیشتنی خۆی ڕاناوەستێ، ئێستاکانەی ئەمڕۆ دەکاتە دوێنێ، داهاتووەکانیش دەکاتە ئەمڕۆ، هیچ مرۆڤ و کۆمەڵە و کۆمەڵگەیەکی بەشەریی، لەناو زەمەندا نەخۆی و نە کردە و پاساوەکانی بوونی توانای مانەوەیەنان

لە بەردەم حەتمیەتی گۆڕانی واقیع و پێشهاتە نوێکانیدا نیە و نابێت، کە لە هەناوی جوڵەی زەمەندا ژیان و مرۆڤ دەبنە فاکتەری دروستکردن ئەو واقیعە نوێیانەی ژیان دەگۆڕن، پاساوەکانی دەگۆڕن، حیکایەتەکانی دەگۆڕن، مانای نوێ بەقیەم و کلتوور و ڕەفتارەکان و پەیوەندییەکان دەبەخشن.

بەدڵنیایی لە ئێستای پاش ئەزموونەکانی ئەو زەمەنە، زۆرێک لە کەسایەتییە سەرکردە و بەرپرس و هەڵسوڕاوەکانی هەردوو هێڵەکە ڕا و تێگەشتنی جیاوازیان لە جۆری مامەڵە و شێوازی بەڕێوەبردنی جیاوازییەکان و هەڵویست لەسەر پرسەکان و ڕاو وێناکردنیان بۆ یەکتر و گوتار و بەربەستە دەرونییەکانی نێوانیان بۆ دروستبووە و گۆڕانی بەرچاوی بەسەردا هاتووە. بەڵام مادەم قسە لەسەر ساتەوەختی زەمەنی بیستنی هەواڵی ڕاگەیاندنی کۆمەڵەیەکە لەلایەن هێڵی مامۆستا صدیقەوە پێویستە ڕاشکاوبم، بەندە وامدەزانی ڕاگەیاندنی بزوتنەوەی ڕاپەڕینی ئیسلامیی و دەرکردن بەیاننامەی خۆڕاگەیاندنی هاوکاتە لەگەڵ کردنەوەی بارەگای حیزب لەئاستی جیاو لە شار و شارۆچکەکانی کوردستاندا بەگوێرەی هەبوونی ئەندام و هەوادار.

بیرکردنەوەی بەندە لەژێر کاریگەری سیاقە زەمەنییەکەی دۆخی ژیانی سیاسیی و حیزبی ئەوکاتەی هەرێمی کوردستاندا بوو بە هەموو مانا و ڕەهەندەکانییەوە، زۆر جیاواز و دوربوو لەو هەڵویست و پێشبینی و بۆچوونانەی برایان کە پێشتر ئاماژەم بۆ کردن، جارێکی تر بەڕاشکاوی دەڵێم: هەرچەندم دەکرد وێنای جەنابی مامۆستا صدیقم نەدەهاتە پێش چاو وەک ئەمینداری گشتی ئەم حیزبە نوێیە لەناو جەماوەری خەڵکدا گوتاری ڕاگەیاندنی بزوتنەوەی ڕاپەڕین، یان بۆ هەر بۆنەیەکی تر پێشکەش بکات؟ پرسیارم ئەوەبوو ئەم کۆمەڵە خەڵکەی لە ناو ڕێکخستنێکی ئیخوانی، بە مەنهەجیەتی وەسەتی و ئەدەبیاتی حەرەکیی و شێوازی ڕێکخستن و ڕێبازی پەروەردەی ئیسلامییی ئەوان گۆشکراوە، بە چ بەرنامەیەکی پەروەردە و پێگەیاندنی جیاواز لەوەی چەند ساڵە فێری بووین، خەڵک بەرەو ئەڵقەکانی ڕێکخستن ڕادەکێشن؟ لەناوخۆدا بابەتی دەرس و دەورەکانی ئەندامان چی دەبن؟ چۆن حزبێک لەناو ئەم فەزا سیاسییەی حیزبە نەتەوەییەکاندا، کە خاوەن داستانی خەباتی چەندین ساڵە و سەرکردە و کادیری ناسراو و خاوەن سەدان شەهیدن و ئێستەش لە لوتکەی گوتاری خەباتی دەسکەوتی نەتەوەیی و ئەزموونی حوکمڕانی کوردیدایە، وەک بەرهەمی خەبات و قوربانیدانی گەلی کورد دەبێت لە دوژمنان و تێکدەران بپارێزرێت، چۆن جێگەی خۆی دەکاتەوە؟ چۆن ئیدارەی حیزب و تێکگیران و ململانێکانی لەگەڵ حیزب و هێزەکانی تری ڕکابەر دەکات؟ وەک بڵێی من لەبری ئەوان هەستم بە دڵەڕاوکێ و پرسیار لەخۆکردن دەکرد!

## حزب و ڕێکخستنی سیاسی لە نێوان دوو قۆناغدا

حیزب و ڕێکخستنی سیاسی تا لە ماڵی خۆیدایە و لە بازنەی خەڵکە ئینتماکردووەکەی خۆیدا کار و چالاکییەکانی هەڵدەسوڕێنێت، کەموکورتی و گرفتەکانی گوتار و جوڵە و کار و ڕەفتاری سیاسیی و بیر و ڕا و هەڵوێست و ناتەواوییەکانی تری، بەڕێکاری پەیڕەو و ڕێنمایی ڕێکخستن، یان بواردنیان بە چاوپۆشی لێکردن، یان دانەدەستی چارەی زەمەن، یان بە پەردەپۆشکردنی چارەسەر دەکرێن، بەڵام لە خۆڕاگەیاندن و خۆخستنەبەر ڕۆشنایی بینینی جەماوەر، یەکەم پێویستی ژیانی گوتاری خۆپێناسەکردنە بە جەماوەر و خستنەڕووی زەرورەتی بوونی حزبێکی وەهایە بۆ کۆمەڵگە، سەربارى ئەوەی بزوتنەوەی ڕاپەڕین پێویستی بەوەڵامدانەوەی ئەو پرسیارە گریمانەکراوەی ناو زەینی جەماوەر هەبوو کە ئایا ئەو بۆشاییە چیە کە بە بزوتنەوەی ئیسلامیی و جەماعەتی ئیخوان پڕنەکراوەتەوە؟ ئێستە ئەم کۆمەڵە گەنجە و بەم ناوەوە خۆیان بۆ پڕکردنەوەی تەیار کردووە؟

کار و ئەرکی سیاسی ئەندامانی حیزب لە ناوخۆی پەیکەری ڕێکخستنەکەیدا بۆ هەر جۆرە بڕیارێک بێت، بەتایبەتی لەو حیزبانەی کە هەڵگری ئایدیۆلۆجیایەکی دیاریکراون، بەجۆرێک دیسپلین-زەبت-دەکرێت لە نووسینی ڕەچەتەی دکتۆر دەچێت!! نەخۆش ببینە و دەرمان بنووسە، بڕیار و فەرمانی سەرۆکیش لە فەتوای زانای ئایینی دەچێت گوێڕایەڵی بێ چۆن و بۆچی.

بەڵام کاتێک خۆی دەخاتە بەردەم جەماوەر و ڕای گشتی کۆمەڵگە، خەڵک ئەوەندە گێل و ساویلکە نین، ئەگەرچی ڕێژەیەک لە بێباکی سیاسییان تێدابێت، بەشێکی زۆری ئەندام و لایەنگر و هەواداری حیزبە سیاسییەکانی ناو گۆڕەپانە سیاسییەکەن، هەزار و یەک پرسیار لەسەر دەرکەوتن و هاتنەڕووی هەر قەوارەیەکی سیاسی نوێ دروست دەکەن؟ چەندین لێکدانەوە و تێگەشتن و گریمانەی بۆ پێشبینی دەکەن، بەتایبەت لە کۆمەڵگەی ئێمەدا پرسیاری یەکەم کە سادە و سەرپێی و لۆژیکی دەنوێنێ، بەڵام و لە ناوەڕۆکدا گومانخێز و چارەنووس سازە، ئەویش پرسیاری ئەمانە کێن؟ کێ بەرپرسیانە؟ چییان دەوێت؟ سەر بە چ لایەنێکن؟ لەلایەک پرسیارە بۆ زانینی بیروباوەڕ و ئایدیای سیاسی حیزبەکە تا لە ڕیزبەندی ئەوانەی هەن یان هەبوون جێگەی بکاتەوە، لە مەرامەکانی تێبگات؟ لەلای دووهەمەوە تابزانێ چ هێز و لایەنێکی لەپشتەوەیە؟ تا دواجار جۆری مۆرکی شوناسی نەتەوەیی و نیشتمانی بوون یان لێسەندنەوەی ئەو شوناسە لەدیدی خۆیەوە دەستنیشان بکات؟

حیزب و ڕێکخستنی سیاسی کە خۆی ڕاگەیاند، دەکەوێتە بەر پرۆسەی «تەزکیەی» جەماوەر، ئەگەر لە تەزکیەی جەماوەر دەرچوو ئەوکات حیزب و جەماوەر دەبنە خاوەنی یەکتری، هەم جەماوەر حزبێکی هەیە لە ڕێگەیەوە سیاسەت دەکات و هەم حزبیش جەماوەرێکی هەیە دەیگەیەننە سەر سەکۆی دەسەڵات. مەبەست لە تەزکیەی جەماوەر

ئەوەیە: سەرۆک و سەرکردە دامەرزێنەرەکانی حیزب و کادیرە پێشکەوتووەکانی ئەندامانی ناو ڕێکخستن لە تێگەشتن و دید و قەناعەتی خۆیاندا «بیروباوەڕی سیاسییان ڕاست و ڕەوایە تاڕادەی بەڵگە نەویست»، «ئامراز و میکانیزمەکانی کارکردنیان شیاو و گونجاو و گومانهەڵنەگرن»، «ئامانجەکانیان ڕەوا و ڕوونن گوزارشت لە بەرژەوەندی و خواستی جەماوەر دەکەن» ئەم قەناعەت و بڕوا دەروون حزبیە یەقینییە، بە بنەما سەرەکییە پێکهێنەرەکانی کاری حیزب و هەبوونی ژمارەیەک کەسی گەرم وگوڕی ڕێکخراو لە ڕێکخستنێکدا، بەهیچ جۆرێک نابێتە مایەی هەمان ڕوانین و قەناعەت لای جەماوەر و تاکی هاوڵاتی، بەڵکو ماوەیەکی زەمەنی ئەزمونکردنی ڕەفتار و کردار و تێگەشتن لە گوتار و ئامانج و ئاڕاستە و مەرامی حیزبی دەوێت تابگەنە بەشێک لەو قەناعەتەی کە سەرکردە و ئەندامانی حیزب و کۆمەڵەی سیاسی بەخۆیانیان هەیە، متمانەی پێبکەن و تەزکییەی بکەن.

چاوەڕوانی ئەوەی، لەبەرئەوەی حیزب هەڵگری بیر و دیدی ئیسلامییە و زەمینەی کارکردنی لە کۆمەڵگەیەکی مسوڵماندایە، ڕێکخستنێکی تۆکمە و چالاکی بە ئامراز و ئامانجی ڕەواوە خستووەتە خزمەتی دین و خواستە شەرعییەکانی ژیانی ئەوان، هەر لەوسەرەتایەوە دەبێت شاباش بکرێت و مەدالیادی شەرەف و ئازایەتی بکەن بە بەرۆکیدا لەبەرئەوەی گوایە دەسپێشخەری دروستکرنی حیزبی کردوە بۆ خزمەتی ئەوان!!! ئەوە ئەو وەهمە نابەجێ و نادروستەیە کە حیزب و کۆمەڵەی سیاسی ئیسلامیی و هەر حزبێکی تر تووشی نائومێدی و داڕمانی دەروونی دەکات، چونکە بەدڵنیایی چاوەڕوانییەکانی لە بەدەمەوەهاتن و وەڵامدانەوی جەماوەر و تاکی کۆمەڵگە بۆ حیزب لەسەر پێشبینی هەڵە هەڵچنیوە.

حزب و کۆمەڵەی سیاسی کە پێی نایە ناو دنیای سیاسەت -جیا لەوەی هەڵگری چ بیر و ئایدیۆلۆجیایەکە- دەبێتە بەشێک لە بزاوتی سیاسی کۆمەڵگە، واتە پێی ناوەتە ناو جیهانێک لە ململانێی فرە ئاست و فرە جەمسەر و فرە ڕەهەندەوە، جیهانی بەرژەوەندی ناکۆک و هاودژ و توڕەیی و بوغز و ڕکابەری و پاڵپاڵێن و فێڵ و پاشقول و بۆڕدان و بەزاندنی بێبەزەییانە!! جیهانێک لە پێکهاتن و هاوکاری و خەباتی هاوبەش و بەرژەوەندی هاوبەش، لێکتێگەیشتن، ئەمە خەسڵەتی سیاسەتە، چونکە هەوڵی دەستگەیشتنە بە دەسەڵات و هێزی دەوڵەت و بڕیارەکانی، دواجار یان سەرکەوتن بۆ لوتکە یان کەوتنە خوارەوە بۆ بنکە. جولیان فرۆند لەمبارەوە دەڵێت: کاری سیاسی وەک تورەکەی سەفەر وایە، هەمووشتێکی تیادا دەستدەکەوێت، جلوبەرگ و نینۆگر و خواردن و چەقۆ و ئاوێنە و موکێش، لایت و فیشەکدان و دووربین....هتد.

## سەرنج لەسەر دوو تێگەیشتن

یەکەم: هەندێک لە برایانی بزوتنەوەی ڕاپەڕین لە وەڵامی ئەو پرسیارەی بۆچی مامۆستا صدیق ئەوەندە پێداگریی و هەوڵی بەردەوامی دەدا، بۆ بەدەستهێنان و وەرگرتنی مۆڵەت و شەرعیەتی کاری ئیخوان؟ لەوەڵامدا وتوویانە: لەبەرئەوەی مامۆستا صدیق وایدەزانی بێجگە لە ڕێگەی ئیخوان حزبایەتی ناکرێت!! بەجیا لەوەی هەڵوێست و تێگەشتنی کەسیمان بۆ کۆمەڵەی ئیخوان چیە و چۆنە؟ لەڕووی ڕوانین بۆ وێنە گەورەکەی جوڵانەوەی ئیسلامیی-الحركه الاسلامية- لە سەرتاسەری جیهانی ئیسلامیدا، بەتەواوی جۆر و ئاڕاستە و ژینگە و فەتوا و تەئویل و قیادە و میکانیزمی کارەوە، تائێستەش لە سێ مۆدێل-نموزەج- کە خاوەن مەنهەجی تایبەت بە خۆیانبن تێپەڕی نەکردوە، یەکەم: مۆدێلی کاری ئیخوانی بە هەموو نموونە جیاوازەکانییەوە. دووهەم: مۆدێلی حیزبی تەحریر، سێهەم: کۆمەڵە جیهادییەکان بە هەموو تەئویلەکانیانەوە.

ئەوەی ڕێکخستنێک بە نووسینی پەیڕە و پرۆگرامێکی کۆکراوەی لێرە و لەوێی ئەزموونی حیزبەکانی تر یان کۆپیکردنی پەیڕەو و پرۆگرامی ڕەوتێکی دیاریکراو، حزبێک پێکەوەبنێ نابێتە خاوەنی مەنهەج و ڕەوتێکی فیکری، وەک: حیزبە چەپ و کۆمۆنیستەکان، یان وەک: کۆمەڵەی ئیخوان، لەبەرئەوە بۆچوونەکەی مامۆستا لەڕووی فیکریی و مەنهەجیەوە ڕاست و بەجێ بوو؟ نەک ئەو بۆچوونەی لەڕووی واقیعی ململانێ لۆکاڵییەکەی ئەو دووهێڵەی تێکەوتبوو.

دووهەم: ئەو قسە و وەسفەی کە زۆرجار برایانی هێڵی مامۆستا صدیقی نیگەران و هەراسان دەکرد، بەرپرس و کەسایەتییە ئیخوانییەکانی هێڵی مامۆستا سەلاح، بەوە وەسفی بەرپرس و سەرکردە و خاوەن بڕیارەکانی ئەوانیان بەچاوی کەم سەیر دەکرد و بەتانە لێدانەوە پێیان دەوتن: کۆمەڵێک گەنجی بێ ئەزموونن.

ئەم ڕوانین و قسەیە لە تێگەیشتنی کەسانی ناو کۆمەڵەی ئیخوان بەگشتی بوونی هەیە، بە تەنها پەیوەندی بەدۆخی ململانێ و ناکۆکییەکانی ئەوکاتەی نێوان هەردوو هێڵەکەی کوردستانەوە نەبووە، بەڵکو پەیوەستە بەسرووشتی پەروەردە و پێگەیاندنی ئەندامانی کۆمەڵەکە، چەندین پلە و ئاستی جیاوازی هەیە، پێویستە کەسی ئینتماکرد و ئەو پلانە تێپەڕێنێ تا دەگاتە ئاستی هەڵگرتنی بەرپرسیارێتی ناو کۆمەڵەکە، کە لە زۆربەی پەیڕەوەکانی ناوخۆی کاری ڕێکخستنی ئیخواندا بە(٥) پلە دیاریکراون، هەر قۆناغەی ماوەی تایبەتی خۆی بۆ دیاریکراوە لە نێوان ساڵێک بۆ شەش ساڵ-بڕوانە خلیل عنانی داخل الاخوان، ل:١٤٢-. ئەو ڕاستییەش لە بیرنەکەین، بەم پێوەرەی سەرەوە لەناو سەرکردەکانی برایانی بزوتنەوەی ڕاپەڕیندا تەنها مامۆستا صدیق و یەک دوو کەسی تر بە پلەی خوارتر دەکرا بەخاوەنی تەمەنی ئەزموونی ئیخوانی ناوزەد بکرێن.

## ڕەهەندەکانی خۆجیاکردنەوە

حیزب و کۆمەڵی جیا یانی هەبوونی جیاوازی، ئەگینا مانایەک لە بوونیدا نامێنێ، برایانی بزوتنەوەی ڕاپەڕین ئەم لۆژیکەیان لا ڕوونبوو، بۆئەوەی ناوەڕۆکێکی فیکریی و ڕێبازێکی نوێ بکەنە بابەتی پەروەردە و پێگەیاندنی ڕێکخستنەکانیان و ماددەی دروستکردنی شوناسێکی نوێ و گرتنەخۆ و کەسبی ئەندامی نوێ، جگەلەوەی خاڵێکی بەیاننامەکە تایبەتکرابوو بە ڕەتکردنەوەی پرسی مۆڵەت و بێ مانایی ئەم پرسە«مۆڵەت لەلای سەلەفی صالح و مەنتیق و واقیع و، هەروەها لای شەرعی خوداش جێگە نیە«، ئەم چەند ئامراز و تەکنیکەیان بەکارهێنا:

١-لە سەرەتای ڕاگەیاندنی بزوتنەوەکەدا نامیلکەیەکی ناوخۆیی (١٤) خاڵیان بەناوی»خاڵە سەرەکییەکانی جیاوازی نێوان ئێمە و ئەوان» لەناو ڕێکخستنەکانیاندا بڵاوکردەوە، کە بەزۆری کۆکراوەی ئەو مشتومڕ و چەلەحانێ و گفتوگۆی بەرامبەرکێیە بوو کە لە ماوەکانی ڕابردوودا لە نێوان هەردوو هێڵەکەدا گوزەرابوو.

٢- هەڵگردنی دروشمی «سەلەفیەت لە ڕێباز و هاوچەرخی لە ڕووبەڕووبوونەوەدا»، بۆئەمەش خاڵی دووەمی ستراتیژیەتی کۆنگرەی یەکەمی بزوتنەوەکە تایبەتکرابوو بە: «گرنگیدان بە خۆئامادەکردن و بەهێزکردنی ڕۆحی جیهاد» و چەند خاڵ بۆ پیادەکردنی دەستنیشانکراوە، دواتر لە ڕووداوەکانی شەڕی نێوان بزوتنەوەی ئیسلامیی و یەکێتی نیشتمانیدا، بەشێکی بەرچاویان چەکیان هەڵگرت و سەربازگەی مەشق و ڕاهێنانیان دامەزراند و دواتر لە بزوتنەوەی یەکبووندا بوونەهێزێکی چەکدار.

دروستکردنی بیروباوەڕێکی دروست لە تاکدا، ئەویش بیروباوەڕی سەلەفی ساڵحە، کە ڕاستەوخۆ لە قورئان و وسوننەت وەردەگیرێت. ئەم پێکهاتە فرەڕەنگەی بەدیوێکدا لە کۆمەڵەی جیهاد و بەدیوێکی تریدا لە کۆمەڵەیەکی سەلەفی لە ڕەفتاری کەسیی و دینداریشدا ڕەنگە ئیخوانییەکەیان زۆر بیڕەنگ نەبووە و لەولاشەوە وەک حیزبێکی کوردستانی بەهەندگری کێشەی نەتەوەیی دەردەکەون، ئاوێتەیەکە هەڵگرتنی ئەرکەکانی وەک پێویست لە دەرەوەی ئاڕاستەکردنی گوتار بۆ هەر حیزب و کۆمەڵەیەکی سیاسی کارێکی ئەستەمە. دەکرا گفتوگۆی خیاری دامەزراندنی حزبێکی سیاسی ئیسلامیی بەجۆرێک دابڕێژرایە کە لەگەڵ کێشەکانی نەتەوەکە و پێویستییەکانی کۆمەڵگە و لەسەر قیەم و بنەما باڵاکانی ئیسلام و ئەزموونی بیری سەرکەوتووی مرۆڤایەتی لە بواری سیاسیدا هەماهەنگ بووایە، شانسی بەردەوامی و کاریگەریی ئەگەرێکی زیاتر دەبوو.

لەکاتی گەڕان لەنێو ئەرشیڤخانەی عوسمانیدا، چ دەستخەت یان بەڵگەنامە، زانیاریی زۆر لەبارەی زانایانی کورد بەرچاو دەکەون، کە بەشی زۆریان لەنێو ئەدەبیاتی نووسراوی کوردیدا نەک هەر باس نەکراون، بەڵکو ناوی ئەو زانایانە و تەنانەت ناوی بەرهەمەکانیشیان ونن. هۆکارە سەرەکییەکەشی وێڕای ئەوەی نەبوونی دەستخەتخانە و ئەرشیڤخانەیەکی نیشتمانییە لە وڵاتی ئێمەدا، عەقڵی پاراستن و گرنگینەدان بەو بوارەش هۆیەکی تر بووە کە لە لای بنەماڵەکانیش تاک و تەرا نەبێ شتێکی ئەوتۆ نەمێنێ. زانا و شاعیرانی کورد لە سەردەمی عوسمانیدا لەبەر خراپی ڕەوشی ژیانی کۆمەڵگەی کوردی لە ڕووی سیاسیی و ئابوورییەوە، هەمیشە پەنایان بردۆتە ناوەندە گەورەکانی وەک بەغدا، مەدینە و ئەستەنبوڵ، چەندە لەو ناوەندانە نزیک بووبن ئەوەندە ڕێز لە خۆیان و بەرهەم و تواناکانیان گیراوە و ژیانیشیان خۆشتر بووە بە بەراورد بە ژیانیان لەنێو کوردستان، بەوهۆیەشەوە بەشێک لە پاشماوەی بەرهەمەکانیان لەو ناوەندانە پارێزراون.

لەم کورتە نووسینەدا دوو زانای ناوونبووی بەرهەمدار دەناسێنین، کە بریتین لە:

### ١-ئەبوبەکر بەرزنجی (١٨٠٩-١٨٧٠ز)

شێخ ئەبوبەکر نەقشبەندی لە بەرەبابی حەزرەتی شێخ ئیسماعیلی کلاوقووچی(١) ساداتی بەرزنجەیە، لە ویلایەتی موسڵ، سەنجاقی شارەزوور، قەصەبەی کۆیسنجەق و لە مەشایخانی قادری حەزرەتی شێخ حسێن خدریی لە ساڵی ١٢٢٤ی کۆچی (١٨٠٩-١٨١٠ز) لەدایکبووە و کتێبە سەرەتاییەکانی زانستی ئایینی هەر لە قەسەبەی ناوهاتوودا لەلای (مەلا مستەفای قاق(٢))ی خاڵی کە زانایەکی جامع المعقول والمنقول بووە تەواوکردووە، پاش تەواوبوونی خوێندن بۆ کەوتنە نێو عیشقی مەعنەوی، وڵاتی بەجێهێشتووە و بەدوای مەشایخانی نەقشبەندی گەڕاوە و لە هەمان ویلایەتدا لە قەسەبەی ئامێدی لای مورشیدی کامڵ سوججادەنشین و نقوومبووی نێو فیوزاتی ئیلاهی و قوتبی عاریفان و مەرجەعی ئەهلی یەقین(٣) ؛ حەزرەتی (سەیدایێ مەجزووب)(٤) ماوەیەکی زۆر ماوەتەوە و گەلێک مەنزیل و مەرحەلەی تەی کردوون تا خۆی گەیاندۆتە حیجاز و لەوێ لە مەککەی موکەڕەمە نقومی نێو فیوزاتی ئەحمەدییە بووە و بۆتە سالیکی ڕێی تەریقەت و کە تەریقەتەکەی پێشەوای ئەهلی حەقیقەت شا عەبدوڵلای دەهلەوی بووە و لەلای)شێخ محەمەد جان(ی خەلیفەی دەهلەوی تەریقەتی وەرگرتووە و و هەر بەوهۆیەوە لەسەر ڕێنمایی ئەوان بەرەو عێراق دەگەڕێتەوە و لە بەغدا لە گەڕەکی بەهەشت ئاباد دەست بە گەیاندنی عیلم و تەریقەت دەکات(٥) و پاشان لە گەڕەکی حەیدەرخانە داود پاشای والی شارەکە مزگەوتێک و خانەقایەکی بۆ دروست دەکات و لەو سۆنگەیەوە لە ساڵی ١٢٥٩ی کۆچیدا (١٨٤٣ز)دا سەردانی سوڵتان عەبدولمەجیدخانی عوسمانی دەکات و ئەویش ڕێزێکی زۆری لێ دەگرێت و کێماسییەکانی خانەقاکەی بۆ تەواو دەکات و تەنانەت

یارمەتی ئەوەشی دەدات کە لە خانەقاکەیدا خورد و خۆراکی هەژاران و دەروێشان دابین بکرێ. هەروەها لە ناحیەی خالص دا و لەسەر ڕووباری)علیبان( و)حمیرە(دا چەند زەوییەکی بۆ ناوبراو وەقف کرد و مانگانە هەزار قڕووش بۆ خواردەمەنی و سالانەش پازدە هەزار قیە گەنمیشی پێ کەرەم کرد.

ناوبراو لە سالی ١٢٦٩ ی کۆچیدا (١٨٥٣ز) بۆ بەشداری لە شەڕی ڕووس، خۆی و ژمارەیەکی زۆر لە موریدانی چوونە)قارص( و دوای جەنگانیان سەردانی ئەستەنبولیان کرد و لەوێ ڕێزێکی زۆریان لێ گرتوون و دواتر ناوبراو بەرەو بەغدا گەڕاوەتەوە و دەستیکردووە بە دەرسدانەوە و ئیرشاد و لەو ماوەیەدا تەفسیرێکی داناوە، تا سالی ١٢٨٧ی کۆچی(١٨٧٠ز) بەردەوام بووە لە خزمەت و لەو سالەدا کۆچی دوایی کردووە و هەر لە خانەقاکەی خۆیدا نێژراوە.

هەرچی سەبارەت بە تەفسیرەکەیەتی، کە ٩٧٠ لاپەڕەیە و ناوی ناوە (متجلی التفاسیر) و هێشتا هەر دەستنووسە(٦) و لە کتێبخانەی دیانەتی تورکیا نوسخەیەکمان دەستکەوت کە تێیدا بەم شێوەیەی خوارەوە سەرەتاکەی نووسیوە:

سبحان الذی نزل الفرقان علی عبد لیکون للثقلین بشیرا ونذیرا..... تا دەگاتە ئەوەی باسی تەفسیرەکەی دەکات: فإنی بعد الالهام عزمت علی الشروع فیما اردته والاتیان بما قصدته ناویا ان اسمیه بعد ان اتممه بمتجلی التفاسیر فهذا اعجوبة بل غریبة فی الغرائب فها انا الآن اشرع وبحسن توفیقه اقول وهو الموفق لکل بر والمعطی لکل مسئول، قلنا انا مجمع البحرین هذا ظاهری والباطن الخفی الاجل السامی... قلنا فی درة الیتیمة تحت حقیقة المحمدیة ان التفاسیر فی الدنیا بلا عدد، ولیس فیها لعمری مثل تفسیری ان ترید الهدی فالزم قراءته، فالجهل کالداء....

تەفسیرەکە بە زمانی عەرەبی نووسراوە و نە زۆر کورت و نە زۆر درێژە، بەتایبەت لە بواری زانستی قیرائاتدا گرنگیی خۆی هەیە و کەم ئایەت هەیە باسی شێوەکانی خوێندنەوەی نەکردبێ. وادیارە دوای کۆچی دوایی هەر لە لاپەڕەی دواوەی دەستخەتی تەفسیرەکە بە دوو لاپەڕە کورتەی ژیانیان بە تورکیی نووسیوە، کە ئێمە لە سەرەوە بەکورتی و بەکوردی پوختەکەیمان داڕشتەوە.

### ٢-شێخ مەحموود حەمدی قەرەداغی

سەبارەت بەم زانایە، دۆسیەیەکی دوازدە لاپەڕەیی و بەلگەنامەیەکی تر لەنێو بەلگەنامەکانی عوسمانیدا دەبینرێن، کە مێژووی ١٢٨٢/١٢/٢٤ی کۆچی لەسەر نووسراوە، کە دەکاتە بەرامبەر ١٠/٥/ ١٨٦٦ی میلادی. لە بەلگەنامەکەدا ئەوە بەدیاردەکەوێت کە ئەم زانایەی خەلکی قەرەداغی لیوای سلێمانی، یەکێکە لە زانا هەلکەوتووەکانی ناوچەکە و لە مەشایخانی قەرەداغە. ئاستی زانستییەکەشی وەها

بڵندە، هەژدە زانای ناوچەکە شاهیدی بۆ دەدەن و وەک بڕوانامە بۆی ئیمزا دەکەن و وا وەسفی دەکەن، کە لە زانستە عەقڵیی و نەقلییەکاندا هاوتای کەمە و لە بواری ئوسووڵی فیقهدا کتێبێک و لە بواری زانستی کەلامیشدا کتێبێکی دیکەی نووسیوە و بەردەوام خەریکی دەرسدانەوە بووە. وێڕای ئەوەش کەسێکی لەخواترسە و وەک بنەماڵەش بنەماڵەیەکی ئەهلی عیلمن. وادیارە گوزەرانی خراپە و ئەو زانایانە شایەدی زانست و زانیارییەکەی دەدەن و دەڵێن لە سۆنگەی ئایەتی (ولا تکتموا الشهادة وانتم تعلمون) ئەم شەهادەتنامەیان پێداوە. لەنێو ئەو زانایانەدا کە هەموویان مودەڕیسن، شێخ عەلی خالصی قادری کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی تاڵەبانی، سەید محیەدین، سێ مودەڕیس کە ناویان عەبدولقادرە، سەید محەمەد، محەمەد وەیس، عەبدولرەحمان، یوسف جەمیل و گەلێکی تر هەن(٧).

هەر لەنێو ئەو دۆسیەدا، نامەی مەحموود حەمدی هەیە، کە تێیدا چەند لایەنێکی ژیانی خۆی باس دەکات، کە لە ٥ی مانگی شەعبانی ساڵی ١٢٨٢ ی کۆچی بۆ بابی عالی نووسیوە، تێیدا باس لەوە دەکات کە چوار ساڵ لەمەوبەر ئەو کتێبانەی نووسیون و دوو نوسخەی هێناون کە بیانباتە ئەستەنبوڵ و دوای ئەوەی موراجیعەی ویلایەتی بەغدای کردووە، هیچیان بۆ نەکردووە، دواتر بەمەبەستی دەرسدانەوە سەری لە حیجاز داوە و لە گەڕانەوەدا بەڕێکەوت لە شاری (ماردین) لایداوە و لەوێ هەر بە ڕێکەوت بۆتە میوانی دەروێش عەلی ئەفەندی و تائێستا لە ماردین ماوەتەوە و لەوێ لە مەدرەسەیەکدا ماوەتەوە و شەو و ڕۆژ خەریکی دەرسدانەوەیە و دەرس دەداتە مامۆستا و فەقێیەکانی ئەوێ. ناوی هەر دوو کتێبەکەی (زبدة الکلام، زبدة الاصول)ن و ئاماژەش بەوە دەدات کە حاشیەی لەسەر کتێبەکەی (جلال الدین الدوانی) نووسیوە لەبارەی عەقائیدەوە و چەند ریسالەیەکی تریشی داناوە. بۆیە دەیەوێ دەوڵەت لە بەرامبەر ئەو خزمەتەی هاوکارییەکی بکات.

دواتر قائیمقامی ماردینیش پشتگیرینامەیەکی بۆ دەنووسێ و لە کۆتاییدا دەوڵەت ١٥٠٠ قڕووش هاوکاری بۆ تەرخان دەکات. قائیمقامی ماردین لە نامەکەی خۆیدا چەند خاڵێکی گرنگ دەرهەقی ئەم زانایەمان باس دەکات:

یەک: ئاماژە بەوە دەدات کە شێخ مەحموود حەمدی لە پەیڕەوانی تەریقەتی قادرییە لە شاری سلێمانی.

دوو: زۆر بە وەسفێکی ورد باسی تەقوا و کەسایەتی بەرزی مامۆستای ناوبراو دەکات.

سێ: ناوبراو، مامۆستا بۆ ماردین زۆر بە پێویست دادەنێ و پێیوایە ئەگەر هاوکاری بکرێ و لە ماردین بمێنێتەوە ڕۆڵێکی گەورەی لە بڵاوکردنەوەی زانست و زانیاری دەبێت.

چوار: ئاماژە بەوە دەدات کە هاوپێچ لەگەڵ ئەم نامەیەدا نامەی پشتگیری زانایانی کەرکووکیش دادەنرێ کە پشتیوانی ئەو زانایەیان کردووە.

نامەکە لە ٤ی مانگی ڕەمەزانی ساڵی ١٢٨٢ نووسراوە.

دواتر نووسراوی مەجلیسی مەعاریف پاڵپشتی نووسراوەکەی قائیمقام دەکات و لەسەر ئەو بنچینە لە ٢٠ی زولحیججەی ساڵی ١٢٨٢ی کۆچی ]١٨٦٦/٥/٦ز[ بڕیاری لەبارەوە دەردەچێ کە ئەو ١٥٠٠ قڕووشە وەزارەتی دارایی بۆی خەرج بکات(٨).

دیارە سێ ساڵ پێشتریش لە سەروبەندی لەخۆبوونەوەی لە کتێبەکان، هەوڵی ئەوەی داوە یارمەتی بدرێ و بۆ ئەو مەبەستە نامەی نووسیوە. لە بەڵگەنامەیەکدا کە مێژووی ١٢٧٩/٧/٢ی کۆچی لەسەرە، ناوبراو ئاماژە بە هەردوو کتێبەکانی دەدا و باس لەوە دەکات کە ئەو کتێبانەی حەواڵەی وەزارەتی مەعاریف کردووە و شایانی لوتف لەگەڵ کردن و یارمەتیدانە(٩). هەر لەگەڵ ئەم دۆسیەیەشدا بەڵگەنامەیەکی تر هەیە کە حەوت زانا پشتگیرینامەیان بۆ نووسیوە و داوا دەکەن کە ناوبراو شایانی هاوکاریکردنە.

لە بەڵگەنامەیەکی دیکەدا کە مێژووی ١٢/ ١٠/ ١٢٨٥ی کۆچی ]١٨٦٩/١/٢٦ز[ لەسەرە، نووسراوێک بۆ وەزارەتی دارایی کراوە و داوای ئەوە کراوە کە هەردوو کتێبی (خلاصة الفرائض و وسیلة الحصول) ناوی کتێب و حاشیەی محەمەد حەمدی ئەفەندیی یەکێک لە زانایانی سلێمانییە، (کە ئێمە پێمانوایە هەر مەحموود ئەفەندییە و لە نووسیندا هەڵە کراوە، چونکە تائێستا هیچ سەرچاوەیەک نییە لەو ساڵانەدا ئاماژە بە هەبوونی زانایەک بەناوی محەمەد حەمدی بکات) بۆ هەردوو کتێبەکەی دوو هەزار قڕووشی وەک پاداشتی بدرێتێ(١٠).

کەوابوو کۆی کتێبەکانی ئەم زانایەمان بریتین لە:

- خلاصة الفرائض
- وسیلة التحصیل
- زبدة الکلام
- زبدة الاصول
- حاشیة لەسەر کتێبەکەی جلال الدین الدوانی

چەند ریسالەیەک لەبارەی زانستی عەقائید

ئەو چەند بەڵگانەی دەرهەقی ئەم زانایە هەن، مانای ئەوەیە کە ناوبراو زانایەکی گەورە بووە و مودەڕیسێکی لێهاتوو و نووسەرێکی کارامە بووە. بەڵام بەداخەوە هیچ سۆراغی ئەو دەستخەتانەی دیار نییە و وێڕای ئەوەش نازانرێ ئاخۆ ناوبراو گەڕاوەتەوە سلێمانی یان هەر لە ماردین ماوەتەوە!

## سەرچاوە و پەراوێزەکان

١ بەپێی بەدواداچوونمان لە ڕێی بەڕێز محەمەد شەفیعی خزری شنۆیی پەیوەندیمان بە بنەماڵەی شێخ ئیسماعیلی جاشێران یان کڵاوقووچ کرد و ئەوانیش مەزەندەی ئەوەیان کرد کە ئەم شێخ ئەبوبەکرە کوڕی شێخ سمایلی جاشێران بووبێ. بەڵام هێشتا بەتەواویی و بە بەڵگە یەکلانەبۆتەوە.

٢ ئەم زانایە نەناسراوە، پێدەچێ مەلا مستەفای کاک، یان کاک مەلا مستەفا بێ، یانیش خەڵکی گوندی قاقا بووبێ، کە دەکەوێتە سنووری هیزۆپ لە پشتی چیای هەیبەسوڵتانەوە.

٣ بەهۆی ئەوەی کورتەی ژیاننامەکە بە تورکی و بەوشێوە پەسنئامێزە داڕێژراوە، نەمانویست زۆربەی شێوازەکەی دەستکاری بکەین، بۆیە بەو پەخشانە پەسنئامێزییەوە کردمانە کوردی.

٤ ناوی شێخ محەمەد کوڕی شێخ ئیسماعیلی نەقشبەندییە و بە سەیدایێ مەجزووب ناسراوە، لە ساڵی ١٨٤٢ی زایینی ئیسماعیل پاشای میری بادینان زانای گەورە مەلا یەحیای مزووری دەگرێت و دەیەوێ بیکوژێت بە تۆمەتی ئەوەی کە مزووری لە دژی ئەو، هاوکاری پاشای کۆرەی سۆرانی کردووە، بەڵام سەیدایێ مەجزووب کە زۆر ڕێزی لای میری بادینان هەبووە، داوای ئازادکردنی مەلا یەحیای لێ دەکات و ئەویش لەبەر خۆشەویستی و ڕێزی بۆی، مەلا یەحیا ئازاد دەکات. ئەگەرچی زانیاریی ئەوتۆ لەبارەی ژیانی پەیدا نابن، بەڵام لە هەندێ سەرچاوەدا مێژووی وەفاتی سەیدایێ مەجزووب ساڵی ١٨٣٨ی زایینی دانراوە. (بڕوانە المعجم التأریخی لإمارة بهدینان، عماد عبدالسلام رؤوف، اربیل ٢٠١١، بهدینان فی مذکرات الشیخ طاهر الشوشی، دراسة وتحقیق د. حمزة شوشی. بۆ دڵنیابوونەوە لەو زانیارییانە لە ڕێی نامەوە سوود لە توێژەر هێرش کەمال ڕێکانی وەرگیراوە).

٥ زانایەکانی بەغدای ئەو سەردەمە زۆربەیان کوردبوون، محەمەد خورشید پاشا لە سیاحەتنامەکەی خۆیدا خەڵکی بەغدا دابەشی چوار بەش دەکات و بەشی یەکەم تەرخان دەکات بۆ زانایان و ئاماژە بەوەش دەدات کە زۆربەی زانایەکانی ئەو سەردەمەی بەغدا کورد بوونە، لەوانە مەلا عەبدولرەحمانی ڕۆژبەیانی و محەمەد فەیزی زەهاوی و زۆری تریش. بڕوانە (سیحاتنامەء حدود، محمد خورشید باشا، چاپی عوسمانی ١٨٦٠).

٦ بەڕێزێک لە سێ بەرگدا هەمووی نووسیوەتەوە و ئامادەی کردووە بۆ چاپ و چاوەڕێی ئەوەیە بۆی چاپ بکرێ.

٧ ناوی زاناکان نووسراوە بێ ئەوەی ناوی باوک یان پاشناویان بنووسرێن، ئەگەر بەوردی لێکۆڵینەوە لە ناوی زانایانی ئەو سەردەمە بکرێن بێگومان دەناسرێنەوە.

8 İ..MVL. 24762 - 552
9 İ..MVL. 21708 - 479
10 A.}MKT.MHM.60-432



ئامادەکردنی: عادل صدیق

# کیمیابارانی هەڵەبجە
## لە بیرەوەری فاروق عەلی دا



ئەم چاوپێکەوتنە شەوی ٧ لەسەر ٨ی کانوونی یەکەمی ٢٠١٣ لەماڵی کاک فاروق عەلی خۆی ئەنجامدراوە، ئەوکات ئێمە سەرقاڵی نووسینی ماستەرنامەکەمان بووین لەسەر کەیسی کیمیابارانکردنی هەڵەبجە، بۆیە ژمارەیەک چاوپێکەوتنمان لەگەڵ کۆمەڵێک شایەتحاڵ لەنێویاندا فەرماندە و لێپرسراوە سەربازییەکانی پێشمەرگە لەلایەنە جیاوازەکان ئەنجامدا، بۆ ئەوەی لە زاری ئەوانەوە گوێبیستی ڕووداو و گۆڕانکارییەکانی پێش و دوای کیمیاباران ببین، چونکە ئەوانە لە یەک کاتدا شایەتحاڵ و کاراکتەری سەرەکی نێو ڕووداوەکانی ئەو ڕۆژانە بوون. بەخۆشحاڵییەوە برای بەڕێز کاک فاروق ئامادەیی خۆیان بۆ ئەنجامدانی دەربڕی، ئەمەی خوارەوە ناوەڕۆکی دیدارەکەیە. ماوەتەوە کە بڵێم، دیدارەکە لەشێوەی پرسیار و وەڵامدابووە، بەڵام ئێمە پرسیارەکانمان هەڵگرتووە و ناوەڕۆکی قسەکانمان لێرەدا بەپوختی و ڕێکخراوەیی خستووەتە ڕوو.

بسم الله الرحمن الرحيم، سەرەتا دەبێ ئەوە بڵێم، ئەوەی کە باسی دەکەم تەنها ئەو گۆشەیەیە کە خۆم تیایدا بەشداربووم و کارەکتەر بووم، چونکە کاتێک کە چیرۆکێک دەگێڕمەوە لەو گۆشەوە دەیگێڕمەوە کە خۆمی تیادا بووم، نازانم و شارەزا نیم لە قوڵ و جێگایەکی دیکەوە، یان لە شار و شارۆچکەیەکی دیکەوە چی ڕوویداوە، کەسانی دیکە دەبێ بڵێن لەو قوڵ و جێگایانەی ترەوە چی ڕوویداوە چی ڕووی نەداوە، پێدەچێت ئەمەی من لە ئاگایی خۆمەوە بەوشێوازەی دەیگێڕمەوە ڕاست بێت، لەوانەیە چیرۆکەکە لای کەسێکی دیکە کە لە شوێنێکی ترەوە بووە بەوشێوە ڕووینەدابێ، لەبەرئەوە ئەوەی کە خۆم بینیومە باسی دەکەم و دەیگێڕمەوە.

## خۆپیشاندانی ١٣ی ئایاری ١٩٨٧

ڕووداوەکانی ئەو خۆپیشاندانە لە ڕۆژانی ١٣ - ١٥ی ئایاری ١٩٨٧دا بوو، من ئەو کاتە تەمەنم ١٩ ساڵ بوو، بە ئەندازەی ئەو تەمەنەم ئاگاری ئەو واقیعە بووم، ئێمە ئەو کات وەکو گەنج و لاوانێک لەچوارچێوەی بازنەی برایانی مسوڵماندا کارمان دەکرد، خۆم بەر لە گیرانی مامۆستا حەسەن شەمێرانی قوتابی ئەو بووم، دوای ئەوەی مامۆستا لەلایەن دام و دەزگا ئەمنییەکانی بەعسەوە گیرا (١٩٨٦)، ئێمەیان تەسلیمی مامۆستایەکی بەڕێزی دیکە کرد، یەک دوو جاریش چووینە لای، بەڵام سەیرمان کرد ئەو ئاستەی ئەوی نییە، ئیتر ئیلتیزاماتێکی وانەییمان نەما وەکو دەرس و دروس، بەڵام تا ئەندازەیەک هەستمان دەکرد کە ئێمە لەناو تەنزیمێکداین، هەرچەند هێشتا ئاستمان نەگەیشتبووە ئەوەی کە بە سەراحەت پێمان بڵێن کە ئەمە چییە و چی نییە، بەڵام بە تەدریجی ڕادەهێنراین لەسەر قەزییەکە.

دوای ئەوەی ڕژێمی بەعس هەستا بە ڕاگواستنی دانیشتوانی گوندەکانی دەشتی شارەزوور و دواتر خانووەکانیشیانی خاپوور کرد، گەنجان و لاوانی هەڵەبجە بەتەواوی ئایدیا و بۆچوونەکانەوە بە ئیسلامی و بە عەلمانییەوە توڕە و نیگەران کرد، ڕووداوەکە هێندەی تر توانا و گەرموگوڕی دایە خەڵک بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی بەعس و ڕق و قیانیان زیاتر جۆشا لە دژی ئەو ڕژێمە. لەوکاتەدا ئیسلامییەکان هێزی چەکداریان نەبوو، هەتا وەکو هێزەکانی دیکە لەناو گۆڕەپانەکەدا بن، ڕاستە ئەوکاتە بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامی هەبوو، بەڵام ئەم بزووتنەوەیە هەتا ئەو کاتە نە یتوانیبوو سیقە و متمانە لەلای تەواوی ئیسلامییەکان دروست بکات، چالاکییەکانیشیان هێندە بەرفراوان نەبوو کە کاریگەرییان لەسەر گۆڕەپانەکە هەبێت، ئەوەی کە دەیجوڵاند هەبوو نەبوو ئەو مامۆستایانە بوون کە لەناو شاری هەڵەبجەدا بوون، لە نموونەی: مەلا عومەر عەبدولعەزیز، مەلا عوسمان عەبدولعەزیز، مەلا عەلی عەبدولعەزیز، لەگەڵ ژمارەیەک لەو مامۆستایانەی کە تاڕادەیەک کاریگەرییان لە ئەمان کەمتر بوون و لە تەمەنیشدا لە

ئەمان بچووکتر بوون، لەگەڵ ڕێکخستنەکانی ئیخوان کە ئەوکاتە خۆیان لە دوو باڵدا دەبینییەوە، باڵێکیان مامۆستا سەلاح سەرپەرشتی دەکرد کە ئێمە خۆمان لەگەڵ ئەوەیاندا بووین، باڵی دووەم کە مامۆستا صدیق عەبدولعەزیز بوو، دیارە هەردوو بەرپرسەکە لەو ئان و ساتەدا لە دەرەوەی هەرێمی کوردستان(ئێران) بوون، چونکە هەردووکیان بڕیاری گرتنیان لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بۆ دەرچووبوو، بەڵام لایەنگر و قوتابیەکانیان لێرە درێژەیان بە کاری ڕێکخراوەییەکانیان دەدا.

دێمەوە سەر ڕووداوی خۆپیشاندانەکە، ئەوەندەی ئاگاداربم، شەوی ١٢ لەسەر ١٣ی ئایار لە ڕێگەی کاسێتی تەسجیلەوە لە مزگەوتی گەورە(جامیعە)وە بانگەواز کرا بۆ خۆپیشاندان، وەک بیستم ڕێکخستنەکانی حیزبی شیوعی بەوکارە هەستاون، لەوکاتەدا من قوتابی پۆلی شەشی زانستی بووم، سەرقاڵی سەعیکردن بووم، چونکە ١ی حوزەیران تاقیکردنەوەی بەکالۆری بوو، بۆیە زۆر موهتەم نەبووم بە قەزیەکەوە هەتا بەیانییەکەی کە خۆپیشاندانەکە ڕوویدا. بیرم نەچێت ئێوارەی بەر لە خۆپیشاندانەکە ئێمە چەند مەفرەزەیەکی پێشمەرگەمان لەم گەڕەکەی خۆمان بینی، هەڵەنەبم پێشمەرگەی یەکێتی نیشتمانی کوردستان بوون.

ئەگەرچی کارەکتەرێکی عەمەلی نەبووم لەناو خۆپیشاندانەکاندا، بەڵام ئێمە وەک گەنجانێکی گەڕەکی خۆمان (گەڕەکی کانی عاشقانە) کۆببووینەوە بیروڕامان دەگۆڕییەوە، وەک پێشتر گووتم من لەبەرئەوەی قوتابی پۆلی شەشی ئامادەیی بووم خەریکی خۆئامادەکردن بووم بۆ ئیمتیحان، چاکیشم لەبیرە ئەو کاتە سەرقاڵی سەعیکردنی وانەی بیرکاری بووم، چونکە کاتێکیش ڕۆیشتم بۆ دەرەوە دەفتەری بیرکارییەکەم هەر پێ بوو، لەگەڵ خۆمدا بردم.

سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٣ی ئایار خۆپیشاندان دەستپێکرد، بەدوایدا تەقە دەنگی هات، خەڵکێک شەهید و خەڵکێکیش برینداربوون، ئەوەی کە باسی دەکەم نزیک سەعات ١١ بۆ ١١:٣٠ بوو، واتە هێشتا بانگی نیوەڕۆی نەدابوو، ئێمەش(ئەو ژمارە قوتابییەی کە پێکەوە بووین) لە بەردەم مزگەوتی جمهورییەوە بەرەو بازاڕ و ئەو نزیکانە ڕۆیشتین، بۆئەوەی بزانین دەنگوباس چییە و بە کوێ گەیشتووە؟ کاتێک کە ئێمە گەیشتینە نزیک بازاڕ ئاسارێکی فیعلی خۆپیشاندان نەمابوو، بەڵام ناو بازاڕ پڕ بوو لە جەیش و جاش و ئیستیغبارات....، بۆیە نەمانتوانی لەوە زیاتر بڕۆین و بەناچاری بەشوێنی خۆماندا گەڕاینەوە، خزمێکی خۆمان کە ناوی جەلالی حاجی محەمەد بوو، ئێمە پێی دەڵێین حاجی محەمەدی دێ زێڕین لە خۆپیشاندانەکەدا بریندار بوو، ئەو بۆی گێڕاینەوە کە خەڵکێک گیراوە، خەڵکێک بریندارە و خەڵکێک کوژراوە، لەوە بەدوا ئێمە مەشغوڵی ئەو دەنگوباسانە بووین هەتا کات گەیشتە نوێژی عەسر.

سەرلەبەیانییەکەی تەنها هێزی چەکدار بڵاوەی پێکرابوو، بەڵام لە دوای عەسرەوە

هەلیکۆپتەر هات، ئەو عەسرە نوێژمان لە مزگەوتی خالید بە جەماعەت کرد، مامۆستا مەلا قادری کۆکۆیی پێشنوێژی بۆ کردین، دوای نوێژ مامۆستا گووتی بڕیارمانداوە لەگەڵ مامۆستا مەلا عوسمان و ئەواندا بڕۆینە دەرەوە، کێ ئامادەیە با لەگەڵ ئێمە بێت، هێشتا هەر لە مزگەوتدا و لەم قسە و باسانەدا بووین کۆپتەرەکانیش هاتن. لە سەرەتادا کۆپتەرەکان دەوروپشتی هەڵەبجەیان قەسف کرد، چونکە دوای خۆپیشاندان خەڵکانێک چووبوونە دەرەوەی شار، دواتر گەڕەکی گوڵان و گەڕەکی ئێمەیان قەسف کرد. هەلیکۆپتەرەکان زیاتر بۆ چاوترساندن هاتبوون، بەتایبەتی گەڕەکی کانی عاشقان، چونکە ئەسڵی قەزیەکە لەم گەڕەکانەوە سەرچاوەی گرتبوو، هۆکارەکەشی ئەوەبوو مەفرەزەکانی پێشمەرگە زیاتر لە مەنتیقەی باوەکۆچەک و چاوگەوە دەهاتن و لەم گەڕەکانەوە داخلی شار دەبوون، دواتریش کە ئێمە بووینە پێشمەرگە هەرلەوێوە دەهاتینە ناو هەڵەبجەوە، ئێمە وەک خۆمان ئەوکات لە مەنتیقەی گوڵان و ئەو ناوچەیە باخمان هەبوو، ئەو پێشمەرگانەی کە دەهاتن دەماننناسین، زیاتر لە دوای عەسرەوە دەهاتن و ئێمە لەوێ دەمان بینین، دڵمان پێیان خۆش بوو، حەزمان بە تێکەڵیشیان دەکرد، ڕۆژانە ئەم حاڵەتە دووبارە دەبوویەوە.

### کانی عاشقان

کانی عاشقان ئەو کانییەیە کە دەکەوێتە لای حەمامەکەی حەمەساڵح کۆکۆیی، لەبەرئەوەی ناو و شۆرەتەکەی گەورە بوو، هەموو خەڵک شانازی بەوەوە دەکرد کە بڵێ ماڵم لە گەڕەکی کانی عاشقانە، هەروەک ناسراوترین گەڕەکیش بوو، لە هەڵەبجەدا چەند گەڕەکێک ناسراوبوون، لەوانە تووشک، سەرا، پیرمحەمەد، کانی عاشقان. ئێستاش ئێمە کە ماڵمان لە گەڕەکی مۆردانەیە هەر دەڵێین کانی عاشقان، مۆردانە کە دواتر دروستبوو نەیتوانی زاڵ بێت بەسەر ناوی کانی عاشقاندا، چونکە کانی عاشقان دایک بووە و ئەوانی دیکە فەرع بوون. گەڕەکی کانی عاشقان بە مۆردانە و کانی عاشقان خۆیی و گوڵان و ئەوانەوە هەمووی بەناوی کانی عاشقانەوە ڕۆیشتبوو، کۆپتەرەکانیش قەسفی ئەو گەڕەکانەیان کرد.

کوڕێکی ناسراومان بەناوی عەبدولقادری مامۆ ئەحمەد، پێشتر لەلایەن ڕژێمی بەعسەوە بە پێنج ساڵ زیندانی حومدرا بوو، بەڵام لە زیندان هەڵهات، دوای هەڵهاتن وابزانم حوکمی عەفواتی بۆ دەرچوو، بۆیە گەڕایەوە و دانیشت لە ماڵی خۆیدا و خێزانی پێکەوە نا، لەکاتی قەسفی هەلیکۆپتەرەکاندا لە ماڵی خوشکێکی بوو لە گەڕەکی گوڵان، لە پاش نوێژی عەسر هەواڵیان پێداین کە عەبدولقادر بەهۆی بۆردومانی کۆپتەرەکانەوە شەهید بووە. خێزانی ئەو ئەو عەبدولقادرە بە کوڕێکەوە دوو گیان بوو، پاش خۆی کوڕەکەی لەدایک بوو، ناویان ناوە جێگیر، ئێستا لە هەڵەبجە مامۆستای وەرزشە.

### ژمارەی شەهیدەکان:

من نەمزانی ئەو ڕۆژە چەند کەس شەهیدە بووە، چونکە زانیاری ئەوەم نەبوو کە چەند کەس لە خۆپیشاندانەکە و چەندی تر لە بۆردومانەکەدا شەهید بوون، ئەوەی من ئاگام لێ بوو، شەهیدبوونی عەبدولقادر بوو لە بۆردومانەکەدا، کە خزمی ئێمە بوو، دەمانزانی کوڕێکی گوندی بامۆکیش کە وابزانم ناوی ئیبراهیم بوو، ناتەواو بوو، لەکاتێکدا کە کۆپتەرەکان هاتبوون چووبوو بۆ دەشتی حاجی هەسەن و بامۆک، لەوکاتەشدا خەڵکی خەریکی دەغڵ و دان و درەو و داس بوون، قەسفی ئەو مەنتیقەشی کردبوو، ئەویش لەوێ شەهید بوو.

هەموو ئەم ڕووداوانە لە نێوان عەسر و مەغریبدا بوون، کاتەکەشی مانگی ڕەمەزان بوو، دروست نازانم سیانزەی یان پانزەی ڕەمەزان بوو، دوای ناشتنی عەبدولقادر ئیتر ئێمە لە شار دەرچووین و بەرەو چەمی قاغە و باوەکۆچەک کەوتینەڕێ، ئەو معەسکەرەی کە لە باوەکۆچەک بوو، دۆشکەیەک لە سەربانەکەی بوو، کە خەڵکەکەیان دی دەستیان بە تەقەکردن کرد، ئێمەش لە ترساندا خۆمانماندا بە زەویدا.

ئەوانەمان کە لێرەوە دەرچووین ژمارەمان زۆر بوو، بەڵام مامۆستا مەلا عوسمان و خەڵکێکی زۆری تریش لە ناوچەی نەورۆلییەوە دەرچووبوون، کۆمەڵێک خەڵکی دیکەش لە سەرگەت و مڵەخوردی هەورامانەوە ڕۆشتبوون بەودیودا بۆ دزلی، بەڵام خەڵکی ئەم مەنتیقەی ئێمە کە زیاتر کۆکۆیی و بامۆکی و سازانی و... بووین هەمووی لەم مەنتیقەوە دەرچووین.

بەر لە بانگی مەغریب گەیشتینە گوندی چاوگ، هەڵەنەبم نیو سەعات تا چل و پێنج خولەکی مابوو بۆ بانگی مەغریب، لەوێ مشتومڕ دروست بوو لەسەر ئەوەی کە ئایا دروستە خەڵکە بەڕۆژووەکە بەربانگەکە بکاتەوە یاخود نا، چونکە ئەیانگووت ئەگەر ئێستا کە لەسەر کانییەکەین ئاو نەخۆین بە تینوێتی ناتوانین ڕێگا ببڕین، لەبەرئەوە با ئێستا نان و ئاوەکە بخۆین، ئەنجا بەڕێ بکەوین.

ئەوکات ئێمە گەنج بووین، ماڵ و منداڵێکی زۆریشمان لەگەڵ بوو، ئەو کەسانەی کە دیاربوون و ڕۆڵی چاوساغیان دەبینی لەناو خەڵکەکەدا ئەمانە بوون: محەمەدی مەلا حەمەکەریم، مستەفا محەمەد (بە مستەفای دێ عەینا مەشهورە)، فاتیحی مەلا مستەفا(کە ئێستا لەژیاندا نەماوە و شەهید بووە)، ئەمانە تا ئەندازەیەکی زۆر پێشەنگ و سەرقافڵەی خەڵکەکەی بوون.

ئەوەی ڕاستی بێ ئێمە لە گرتنی مامۆستا حەسەن شەمێرانییەوە پێمان وابوو چیتر مەعقول نییە بەم شێوەیە بمێنینەوە، بەردەوام ئەو ڕەخنەیەمان ڕووبەڕووی مامۆستایانی خۆمان دەکردەوە کە ئەو کاتە لەناو ئیخواندا بوون، کە بۆچی لایەنە عەلمانییەکان خەریکی شۆڕش و کاری چەکداری بن لە دژی ڕژێمی بەعس و ئێمەی ئیسلامیش دانیشین و بۆ

خۆمان سەیر بکەین؟ ئەوکاتیش ئەو ڕەخنەیە لە ئیسلامییەکانیان دەگیرا، ئێوەی ئیسلامی چ سوودێکتان بۆ ئەم میللەتە هەیە؟ ئەوەتا ئێمە خەبات و شۆڕشی چەکداری دەکەین و شەهید و قوربانی دەدەین، ئێوەش بۆ خۆتان دانیشتوون، ئیتر ئەم ئیسلامییەی ئێوە چ قازانجێکی بۆ ئەم میللەتی کوردە هەیە؟ بۆیە خەباتی چەکداری خواستی ئێمە بوو، پێمانوابوو ئێمەیەک کە ئیدیعای ئیسلامەتی دەکەین و لەناو ئیسلامیشدا فێری غیرەت و ئەوە کرابووین کە ئیسلام زوڵم قبوڵ ناکات، قایل نابێت بە بەرچاویەوە ژن و منداڵ بکوژرێت و ئەمیش دەستەوەستان بۆ خۆی دابنیشێ....، لە بەرامبەردا گەورەکانیش(حیزبییەکان) دەیانگووت جیهادکردن کارێکی هەروا ئاسان نییە، موستەلزەماتی خۆی دەوێ، دەبێ خەڵکێکی بۆ پەروەردە کرابێ، جیهادکردن خۆئامادەکارن و بڕیاری سەرەوەی دەوێ، بەڵام مامۆستا ئاینییەکان لەبەرئەوەی لەچوارچێوەی تەنزیمی ئیخوانیدا نەبوون ئەم قسانەیان نەدەکرد، بۆیە ئێمە گەیشتینە ئەو بڕوایەی کە بەناوی تەنزیمەوە هەرگیز ناکرێ بڕیاری شۆڕش و خەباتی چەکداری بدرێ.

> **من لە خزمەت مامۆستا مەلا عەلیدا بووم لە عەبابەیلێ، چەند جارێک ئێرانییەکان هاتن وتیان وەرن با هەڵەبجە بدەینە دەست ئێوە، مامۆستا مەلا عەلی وتی من هەڵەبجەیەکی وێرانم بۆچییە، مەسئولیەتەکەی بخەمە سەرشانی خۆم.**

من هەستم بەوە دەکرد کە مامۆستا مەلا قادری کۆکۆیی پەیوەندی لەگەڵ برایانی بزووتنەوەی پەیوەندی ئیسلامیدا هەیە، مامۆستاش دەیزانی من لەناو تەنزیمی ئیخواندام، بۆیە سیقە و متمانەی بە من هەبوو، یەک دوو جار بە منی گووت ئەوە مەفرەزەی پێشمەرگە هاتوون و لە فلان شوێندان، بەڵکو ڕێنماییان بکەی یان دەرگای ئەو باخەیان بۆ بکەیتەوە، لەگەڵ ئەوەی کە زۆریش ئەوەنەبووم کە خۆم بناسم، بەڵام تا ئەندازەیەک سیقەم بە خۆم هەبوو کە کارەکانم دەکرد.

ئەو ڕۆژانە شیعرەکانی مامۆستا کرێکاریش کە تۆماری کردبوون و بڵاوکردبوونەوە، کاریگەرییان لەسەر جۆشدانی گەنجانی مسوڵمان هەبوو، بەڵام ئەوەندەی من ئاگاربم تەنزیمی ئیخوان حەزیان بە بڵاوکردنەوەی ئەو کاسێتانە نەدەکرد، چونکە شیعرەکانی مامۆستا خەڵکی بۆ جیهادکردن هان دەدا و داوای لێ دەکردن ڕازی نەبن بە دانیشتن

لەژێر زوڵم و ستەمی حیزبی بەعسدا.

جیا لەوانەش، مامۆستایانی هەڵەبجە لە وتار و یادەکانی مەولوددا، هانی گەنجانیان دەدا، باسی جیهاد و بەرخودانیان بۆ خەڵک دەکرد، ئەمەش بە هەمان شێوە گیانی غیرەت و جیهادی لە دڵ و دەروونی خەڵکەکەدا دروست کردبوو. لەکاتی کیمیاباراندا کە ئێمە هاتینەوە بۆ هەڵەبجە، لە بینای موخابەراتی هەڵەبجە دۆسیەیەکەم دەستکەوت، کە نووسرابوو: «ظهور ظاهرة دينية في حلبجة»، دۆسیەکە نزیکەی سیانزە بۆ پانزە لاپەڕە دەبوو، باسی لە گەشەسەندنی دیاردەی ئایینی لە هەڵەبجە دەکرد، دواتر بەوردی ئەمەت بۆ باس دەکەم.

ئەم زاهیرە دینییەش مێژوویەکی کۆنتری هەیە و ئەگەڕێتەوە بۆ سەرەتای پەنجاکان، ئەویش دوای ئەوەی محەمەد مەحمود صەواف و هاوڕێکانی کە سەردانی هەڵەبجەیان کردووە، سەرەتاکانی کاری ئیخوان لە هەڵەبجە لەوێوە دەستپێکردووە، ئەڵبەت من خۆم ئەمەم نەدیوە، چونکە لە تەمەنی مندا نەبووە، ئەمەم لەو مامۆستا بەڕێزانە بیستووە کە من لەخزمەتیاندا بووم، لەوانە مامۆستا مەلا عەلی و مامۆستا بەڕێزەکانی دیکە، دیارترین مامۆستاکانی هەڵەبجە لەوکاتەدا جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان و براکانی و کۆمەڵێک مامۆستای بەڕێزی تر بوون، ئەوان هاتبوون بڕیاری ئەوەیانداوە کە لە چوارچێوەی تەنزیمی ئیخواندا کار بکەن، ئەوەش کاریگەریی زۆر باشی هەبووە، چونکە لەو کاتانەدا گەورەترین صیراع لە نێوان ئیسلامی و چەپەکاندا بووە، بەکورتی لە نێوان ئەم مامۆستایانە و چەپەکان(حیزبی شیوعی)دا بووە، بەردەوام ئەو ڕکابەریی و مونافەسە لە نێوانیاندا هەبووە. مەلاکانیش مامۆستایانێک نەبوون لەچوارچێوەی مزگەوتەکاندا دانیشن و تەنها بە نوێژ و ڕۆژوو ڕازی بن و هەرئەوەش بدەن بەگوێی خەڵکدا، بەڵکو بەردەوام گیانی ڕووبەڕووبوونەوەیان تێدابوو، دژی زوڵم و ستەم بوون و قەبوڵیان نەکردووە بیری چەپ لەناو خەڵکدا بڵاوببێتەوە، بەدرێژایی ئەو ماوەیە ئەمەیان لە دڵ و دەروونی گەنج و لاوە ئیسلامییەکان و خەڵکدا چاندبوو. هەر ئەو سەرەتایەش بوو وایکرد کە زۆربەی سەرکردەکانی لایەنە ئیسلامییەکان بە بزووتنەوە و یەکگرتوو و کۆمەڵ ـ یشەوە خەڵکی ئەم ناوچەیە بن و لێرەوە سەرچاوە بگرن.

بەکورتی هەڵەبجە ببووە سەرچاوەی بڵاوبوونەوەی ئیسلامەتی بەو شێوازە حەرەکییەی کەوا قەرارە ببێ، مامۆستایانی هەڵەبجە ببوونە پشتیوانییەک بۆ تەواوی ئەو کەسانەی کە لە شار و شارۆچکەکانی دیکەی کوردستان وەکو قوتبێک دەردەکەوتن، ئەگەر پشتیوانی مامۆستایانی هەڵەبجە نەبوایە بۆیان بۆ خۆیان هیچی وایان پێ نەدەکرا. ئەگەر تەماشا بکەی هەرکام لەو بەڕێزانە کاتێک ویستوویەتی حەرەکەتێک بکا سەرەتا سەردانێکی هەڵەبجەی کردووە و بە خزمەتی ئەو مامۆستا بەڕێزانە گەیشتووە ئەوجا توانیویەتی کار بکات، چونکە ئەو شەخسیەت و توانایەی کە ئەم مامۆستایانە هەیانبووە

کەم کەسی دیکە هەیبووە، تا ئەو ڕادەیەی ئەمان لە سەردەمی عەبدولکەریم قاسمەوە بۆ سەردەمی ڕژێمی بەعس دژایەتی بەرنامە و کاری دەسەڵاتدارانی عێراقیان کردووە، لە بەرامبەردا ئەوان حسابیان بۆ کردوون و ڕێزیان گرتوون، بۆیە هەرکاتێک مامۆستایەکی بەڕێز لە شار و شارۆچکەکانی دیکە ڕووبەڕووی گرتن و سزادان بووبێتەوە، مامۆستایانی هەڵەبجە چوون بەگژ ڕژێمدا و هەوڵیانداوە کە لەژێر چەپۆکی دەسەڵاتداران دەریان بهێنن. ئەمانە هۆکار بوون بۆئەوەی کە هەڵەبجە ببێتە ئەو قوتبەی کە هەموو خەڵک لەژێر سایەیدا حەرەکەت بکات.

بگەڕێمەوە بۆ باسەکەی خۆمان، ئێمە دوای ئەوەی لە چاوگ دەرچووین بە زەردۆیاندا ڕۆیشتین، کە پێی ئەڵێن دۆڵی دڵی، دۆشەتان، تاکو ڕۆشتینە بەرزاییەکە، کە بەرزاییەکە هەوارگەی خۆمان(کۆکۆیی) بوو، خەڵکی ئێمە کاتی خۆی لە گەرمای هاویندا گوندەکەی خۆیانیان بەجێهێشتیووە و هاوتوونەتە سەرەوە، ئەو شوێنە پێی ئەڵێن وارگەپان، لەوێوە دابەزین بۆ ناو گوندی مۆردین، ئێمە ژمارەیەک چەکمان پێ بوو، چەکدارەکان لە پێشەوە دەڕۆیشتن، جگە لە گەنج وەک پێشتر گووتم ژمارەیەکی زۆر ماڵ و منداڵیشمان لەگەڵ بوو، بەنزیکەیی لە سەد و پەنجا کەس زیاتر دەبووین، هەندێک لە ماڵەکان حەیوان و ڕەشەوڵاخەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا هێنابوو.

ئێمە دوای دەرچوونمان لە چاوگ تووشی هیچ شتێک نەبووین، بەڵام یەک دوو ڕەبایەی جاش لەوێ بوون، پێموابێ ناسراویان تێدا بوو، ئەیانزانی خەڵکی ناوچەکەین و ئەڕۆین، سەرباری ئەوەش زۆر ڕیعایەتی ئەوە دەکرا کە منداڵ نەگری و دەنگی لێوە نەیەت، بەڵام خۆ منداڵ چار ناکرێ، ئەو هەموو خەڵکە بەو شاخەدا بڕۆن، ناکرێ ئەوان بێ ئاگا بووبن، حەتمەن چاوپۆشییان لێکردووین.

دواتر گەیشتینە مۆردین، لە مۆردینەوە ڕۆیشتین بۆ شوێنێک کە پێی ئەڵێن (دەوەرە) کە هەر لە خاکی خۆماندایە، دەوەرە شوێنێک بوو باخ و باخاتی لێ بوو، هەتا نزیک بانگی بەیانی هەموو خەڵکەکە گەیشتنە ئەوێ، ڕۆژەکەی لەوێ بووین، بەرامبەر بە ئێمە گوندی سیمان بوو لە خاکی ئێراندا، چەند نوێنەرێکمان نارده خوارەوە بۆ سەر سیروان، بۆئەوەی پەیوەندی بە ئێرانییەکانەوە بکەن، ئەوکاتەش گەرمەی شەڕی ئێران عێراق بوو، بۆیە ئێرانییەکان هاتبوونە نزیک سیروان، بە بانگکردن تێیانگەیاندبوون، دواتر دوو سێ بەرپرسیان بەبەلەم هاتبوونە ئەمبەر و قسەیان لەگەڵ نوێنەرەکانی ئێمەدا کردبوو و گەڕانەوە، بەڵام ئەو ڕۆژە نەهاتن بەدەممانەوە.

کە شەوی (١٤ لەسەر ٥/١٥) داهات، هەندێ لە گەنجەکان گەڕاینەوە بۆ هەڵەبجە، چونکە بەشێکمان هیچمان لەگەڵ خۆماندا نەهێنابوو، دەمانویست هەندێک پێداویستی و کەلوپەل لەگەڵ خۆماندا ببەین، کە هاتینەوە کانی عاشقان تەقێنرابوویەوە، ئێمەش تا نەهاتینە ئێرە نەمانزانی کە گەڕەکەکەمان تەقێنراوەتەوە، خەڵکێکی کەم نەبێت کە فریا

کەوتبوو هەندێک شتومەک لە ماڵەکەی دەربکات ئەوی دیکەی هەموو ماڵەکەی ببوو بەژێر کەلاوەکەیەوە.

ناوچە تەقێنراوەکەش دەکەوتە پشتی مزگەوتی جمهوری بەرەو قوتابخانەی حەمدون و سالم تاکو ئەم گەڕەکەی بەردەمی ئێمە، یانی لە جسرەکە بەملاوە تاک و تەرایەکیان نەبێ هەمووی تەقێنرابوونەوە، لەولاشەوە تاکو دێتە باخی میر، بەڕووی مزگەوتی بوخاری، بەڵام هەندێک خانووی لای مزگەوتی بوخاری نەتەقێنرابوونەوە، ئەوانە لەکاتی کیمیابارانەکەدا تەقێنرانەوە، بەم دیوی مزگەوتی خالیدیشدا تاکو قوتابخانەی شارەزوور ئەوانە هەمووی تەقێنرابوونەوە.

شەو کە هاتینەوە ئێرە، ماڵەکەی ئێمە تەقێنرابوویەوە، ماڵی باوکم کە لەگەڵ من نەهاتبوون، چووبوونە خانووی ماڵی مامۆستا فەتاحی زاوامان کە لای مزگەوتی بوخاری بوو، ماڵەکەی ئەوان نەتەقێنرابوویەوە، ماڵی مامۆستا فەتاح پێشتر لەگەڵ ئێمەدا دەرچووبوون، ئەوەش بڵێم ئێوارەی سیانزەی مانگ کە ئێمە دەرچووین ژمارەمان بەو ڕێژەیە زۆر نەبوو، ئەوانەی لەگەڵ ئێمەبوون زیاتر خەڵکی گەڕەکی ئێمە بوون، بەڵام کە بەیانی چواردەی مانگ ڕۆژبوویەوە، سەیرمان کرد، نیوەی هەڵەبجە هاتووە!! لەوکاتەدا زانیمان کە خەڵکی سازان و بامۆک و خەڵکێکی عەشیرەتی ئێناخیش لەڕێگەیەکی ترەوە هاتوون.

ڕۆژی پانزەی مانگ بەیانییەکەی بەلەمەکانی ئێران هاتن بەدەمانەوە، لەبەرئەوەی کە بەهار بوو، ئاو زۆر بوو، نەدەتوانرا وەکو پاییزێکی درەنگ کە ئاو کەمدەکات بەپێ ئاوەکە ببڕی، بە بەلەم خەڵکەکەیان پەڕاندەوە، دوو سێ بەلەم خەڵکەکەیان دەگواستەوە بۆ ئەوبەر بۆ سیمان، کاتێ کە خەڵکی شار زانیان ئەو ڕێگایە کراوەتەوە ژمارەیەکی زۆری تر هاتن، تا نزیکەی سێ ڕۆژ دواتریش خەڵک هەر دەهات، دوای پەرینەوەمان بە چەمی سیماندا سەرکەوتین هەتا ڕۆیشتینە سەر ڕێگاکە، لەوێ ئیڤا و سەیارە هات بە شوێنماندا و بردینیان بۆ ئۆردووگای سەریاس.

### ئۆردووگای سەریاس و دامەزراندنی بزووتنەوەی ئیسلامی

هەموو ئەو ئاوارانەی کە لەلای ئێمە و هاوار و شێخانەوە پەڕینەوە خاکی ئێران، لە ئۆردووگای سەریاس کۆیانکردینەوە، بەڵام ئەوانەی لە مەنتیقەی نەورۆڵییەوە ڕۆشتبوون بردبوونیان بۆ جوانڕۆ و سەلاسی باوەجانی، ئێمە لە سەریاس نیشتەجێ بووین، بەڵام دوای ماوەیەک، ئەو مامۆستا بەڕێزانە و ئەو خەڵکەش کە لە ناوچەی نەورۆڵییەوە ڕۆشتبوون و لە سەلاسی باوەجان جێگیرکرابوون، هێنانیان بۆ سەریاس و لەوێ ئەوانیشیان نیشتەجێ کرد، بەڵام خێمەی زگوردەکانیان لە خێزاندارەکان جیاکردەوە، ئێمە کۆمەڵێک زگورد بووین لەبەرئەوەی لەناو خزم و کەسوکارەکانماندا بووین، سیقە و متمانەمان هەبوو، ئەوان ڕازی نەبوون جیامان بکەنەوە، هەر لەوێ

ماینەوە تا تەشکیلکردنی بزووتنەوەی ئیسلامی.

کە بزووتنەوەی ئیسلامی تەشکیلکرا و ڕاگەیەنرا(بەروارەکەیم لەبیر نییە) چونکە لەو ماوەیەدا کۆبوونەوەهی زۆر دەکرا و دەهاتن و دەڕۆیشتن بۆ تاران هەتا بزانن ئێرانییەکان موافەقەت دەکەن بزووتنەوەیەکی جیهادی وا ڕابگەیەنرێت، پاشان لەگەڵ مامۆستا شێخ محەمەد بەرزنجی و مامۆستا شێخ عەبدوللەتیفی واژەیی و ئەوان کۆببنەوە و هەموویان لەژێر سایەی یەک بزووتنەوەدا بن و کێ ڕابەر بێ ئەوانە درێژەیان کێشا، بەڵام ئێمە ئەو کاتە لەو ئاستەدا نەبووین کە بە دوای ئەو قەزیانەدا بچین، پێشتریش ئێمە لەناو تەنزیمی ئیخواندا بووین و دودڵ بووین کە موشارەکە دەکەین یاخود نا.

بەکورتی هەموو ئەوانەی کە ڕوویاندا بوون بە هۆکاری ئەوەی کە ئێمە بڕیاری ئەوە بدەین کە پەیوەست و پابەند نەبین بە بڕیاری ئەو مامۆستا بەڕێزانەی کە بەناوی تەنزیمی ئیخوانەوە تەوجیهیان دەدا و ڕێنماییان دەردەکرد، بەوەی کە: بەشدارنەبین باشە، کاتی نەهاتووە، برایانی تەنزیمی ئیخوان لە دەرەوە ڕازی نین. ئێمە وتمان: ناکرێ ساڵەهای ساڵە لەناو خەڵک و خزمانی خۆماندا خەریکی کاری ئیسلامین، باسی ئەوەیان بۆ دەکەین کە ئیسلام شەراکەت و دەعوە و شۆڕش و جیهاد و دەوڵەتە....، خەڵکانێک سیقە و متمانەمان لەلایان دروست بووە، ئێستا بڵێین وەڵا کاکە ئێستا کاتی نەهاتووە، خۆمان لەژێر خێما دانیشین و خەڵکێک بڕۆن بەناوی ئیسلامەوە جیهاد بکەن و شارەزاییەکی ئەوتۆشیان نەبێت، بەناوی ئیسلامەوە بڕۆنەوە بۆ ناو کوردستان و دیوێکی ناشیرینی ئیسلام نیشانبدەن، چونکە خەڵکێک شارەزایی لە ئیسلام نەبوو ناتوانێت وەک خۆی پەیامەکە بگەیەنێت، مەبەستمان لەو قسەیە خەڵکێکی خۆمان بوو.

جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان ئەو کاتەی کە لە سەریاس بوو، لەبیرمە، کە دڵنیابوو ئیخوانەکان و تەنزیمی ئیخوان لەگەڵی نایەن، فەرمووی: ئەگەر خۆشم بە تەنها بم ئەو جیهادە ڕادەگەیەنم، من لەوکاتەدا لەناو ئەو جەماوەرەدا بووم و لە خزمەتیابووم. هەر لەو کۆبوونەوەدا هەندێک گلەییان لێ کرد، لەوانە بەمامۆستایان گووت ئەو بەڕێزانەی کە لە دەورتن و بزووتنەوەت پێ تەشکیل کردوون، خەڵکێکی عەشایەرن و ئاستێکی وایان نییە، فەرمووی: ئەم کارەی من وەک ئەوە وایە کەسێک بیەوێ خانوویەک دروستبکات، ئەگەر بەردی نەقاڕیی و باشی هەبوو، ئەوە بە بەردی نەقاڕیی و باش دروستی دەکات، بەڵام مادەم هەر ناچارە خانوو دروستبکات و زستان دێت و سەرمای دەبێ، بەردی نەقاڕیشی دەست نەکەوت، ناچارە بە وردە بەردیش بێ خانووەکە دروستبکات، من چی بکەم بەردە نەقاڕییەکان کە ساڵەهای ساڵە بەناوی ئیسلامەوە خەریکن، ڕێکخراون، پەروەردە کراون، نایەن و ئەڵێن کاتی نییە؟ بۆیە منیش ناچارم بەوردە بەردیش بێت ئەم جیهادە هەر ڕابگەیەنم، ئەگەر کەسیش نەبێ هەر خۆم دەیکەم.

ئێمە وتمان ئەم خەڵکە ساڵەهای ساڵە سیقە و متمانەی بە ئێمەیە و باسی جیهادمان

بۆ کردوون، ئێستا بڵێین جیهادەکە ناکەین، سیقە و متمانەمان لەلایان نامێنێ، پاشان ئێمە بەو خەڵکەوە شتین، ئەو خەڵکە خۆی بڕوات و ئێمە بمێنینەوە قسە بۆ کێ بکەین، کێ پەروەردە بکەین، کێ دەعوە بکەین، بۆیە لەگەڵیان دەڕۆین، هەم ئاگامان لێیان دەبێ، هەم جیهادێکە و فەرزیشە، پێشمانوایە کاتی هاتووە و پابەندنابین بەو ڕێنماییانەوە کە لەسەرەوە پێمان دەگات.

**مەشق و ڕاهێنانەکانی بزووتنەوە:**

دوای ئەوەی کە هێز تەشکیل کرا، مەشقکردن دەستیپێکرد، مەشقەکەش دووجار بوو، یەکەمیان لە مانگی ١٠ی ١٩٨٧ بوو، واتە دوای ڕاگەیاندنی بزووتنەوەی ئیسلامی بوو بۆ ئەو خەڵکەی کە ناویان نووسیی بوو ببن بە چەکداری بزووتنەوە، ئەوەش لەسەر داخوازی سەرکردایەتی بزووتنەوە خۆی بوو، چونکە وتیان ئەو هێزەی کە دروستبووە پێویستی بە مەشقی سەربازییە، واتە ئەم مەشقە بەر لە بیرۆکەی داگیرکردنی هەڵەبجە و سنوورەکەی بوو، ئامانجیش لێی ناردنی مەفاریز بوو بۆ قوڵایی خاکی کوردستان، لەوانە بۆ ناوچەکانی قەرەداغ و کەرکووک و چەند شوێنێکی تر. مەشقەکانیش لە سەریاس و تازاوا، کە گوندێک بوو لە پاڵ ئۆردوگاکەدا ئەنجامدران، من بەشداریم لەو مەشقەدا نەکرد. لەڕاستیدا مەشقەکە لەسەر داوای بزووتنەوە خۆی بوو نەک ئێرانیەکان.

دوای ئەم مەشقە چەند مەفرەزەیەک ڕێخرا بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ کوردستان، ئەوەی من ئاگام لێ بوو چەند مەفرەزەیەک بوون، یەکێک لەو مەفرەزانە مامۆستا مەلا قادری کۆکۆیی سەرپەرشتی دەکرد، کە چوون بۆ ئالاتان و ئەو ناوچەیە، مەفرەزەیەکی تریان چوونە سنووری هەڵەبجە، ئەوەی لە ناوچەی هەڵەبجە بوو، نەمدەزانی هەر لەسەر حیسابی بزووتنەوە بوون یان لەسەر حیسابی ئەنصار بوون، ئەنصار جەماعەتی مامۆستا ئیسماعیلی مەلا ساڵحی گەورە بوون، حسەینی مامۆ ڕەشە لەگەڵ ئەو یەکەم مەفرەزەدا بوو شەهید بوو، دواتر ئەوانەی کە لەگەڵی بوون گەڕانەوە چیرۆکەکەیان بۆ مامۆستا مەلا عەلی گێڕایەوە، کە چۆن بووە و چی بووە، من ئەو ڕۆژە لەوێ بووم، ئەوکاتە گومانێک هەبوو کە فیشەک لەدەستی یەکێک لە خۆیان دەرچووبێ و ئەو ڕووداوە ڕوویدابێ. چونکە وتیان تەقە ڕووینەداوە، تەنها فیشەکێک بووە و ئەو پیاوەی پێوە بووە. هەرچی مەشقی دووەمە کاتێک بوو کە ئێمە مقەڕمان دانابوو، لە سەروبەندی مانگی ٣ی ١٩٨٨ بوو.

پێشتریش لە ئەیلولی ١٩٨٧ دەفتەری پاوەی بزوتنەوە دانرابوو، کاک حاجی قاسم لێپرسراوی بوو، کاک حاجی حەسەنی محەمەد نادریش یەکێک بوو لە بەرپرسەکانی، دەفتەری پاوە وەکو دەفتەری پەیوەندییەکان وابوو، ئەمانە تەقریبەن سەرپەرشتیان دەکرد.

یەکەمجار وەجبەیەک چەک لە ئێرانییەکان وەرگیرا و هێنرا بۆ دەفتەری پاوە، ئێمەش لەوێ کۆمەڵە گەنجێک بووین، چەکەکانمان پاک کردەوە، چەکەکان لە جۆری ئاڕبی جی، بیکەی سی، قەناص و کلاشینکۆف بوون و زۆربوون، دواتر دابەشکران بەسەر هێزی سەرکەوتن(نەصر)دا کە مامۆستا مەلا قادری کۆکۆیی فەرماندەی بوو. ئێمەش تیپێک بووین نزیکەی ٧٠ چەکدارێک دەبووین و کاک محەمەدی مەلا حەمەکەریمی کۆکۆیی بەرپرسمان بوو، ئێستا ماڵیان لە سلێمانییە، دوای شەهیدبوونی شەهید حسەین، تیپەکەمان ناونا تیپی شەهید حسەین، بەحوکمی ئەوەی ناوبراو خەڵکی ناوچەکەی ئێمە بوو. جگە لە تیپەکەی ئێمە، چەند تیپێکی دیکە تەشکیل کرا، لەوانە ئەو تیپەی کە حاجی غەریب سەرپەرشتی دەکرد و لە عەبابەیلێییەکان و خەڵکی مەنتیقەی شەهیدان پیکهاتبوون. تیپی نەورۆڵییەکان کە ئەحمەد عەبدوڕەحمان مەشهوور بە ئەحمەدی قەتە بەرپرسی بوو، تیپێکی دیکەش هەبوو مەلا فاتیحی بامۆکی سەرپەرشتی دەکرد، هەڵەنەبم کاک حەمەفەرەجی باوکی مەلا سەعید و ئەوان تیپێکیان هەبوو، کە بنکەکەیان لە گوندی لاوران بوو. جگەلەم تیپانە هەندێ کەرتیش تەشکیل کران.

هیشتا ئێمە لە دەفتەری پاوە بووین (وابزانم ١١ی تشرینی یەکەم بوو) بزووتنەوەی ئیسلامی بڕیاریدا بارەگاکانی بهێنێتە ناو خاکی عێراقەوە، ئێمە مەفرەزەیەکی یانزە کەسی بووین، چووینە مەنتیقەی چنار و مۆردین، ئەو شەوەی کە گەڕاینەوە بۆ ناو خاکی عێراق، هێشتا ئاو کەم بوو، لەبەرئەوە بەپێ دامان لە ئاوەکە و پەڕینەوە، شەوی دووەم بارانێکی زۆر باری بەوهۆیەوە ئاوی سیروان زیادی کرد، شەوی یەکەم چووینە شوێنێک کە وەک ئەشکەوت و کەورگ وابوو، زۆر گەورە نەبوو، پێی دەڵێن کەوجێزە، ئەو شەوە لەوێ ماینەوە.

تیپەکەی ئێمە(تیپی شەهید حسەین)، کاک محەمەدی مەلا حەمەکەریم لێپرسراوی بوو، کاک مستەفا محەمەدیش جێگری بوو، وەک پێشتر باسم کرد تیپەکەمان سەر بە هێزی سەرکەوتن(نصر) بوو کە مامۆستا مەلا قادری کۆکۆیی بەرپرسی بوو، پێشمەرگەکانی ئەم هێزە نزیکەی ٢٥٠ چەکدار دەبوون. ئەم هێزە دابەش ببوو بەسەر چەند کەرتێکدا، لەوانەی کە بیرمن کەرتی کاک فاتیحی مەلا مستەفا و کەرتی کاک حاجی باقی بوون.

هەر لە مۆردین جگەلە ئێمە، مقەڕی حیزبی شیوعی و یەکێتی لێ بوو، یەکێتییەکان نەوزاد نەورۆڵی و عەبدولی میرزا حەسەن لێپرسراویان بوون، لەگەڵ خاڵە تەیب، تا ئەوکاتەی عەبدولی میرزا حەسەن کوژرا. دەوەرەش هەر مقەڕی یەکێتی لێ بوو، بەڵام چنار لەسەر ئێمە ماڵ بوو، واتە چنار عایدی ئێمەی ئیسلامی بوو، وەک گووتم پێشتر ئێمە لە (کەوجێزە) بووین، دواتر گواستمانەوە بۆ بەردەمی گوندی چنار.

بزووتنەوە و پلانی هێرشی هەڵەبجە

دوای جێگیربوونمان، جارێک مامۆستا مەلا عەلی کە ئەوکاتە جێگری ڕابەری گشتی

و فەرماندەی گشتی هێزە چەکدارەکانی بزووتنەوەی بوو سەردانی کردین و ماوەیەک لەلامان مایەوە، مامۆستا مەلا عەلی بیارەش کە لێپرسراوی مەکتەبی عەسکەری بوو بەهەمان شێوە سەردانیکردین و چەند ڕۆژێک لە لامان مایەوە. سەردانەکەشیان بەمەبەستی ئاگادارکردنەوەمان بوو لە هێرشی سەر هەڵەبجە، بڕیارەکەش وابوو کە هەموو هێزە کوردستانییەکان بە هاوکاری کۆماری ئیسلامی ئێران لە چەند شوینێکی جیاوازەوە هێرشەکە ئەنجام بدەن و هەڵەبجە لەدەست ڕژێمی بەعس ئازاد بکەن.

ئەوەی پەیوەندی بە بزووتنەوەشەوە هەبوو، لەگەڵ هێزەکانی بەدری سەر بە مەجلیسی ئەعلادا لە چنار و مۆردینەوە هەتا مەگڕ و ملەی گەچێنە و ملەی تەنگی ـ مان پێ سپێردرا بوو، ئەم مشتومڕانەی کە باسی دەکەم لە سەرەتای ساڵی ١٩٨٨دا بوو، کارەکەش پێویستی بە خۆئامادەکردن هەبوو، بۆیە دەبوو ئێمە کار بکەین، عەتاد و کەلوپەل بهێنینە ئەمبەرەوە، بۆ هاتوچۆی خۆشمان، پێویستمان بە بەستنی پرد هەبوو، بۆیە هەوڵماندا کە دوو پرد ببەستین، پردێکیان لە شێوەی بێشکەدا بوو، بە سیم ئەمبەر و ئەوبەری دەکرد، لەگەڵ پردێکی هەوایی کە ئەویش نەفەر هاتوچۆی پێ دەکرد، بەڵام کەلوپەلەکانمان بە هێستر دەگواستەوە، هێسترەکان گرفتیان نەبوو، دەیاندا لە ئاوەکە و دەپەڕینەوە، کاتەکەش زستان بوو، لەبەرئەوە کەشوهەوا زۆر سارد بوو، ئێمەش لەبەرئەوەی لە قەراغ ئاوەکەدا بووین و ئیشمان دەکرد، بەمەبەستی خۆگەرمکردنەوە دەبوو بەردەوام ئاگر بکەینەوە، بەگشتی نزیکەی پانزە بۆ بیست ڕۆژێک سەرقاڵی ئەم کارە بووین، پاسەوانمان بۆ پردەکان دانا. لەکاتی ئەم ئامادەکارییانەدا تیمێکیش لە ئێرانییەکان بۆ یارمەتیدانمان هاتبوونە ئەمبەرەوە.

ئەگەرچی تۆپخانەکان عێراق چاویان لە ئێمە نەبوو، بەڵام هەواڵ ڕۆیشتبوو بۆ مخابەراتی هەڵەبجە کە ئەوە هێزی پێشمەرگە هاتووە و ئیسلامییەکانیش لەوێن و هێزەکانی سوپای پاسدارانیش هاتوون بۆ ئەوێ، وابزانم ئەوکاتە نەجیمی نامدار مەفرەزەی قوەخاصە بوو، بەهۆی خەڵکێکەوە کە تەنزیم و ڕێکخستنی خۆمان بوون و هاتوچۆیان دەکردین(یەکێک لەوانەی کە هات کاک کامیلی حاجی عەلی بوو، لەوێشەوە چووە ئێران و دواتر گەڕایەوە) هەواڵی بۆ محەمەدی مەلا حەمەکەریم ناردبوو کە موخابەرات زانیویەتی پێشمەرگە لەوێیە، ئێمە دێین، تەقەمان لێ مەکەن، فڵانە سنوور دائەنێین ئەگەر هاتین قواتەکە لەوە زیاتر بەرەو خوار هات ئەوە ئێمە نین، دەتوانن تەقەیان لێ بکەن، بەڵام تا ئێرە ئێمەین، بۆئەوەی نە ئێوە تەقە لە ئێمە بکەن و نە ئێمە تەقە لە ئێوە بکەین. بۆئەوەی کە دواتر تووشی گرفت نەبین هەندێک تەقە ئەکەین، بەڵام ئێوە وەڵام مەدەنەوە، کاتێک هاتن ئەو سنوورەی کە دیاریکرابوو لەوە زیاتر نەهاتنە خوار، لەوکاتەدا ئێمە هەندێ گەنج بووین، ئەمانگووت ئەوە بێ غیرەتییە، چۆن ئەبێ جاش بێتە سنووری ئێمە، ئەمە تەحەداکردنی ئێمەیە، بۆیە خۆمان دەرخست، گەنج

عادەتی وایە، ئەوان ئێمەیان بینی بوو، ئەوانەیان کە عەرەب بوون و پیاوی ڕژێم بوون وتبوویان بە کاک نەجیم باشە ئەوانە چین لەوێ، کاک نەجیمیش وتبووی ئەوە خەڵکی خۆمانن، وتبوویان هەندێ تەقە بکەن ئەگەر وەڵامیان نەدایەوە ئەوە هی خۆمانن، نزیکەی شەش ئاڕبیجیان پێوە نان، لەگەڵ هەندێک وردە تەقە، لەوەدا بوو وەڵامبدەینەوە، ئەوان گەڕانەوە.

دواتر کە ئەو بێشکە و پردانەمان بەست خەبەریان زانیبوو، کە شتێکی وا کراوە، جەیشێکی زۆر هات بۆ سەر ئێمە، ئەو شەوە تیپەکەی کاک ئەحمەدی قەتە و تیپەکەی کاک حاجی غەریب لەوێ بوون، دوو چەکداری پارتیش لەلای مقەڕەکەی کاک ئەحمەد بوون، ئەو مەنتیقە ببوو بە وادی ئەحزاب، هەموو حیزبەکانی لێ بوو، بەیانی زوو لەگەڵ شەبەقدا ویستبوویان بگەڕێنەوە بۆ لای جەماعەتی خۆیان کە ئەو کاتە کاک تۆفیقی ڕەعنا لە دەوەرە سەرپەرشتی دەکردن، دوای ماوەیەک لە دەرچوون و دوورکەوتنەوەیان، بوو بە تەقە، تومەز هێزەکانی ڕژێم تی ئێن تی و کەلوپەلیان لەگەڵ خۆیاندا هێناوە پردەکە بتەقێننەوە، بەوهۆیەوە زۆر هاتبوونە خوارەوە، کاتێک هێزەکەی ئێمە چووینە سەرەوە بۆئەوەی بزانین سەبەبی تەقەکان چیە و چی نییە، تەماشا دەکەین دوو چەکدارەکەی پارتی بە بریندارى گەڕابوونەوە، وتیان جەیش هات، ئێمە ڕووبەڕووی هێزەکەی حکومەت بووینەوە، دوای شەڕێکی زۆر تێکمان شکاندن و پاشەکشەمان پێکردن. ئەم ڕووداوە لە مانگی یەکدا بوو، دوای پانزە ڕۆژی دیکە هێرشێکی دیکەیان کردەوە بۆمان، بەر لە هێرشەکەش لە تۆپخانەی دەڵەمەڕەوە بە خەستی تۆپبارانی ناوچەکەیان کرد، تۆپ کارێکی دەکرد نەتدەزانی شەوە یان ڕۆژە، بەڵام سوپاس بۆ خوا ئەمجارەش شکان.

ئەو ماوەیەی کە سەرقاڵی ئامادەکاری بووین نزیکەی ٣٥ وڵاخمان لا بوو، بەردەوام عەتاد و فیشەک و گوولە ئاڕبیجی و صاروخ و کاتیۆشامان لە سیمانەوە پێ دەگواستنەوە بۆ قەراغ سیروان و لەوێشەوە دەمانهێنا بۆ بارەگاکانمان لە سەرەوە....

### بۆچی هەڵەبجە؟

هێرشەکە بۆ ڕاگرتنی باڵانسی هێز بوو، لەبەرئەوەی عێراق زۆری بۆ ئێران هێنابوو، ئەگەر بگەڕێیتەوە بۆ کتێبەکەی شەوکەتی حاجی موشیر کە باسی گرتنی هەڵەبجە دەکات، باسی ئەمەی کردووە، ئێرانییەکان دەیانەویست بەرەیەکی دیکەی شەڕ بکەنەوە، سەرکردایەتی کوردیش بەتایبەتی یەکێتی دەیویست بەرەیەکی دیکەی شەڕ بکاتەوە، چونکە لەوکاتەدا هێزەکانی ڕژێم لە دۆڵی جافایەتی سەرقاڵی پەلاماردانی سەرکردایەتی یەکێتی بوون، سەرکردایەتی یەکێتی بەدوای کردنەوەی بەرەیەکی دیکەی شەڕدا دەگەڕان، بۆئەوەی فشاری سەر سەرکردایەتی کەمبکەنەوە، چەند شوێنێکیش دیاری کرابوون( لەوانە پێنجوێن، چوارتا، حاجی ئۆمەران) بۆئەوەی بەرەی شەڕیان لێوەبکرێتەوە، بەڵام

هەڵکەوتەی جوگرافی هەڵەبجە وایکرد هێرشی سەر هەڵەبجە ئاسانتربێ بەبەراورد بە شوێنەکانی دیکە و دووریش بوو لە سەرکردایەتی یەکێتییەوە، واتە کردنەوەی بەرەی هەڵەبجە بۆئەوە بوو کە ڕژێم فشارەکانی سەر سەرکردایەتی یەکێتی کەمبکاتەوە، بەوهۆیەشەوە ئەوان بتوانن پشوویەک بدەن و هەناسەیەک هەڵمژن ...

ئەم خواستەی یەکێتیش بەتەواوی یەکی دەگرتەوە لەگەڵ خواستەکانی ئێراندا، هەروەک بەکردنەوەی ئەم بەرەیەش لە قۆناغی بەرگریکردنەوە دەچوونە قۆناغی هێرش بردن، ڕژێمی بەعسیش لە دوای هێرشەکەی سەر کەرکوکەوە کە سوپای پاسداران بەهاوکاری هێزەکانی یەکێتی ئەنجامیدا ئیدی پێی وابوو هیچ جیاوازییەک لە نێوان پێشمەرگە و ئێراندا نییە. لەڕاستیدا توانای هێزی پێشمەرگە و سوپای عێراق بەهیچ شێوەیەک بەراورد نەدەکرا، ڕژێمی بەعس ئەسڵەحە و جبەخانەیەکی گەورەی لە بەردەستدابوو، لە بەرامبەردا هێزی پێشمەرگە خاوەنی چەکی سوک و کلاشینکۆف بوو، پێشمەرگە بەو چەکانە شەڕی گەورە و قورسی پێ نەدەکرا، بۆیە ئەگەر ئێران نەبووایە هێرشەکە هەر نەدەکرا.

## ڕۆڵی بزووتنەوە لە هێرشی سەر هەڵەبجەدا

هێزەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی هەر لە سەرەتاوە بەشێک بوون لە پلانی هێرشی سەر هەڵەبجە، وەک پێشتر گووتم ئێمە لە سەرەتای مانگی سێ وە هەتا چەند ڕۆژێک بەر لە هێرشەکە چەک و جبەخانەمان دەگواستەوە بۆ ئەمبەر، مەشق و ڕاهێنانە سەربازییەکانی بێشتر و گواستنەوەی چەک و تفاق لە خاکی ئێرانەوە بۆ مقەڕەکانمان ئاماژەبوون بۆ بەشداری ئێمە لە هێرشەکەدا، بەڵام ئەو مەشقانەی لە سەرەتای مانگی سێ دا لە ناوچەی تاقەوسان لە کرماشان کران و هێزەکانی یەکێتی تیایدا بەشداربوون، لەسەر چۆنیەتی پەلاماردان و هێرشبردن و چۆنیەتی ڕەبیە گرتن، هێزەکەی ئێمەی تێدا نەبوو، ئێمە ئەو ڕۆژانە هەر لە مقەڕەکانی خۆماندابووین.

لەڕاستیشدا ئەرکی بزووتنەوە لە هێرشەکەدا تەنها کاری لۆجستی نەبوو وەک ئەوەی کە باس دەکرێت، چونکە جگە لە هێزەکانی خۆمان هەموو ئەو پێشمەرگانەی کە لە ناوچەی هەورامان و دزلی بوون و سەر بە هێزی سەلاحەدین بوون وەک ئامادەکارییەک بۆ ڕۆژانی هێرش هێنران بۆ چنار بۆ لای ئێمە. هەر لەچوارچێوەی ئامادەکارییەکان، دوو مەفرەزەمان هاوکاری ئێرانییەکان بوون بۆ پاکردنەوەی مینی بەردەم سەربازگەکانی ڕژێم، وەک ئێمە پێموابێ شەش شەوێک لەگەڵیان دەرچووین بۆ ئەو کارە، بەڵام بەشێوەیەکی گشتی ئێرانییەکان نزیکەی مانگێک بەردەوام بوون لە هەڵگرتنی مینی دەوروبەری سەربازگەکانی ڕژێم. نەک ئێمە هەموو لایەنەکانی تریش ئەم هاوکارییەی ئێرانییەکانیان دەکرد.

ماموّستا مەلا عەلی بیارە بەر لە هاتنی هێزە مەشقپێکراوەکانمان سەردانی کردین، پێشتریش چەند جارێک سەردانی کردبووین و گەڕابوویەوە، ڕێنمایی و تەوجیی پێ دەداین چی بکەین و چی نەکەین. بەڵام ئەمجارەیان کە هات، وتی وادەی هێرشەکە نزیک بووەتەوە، هەندێ شوێن دیاری بکەن و تەرتیبی بکەن بۆ ئەو هێزانەی تر کە بڕیارە بهێنرێن بۆ ئێرە، بۆئەوەی لەبەرچاو نەبن و کەشف نەبن، پێدەچێ هەر دوو یان سێ شەو لێرە بمێننەوە و هێرشەکە دەستپێبکات، شەوەکەی ئەو بێشکەی کە دروستمان کردبوو بەمەبەستی پەڕینەوە چەند پاسدارێک ویستیان لەسەری بپەڕنەوە، بەڵام لەبەرئەوەی ئاو هاتبوو، گەیشتبوونە ناوەڕاستی ئاوەکە و ئاو لێی دابوون و بردبوونی، تەنها یەکێکیان ڕزگاری ببوو، ئەوانی دیکەیان خنکابوون.

**شەهیدبوونی مەلا عەلی بیارە:**

ئەو ڕۆژانە شۆڵ و گرێدەری ئێرانییەکان بۆ ئامادەکاری هێرشەکە لەوێ ئیشیان دەکرد و ڕێگایان چاک دەکرد بۆ سەر سیروان، بەئاشکراش دەبینران، بۆیە تۆپخانەکانی عێراق بەردەوام تۆپبارانی ئەو سنوورانەیان دەکرد، لەم ئان و ساتەدا بوو ماموّستا مەلا عەلی بیارە و هاوڕێکانی گەیشتنە سەر ئاوی سیروان، ویستیان بپەڕنەوە، پێمان گوتن ئاو زۆر هاتووە و ناتوانن بپەڕنەوە، ئەو ڕۆژەش تۆپبارانەکان کەمی کردبوو، بۆیە ئەوانیش بەناچاری گەڕانەوە، دوای ئەوەی لەبەرچاوی ئێمە ونبوون، ئێمەش گەڕاینەوە بۆ شوێنەکانی خۆمان. ئەوەش بڵێم بۆ پارێزگاری لە پردەکە ئێمە مقەڕمان لەسەر ئاوەکە دانابوو. بڕیاربوو ئەوان بگەڕێنەوە سیمان و شەوەکەی لەوێ بمێننەوە و بەیانی جارێکی تر بگەڕێنەوە و هەوڵی پەڕینەوە بدەن، چونکە ئێمە پێمان وابوو ئەو ئاو و لافاوەی کە هاتووە ماوەی بیست و چوار سەعات دەخایەنێت هەتا کەمدەکات و ئاسایی دەبێتەوە،

بەڵام وادیارە دوای دوورکەوتنەوەیان لە ئێمە چوونەتە سەر کانییەکەی سیمان، بێ ئاگا لەوەی ئەو شوێنە دیارانە هەمیشە ڕەسەدی تۆپخانەکانن، چونکە ڕەسەد لەسەر ئەو شتانە تۆمار دەکرێت، کانیەکە ڕەسەد بووە و شوێنێکی دیاریکراو بووە، کە ئەمانیان لە بەرزاییەکانی شاخی باڵامبۆ کە بەرامبەر بە کانیەکەیە بینیوە، کردبوونیانە ئامانج، وادیارە بەوردی چاودێری کرابوون، چونکە یەکەم تۆپ لێی دان، ئەوانەی لەوکاتەدا لەوێ بوون پێنج کەس بوون، کە بریتی بوون لە: ماموّستا مەلا عەلی بیارە، کاک مەحمودی شێخ حسێن (ناسراو بە شاڵاو)، یاسین ڕەشید، شەهید صابیر و شەهید تەها. کە تۆپەکە لێی دابوون هەر لەوێدا کاک تەها و کاک صابیر شەهید ببوون، تۆپەکە لە نزیکی شەهید صابیر بەر زەوی کەوتبوو، لەکاتی دەستنوێژگرتندا بوو، بۆیە ئەندازەیەک سووتابوو، ماموّستا مەلا عەلیش بریندار ببوو، بەوهۆیەشەوە لە هۆش خۆی چوو بوو، کاک مەحمودیش پارچەک بەر قاچی کەوتبوو، دواتر لەکاتی گواستنەوەیان بۆ نەخۆشخانە





مامۆستا مەلا عەلیش گیانی سپارد و لە شاری سنە ناشتیان. ئەو ڕووداوە بوو بەهۆی نیگەرانی و ناڕەحەتبوونی ئێمە، چونکە ئێمە هەموو ئامادەکارییەکمان کردبوو، هێرشەکە لە ئان و ساتدا بوو، بەڵام نەماندەزانی چ کات و ڕۆژێک دەستپێدەکات.

دوای ئەم ڕووداوە، مامۆستا مەلا عەلی و ئەو هێزەی کە مەشقیان کردبوو هاتن، ڕۆژی دوانزەی مانگ نامەیەک لە مامۆستا مەلا عوسمانەوە هات بۆ مامۆستا مەلا عەلی، ئاگاداری ئەکاتەوە کە بزووتنەوەی ئیسلامی بەشداری هێرشی سەر هەڵەبجە ناکات. من ئەو کات فەرماندەی مەفرەزە بووم، زۆر ئاگام لە وردەکارییەکەی نەبوو، من نازانم ئەوە تەصەور و قەناعەتی جەنابی مامۆستا مەلا عوسمان خۆی بووە یان خەڵکێک بە جەنابی مامۆستایان گووتووە، ئەم کارە باش نییە و ئێوە دەبن بە سەبەبی ئەوەی کە گرفت و قەیرانێک بۆ خەڵکی ناوچەکە دروست ببێ...

> **لە نامەکەی مامۆستا مەلا عوسمانەوە بۆ مامۆستا مەلا عەلی: دیارە ئەوە هێرش بۆ سەر هەڵەبجە یەکلایی بووەتەوە، من وەکو خۆم تەواوی بەرپرسیارێتی بەشداری نەکردنمان دەخەمە ئەستۆی خۆم، لەبەرئەوەی دەرەنجامێکی باش چاوەڕێی ئەم هێرشە ناکات.**

مامۆستا مەلا عوسمان نامەکەی بۆ مامۆستا مەلا عەلی ناردبوو، سڵاو و ڕێزیش دەگەیەنێ بە مامۆستا مەلا ئەحمەد و تەواوی پێشمەرگەکان، دەڵێ دیارە ئەوە هێرش بۆ سەر هەڵەبجە یەکلایی بووەتەوە، من وەکو خۆم تەواوی بەرپرسیارێتی بەشداری نەکردنمان دەخەمە ئەستۆی خۆم، لەبەرئەوەی دەرەنجامێکی باش چاوەڕێی ئەم هێرشە ناکات، ساڵەهای ساڵە ڕژێمی بەعس لە هەڵەبجە بەداخە و لە کەمینایە بۆی، پێموایە خەڵکەکەی تووشی زەرەر و زیان دەبن، بۆیە بە هیچ شێوەیەک ڕازیم نییە هێزەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی بەشداری بکەن، من لای ئێرانییەکان وەڵامی ئەو پرسیار و گلەیی و گازندانە دەدەمەوە.

هەتا ئەوکات و ساتەش تەنها هێزی ئیستیطلاعی و هێزی تەخریباتی دەهات و (مین) یان هەڵدەگرتەوە، ئێمە هەتا ڕۆژی دوانزە و سیانزەی مانگ کە هێرشەکە دەستپێکرد ئەو هێزە زۆرەی ئێرانییەکانمان نەبینی کە دواتر هاتن. سەربارى ئەوەش هیچ کێشەیەکمان لەگەڵیان نەبوو، پێمانوابوو ئێمە بەشدار دەبین و هەموو ئامادەکارییەکی تەواومان کردبوو. تەنانەت کە هێزەکانی ئێران هاتن، ویستمان لەگەڵیاندا بڕۆین هەتا بزانین چی دەکەن و

چی ناکەن، لەوکاتەدا بە ئێمەیان گووت ئێوە مەیەن و بگەڕێنەوە، چونکە سەرکردەکانتان بڕیاریانداوە بەشدار نەکەن. بەتایبەتی قۆڵی ئێمە هێزی فەیلەقی نۆی بەدری سەر بە مەجلیسی ئەعلای لێبوو، زۆربەی زۆریشیان تائیبوون بوون، واتە سەربازی عێراقی بوون و گیرابوون دواتر بەریاندابوون، کوردێکی خەڵکی کەرکووکیان لەگەڵ بوو، لەگەڵ ئەودا پەیوەندیمان هەبوو، کوڕێکی ڕووخۆش بوو، ئەوانیش زۆر ڕێزیان ئەگرت.

واتە هەتا ئەوکاتە جگە لە ئێمە، هێزی بەدری سەر بە مەجلیسی ئەعلا و خەڵکێکی کەمی ئێرانییەکانیش لەوێ بوون، ئەوەی کە لە سنووری ئێمەدا شەڕ و هێرشی کرد فەیلەقی بەدر، ئێرانییەکان دەستیان تیای نەبوو. شەوی ١٢ لەسەر ١٣ی ئازار هێرشەکە دەستپێکرد، ئەو هێزانەی کە هاتن هەمووی بە لای ئێمەدا تێپەڕین و سەرکەوتن بۆ سەر شاخی باڵانبۆ، دواتریش ئەسیر و کوژراو و برینداڕەکانی خۆیان کە ژمارەیەکی زۆربوون لەلای ئێمەوە دەگواستەوە و دەیانبردنەوە بۆ ئێران.

سوپای بەدر هەر لە شەوی یەکەمدا شاخی باڵامبۆی گرت، لە سنووری ئێمەوە هێزی یەکێتی و پارتی لێ نەبوو، سۆسیالست لە سورێن، پارتی لە مڵەخورد و ئەحمەدئاوا بۆ سیروان، یەکێتی لە هاوار و شێخان، بۆین و شنروێ وە بۆ هەڵەبجە، ئەوەش دەرخەری ئەوەبوو ئەگەر ئێمە هێزی لۆجستی بووینایە هێزی دیکەی لایەنە کوردییەکانیان لێرە دادەنا.

ئێمە کە بەشدار نەبووین و دیمەنی شەڕەکانمان بینی زۆر تووڕە و نیگەران بووین، چەکەکانمان ئەدا بە زەویدا، پێمانوابوو ئەوە بێ غیرەتییە و هەر ئیش نییە، ئەمانگووت عەیبە و چۆن ئەکرێ بەشدار نەبین، پێمانوابوو فەتحی مەککە ئەکەین، ئەوەش بڵێم جگە لەو هێزەی ئێمە لە هەورامانیش هێزمان هەبوو، کۆمەڵێکی تریشمان لە قەرەداغ بوون، مامۆستا مەلا قادری کۆکۆیی و مامۆستا مەلا ئیبراهیم و هاوڕێکانیان ئەو کاتە لەوێ بوون.

## چوونی هێزەکەی بزووتنەوە بۆ ناو شار

ڕۆژی ١٦ی مانگ هەموو شتێک تەواو بوو، تەقە نەمابوو لە سنوورەکەدا، تەنها تەقەیەکی کەم مابوو لەمبەری ئاو بۆ ئەوبەری ئاو، بە تۆپ و چەکی قورس. ئێمە سەرلەبەیانی ڕۆژی ١٦ی ئازار لەگەڵ شەبەقدا هێزەکانمان کە نزیکەی (١٥٠-١٧٠) پێشمەرگە دەبوو کۆکردەوە و بەڕێکەوتین، نەماندەزانی چی ڕوویداوە، لە ڕێگاشدا کەسمان نەبینی، بە بەرزایی پشتی چنارەوە، شوێنێک هەیە پێی دەڵێن باسک، لەوێ بەرەو کانی هەنجیر هاتینە خوارەوە، تا شوێنێک پێی دەڵێن کانی هەنار، لەوێ دارێکی لێیە، مامۆستا مەلا عەلی لەژێر ئەو دارەدا کۆی کردینەوە، چاکم لەبیرە، دوو هێسترمان پێ بوو، یەکێکیان مامۆستای هەڵگرتبوو، لەسەر وڵاخەکەی دابەزی، وتارێکی بۆداین، گووتی ئەوە ئێمە دەڕۆینەوە ناو شار، لەوانەیە خەڵکێکی تیابێ پێشتر جاش یان پیاوی ڕژێم و ئیستیخبارات بووبێ، خانووی ئێمەیان تەقاندبێتەوە، ئێمەیان ڕاوناوە و خەڵکیان لێ شەهید کردبین، ئیهانەیان پێمان کردبێ، کون بەکون گەڕابن بە شوێنماندا، ئێمە کە دەڕۆین بۆ تۆڵەکردنەوە ناڕۆین،

بۆ بەدەمەوەچوون و هاوکاری خەڵکی دەڕۆین. کە مامۆستا قسەکانی کرد، ڕێک خۆمانم شوبهاند بە ئەو کاتەی کە فەتحی مەککە کرا و تەشبیهـ نەبێ پێغەمبەر(د.خ) وتاری دەدا، چونکە من کاتی خۆی فیلمی ڕیسالەم بینی بوو، هەر ئەوەش هۆکار بوو کە ئێمە هاتینە خوارەوە بەرەو هەڵەبجە دەستمان کرد بە تەکبیر و الله اکبر، قل جاء الحق و زهق الباطل، إن الباطل کان زهوقا، دەنگمان نووسابوو ئەوەندەمان هاوار کردبوو.

دوای وتارەکە، هێزەکەمان بەش کرد، تیپی نەورۆڵییەکان لە مەنتیقەی گوڵان و باوەکۆچەکەوە هاتنە خوارەوە، ئێمە بەمبەری بامۆکدا هاتین، تیپەکەی کاک غەریب و هەورامییەکان لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلی و ئەواندا بوون. گەیشتینە ناو هەڵەبجە، ئەوانەی کە لەگەڵ مامۆستا مەلا عەلیدا بوون، لە باخی میرەوە بەرەو گەڕەکی سەرا و قایمقامیەت ڕۆیشتن، ئەوکاتە بڕیاربوو هێزی لایەنەکان لە سەرا یان قایمقامیەت کۆببنەوە. تیپەکەی ئێمەش لە نزیک سەعات ١٠:١٥ گەیشتە گەڕەکەکەی خۆمان و لە مزگەوتی خالید جێگیر بووین و نەچووینە ناو بازاڕ، کاتێک ئێمە گەیشتین تەقە لەناو شاردا نەمابوو، بەڵام لە نزیک سیروان و شارەزوور کەمێک هەرمابوو. لەناو مزگەوتەکەدا نزیکەی چل و پێنج دەقیقەیەکماینەوە، دواجار وتیان کاکە هەرکەس بڕوات بۆ ماڵ خزم و کەسوکاری بۆ نان خواردن، سەعات ١:٣٠ دێینەوە ئێرە، بزانین تەوجیە و ڕێنمایی تازە چییە، ئێمە لەگەڵ چەند کەسێکدا ڕۆیشتین بۆ ماڵی باوکم، کە لە خانووەکەی ماڵی خاڵۆم بوون، لای مزگەوتی بوخاری، بوو بە سەعات ١١:٣٠ بۆ ١١:٤٥ دەقیقە و سفرەیان داخست و سەرەتای بۆردومان دەستیپێکرد، یەکەمجاریش کیمیاوی نەبوو، ناپاڵم بوو. ئێمە بە کەسوکارەکانمان گووت کاکە دەرچن و لەناو شار مەمێنن، چونکە ئێمە مەشقمان دی بوو، دەمانزانی ئیحتیمالی کیمیایی هەیە.

### لایەنەکان و ئاگادارکردنەوەی خەڵکی شار

من لام وانییە لایەنەکانی تر خەڵکیان ئاگادارکردبێتەوە یان داوایان لە خەڵک کردبێ کە لە شار بچنە دەرەوە، هەرکەسیش وای گووتبێ من باوەڕم پێی نییە، چونکە ئەگەر ئەم قسە وابوایە بۆچی لە پاش هێرش و داگیرکردنی هەڵەبجە ڕێگرییان لە خەڵک کرد بچێتە دەرەوەی شار؟ ئەوە تەنها هێزی بزووتنەوە بوو کە هاوکاری خەڵکی دەکرد و داوای لێ دەکردن کە لە شار دەربچن، ئەوانی تر پێیان وابوو دەبێ خەڵکی هەڵەبجە و هەورامان و شارەزوور لێرە بمێننەوە بۆئەوەی خۆیان حوکمیان بکەن، ئەگەر خەڵکی بڕۆن ئۆردووگاکان کەواتە ئەمان شارێکی چۆڵ و وڵاتێکی وێرانەیان بۆچییە دەسەڵاتیان بەسەریدا هەبێ، لەوکاتەدا ئەوەشیان سەلماند، بۆ نموونە تۆفیقی کارەبا و خەڵکانێکی تر لە شار دەرچوون، بەڵام دواتر گەڕاندنیانەوە، وتیان بۆچی شار چۆڵ دەکەن؟ لەبەرئەوە ئەگەر وتبێتیان ئاگاداری خەڵمان کردووە بۆ دەرچوون ئەوە من قەناعەتم پێی نییە، چۆن شتی وایان وتووە و دواتر داوایان لە خەڵکەکە کرد کە بگەڕێنەوە؟

سیروانیش ڕۆژی یەکەم کیمیاباران نەکرا، خەڵکی سیروان کە لە ماڵ دەرچوون بەرەو هەڵەبجە و هەورامان ڕۆیشتوون. ئەگەر ئەوان لەلایەن سۆسیالیست و پارتییەوە ئاگادارکرابنەوە ئەوە لە دوای گرتنەکەی بووە نەک بەر لە هێرشەکە، هەروەک چۆن ئێمەش خەڵکمان ئاگادار ئەکردەوە کە شار بەجێ بهێڵن، لەبەرئەوە ئاگادارکردنەوەکەی ئەوانیش هەمان کات بوو. بەر لە هێرشەکە بەڵێ مەفرەزەمان ئەهات ، بەڵام ئەوانە لەگەڵ ئێرانییەکان ئەهاتن، بۆ کەشفکردنی سەربازگەکان و شوێنە سەربازییەکانی حکومەت، بۆ دیاریکردنی ئەحداسیە بۆ ڕەسەد و ئەوانە، نەک بۆئەوەی بە خەڵک بڵێن چۆڵی بکەن.

## دەستپێکردنی بۆردومان

دوای دەسپێکردنی بۆردومان بە کەسوکارەکانمان گووت چۆڵی بکەن، خۆشمان وەک پێشتر بڕیارمان لێ دابوو گەڕاینەوە بۆ مزگەوتی خالید، کۆبووینەوە، پێیان گووتین بڕۆنە دەرەوەی شار هەتا بزانین ئەم بۆمباباران و تۆپ و تەیارە چی لێدێت، ئێمەش ڕۆیشتین بەرەو گوڵان و باخەکانی بەردەم غاباتەکەی باوەکۆچەک، ئێمە نزیکەی ١١ پێشمەرگە بووین، بۆردومان درێژەی کێشا، صاروخ دەیدا بە زەویدا و دوکەڵێکی کەمی دەکرد، بەڕەحمەت بێ کاک فاتیح گووتی بەخوا هیچی پێ نەماوە ئەوەتا صاروخەکانیش ناتەقنەوە، هی مەخزەنە کۆنەکانە، وتی ئەم ساروخانە هی سەردەمی شۆڕشی ئەیلولە هەڵیگرتووە و ئێستا بەناچاری بەکاریان ئەهێنێ، ئەوەتا ناتەقنەوە. ئێمە پێشتر کیمیاویمان نەدیبوو، بەڵام ناپاڵم و صاروخمان بینیبوو کە دەیاندا بەزەویدا دوکەڵی زۆریان دەکرد، کە ئەمانە دوکەڵی زۆریان نەدەکرد پێمانوابوو ناتەقنەوە، بێ ئاگالەوەی ئەمانە کیمیاوین بۆیە دوکەڵێکی ئەوتۆ ناکەن.

زۆری نەبرد پێشمەرگەیەک هاواری کرد خەڵکینە فریاکەون مامۆستا مەلا عەلی شەهید بوو، دەستیکرد بە هاوار و واوەیلا، ئێمە هاتینە خوارەوە، سەیرمان کرد مامۆستا مەلا عەلی نیە، پیاوێک بوو ناوی شێخ سەیفەدین بوو، لای مزگەوتی جمهوریدا دوکانی هەبوو، من دەمناسی، خۆی و خێزان و کوڕێکی بوو، کە ناوی فاروق بوو، لەگەڵ خێزانی کوڕەکەی و دوو منداڵیشیان پێبوو. خێزانی فاروق لەبەرئەوەی دوو منداڵی پێبوو بەپەلەتر دەرچوو بوو، کردبوویە ئەوەبەر بۆ بەرزاییەکە، بەڵام ئەمان کیمیاوی لێی دابوون، کاتێک ئێمە گەیشتین شێخ سەیفەدین کەفی ئەچەراند، کوڕەکەشی بە هەمان شێوە و لە باوەشی دایکیدا بوو، هەرسێکیان لەوێدا گیانیان دەرچوو، ئەوە یەکەمین جەنازەی کیمیاوی بوو کە ئێمە پێی گەیشتین، ئەوەی دەیڵێم نزیک سەعات ٢ بۆ ٢:٣٠ بوو. ئێمە وەک خۆمان ماسکمان وەرگرتبوو، بەڵام قەناعەتمان پێی نەبوو، دوان سیانێکمان نەبێ ئەوانی دیکەمان نەیانبەستبوو، یەکێک لەوانە کاک قادر بوو هەڵیگرتبوو، ئەو ماسکە سەبیلەیەکی پێوە بوو، قوتوویەکی پێوەیە، دەبێ سەری ئەو قوتووە لابەری بۆ ئەوەی هەوا بێتە ناوی و لەوێدا هەواکە تەعقیم بکات و ئینجا هەڵیمژی، ئەمە لانەبەی هەناسەت بۆ نادرێ، ئەمیش هەموو جارێ کە ئەیکردە سەری هەناسەی بۆ نەئەدرا، قیناعەکەی بەرزئەکردەوە و هەناسەی هەڵئەمژی ئینجا ئەیکردەوە

سەری، لەوکاتەدا کە خەریکی جەنازەکان بووین قیناعەکەم لەسەری لابرد وتم دە لایبە ناهێڵێ جەنازەکان کۆبکەینەوە، ئیتر ئەویش لایبرد و بەکاری نەهێنا. ئێمە تاقەتمان نەبوو هەڵیبگرین، بەڵام پاسدارەکان کە شارەزایی باشیان هەبوو لەسەر شێوازی بەکارهێنانەکەی هەر لە سەرەتای دەستپێکردنی بۆردومانەکەوە کردیانە سەریان و بەکاریان هێنا.

### کۆبوونەکەی مامۆستا مەلا عەلی

سەبارەت بەو قسە و قسەڵۆکانەی کە باس لەوە دەکات مامۆستا خەڵکی ئاگادارکردووە کە بێن بۆ مزگەوتی پاشا و لەگەڵیاندا کۆببێتەوە، ئەسڵی نییە، مامۆستا خەڵکی ئاگادارنەکردووەتەوە، بەچی خەڵک ئاگادار بکات. مامۆستا لەبەرئەوەی خۆی پێشتر ئیمامی مزگەوتەکە بووە، لە دوای ئەو ماوەیە دێتەوە بۆ ناو مزگەوتەکە، خەڵکێک لە دەوری مامۆستا مەلا عەلی بوون، بە ئیختیاری خۆیان هاتوون، دوای ئەوەش مامۆستا مەلا عەلی شوێنەکە بەجێ دەهێڵێ، پاشان قەسف دەستپێدەکات و ساروخەکان بەر ئەو شوێنە دەکەون، ئەسڵەن مامۆستا مەلا عەلی لەوێ نەماوە. خۆ ئەگەر لەکاتی قسەکانی مامۆستادا بووایە مامۆستا لەناو میحرابەکەدا قسەی کردووە، باشە ئەگەر ساروخ بدات لە میحرابەکە مامۆستا مەلا عەلی دەبوو پێوە ببوایە، بۆیە ئەو قسەیە ڕاست نییە، کە دەڵێ لەکاتی قسەکانی مامۆستا مەلا عەلیدا خەڵک شەهید بووە، ئەگەر وایە چۆن مامۆستا مەلا عەلی بە سەلامەتی دەرچووە، لەکاتێکدا ساروخ لەو شوێنەی داوە کە مامۆستا تێدا وەستاوە.

### بەشداری نەکردنی شیوعی

بەشداری نەکردنی شیوعی لەسەر ئەوە نەبوو کە قەناعەتی بە شەڕەکە نەبێت، بەڵکو ناکۆکی ئایدۆلۆژی لەگەڵ ئێراندا هەبوو. بەدرێژایی ئەو ماوەی کە لە مۆردین بووین، وەکو مقەڕ سەردانمان دەکردن، خۆ لەگەڵ یەکێتی و پارتیدا لە ڕووی فیکر و تەصەورەوە جیاوازی زۆریان نەبوو، بەڵام چونکە بە ئاشکرا ناویان شیوعی، ئێمەش بەشێوەیەک لە شێوەکان بە ئەنتی ئەوان دەناسراین، پەیوەندییەکانمان لەگەڵیان بەو ئەندازە نەبوو کە لەگەڵ یەکێتی و پارتی و سۆشیالیستدا هەمانبوو، ئیتر نازانم بۆ ئەو هێزانەمان کە لە قەرەداغ بوون، بەڵام ئێمە نەمانبوو.

### پەیوەندی لەگەڵ دیموکرات

ئێمە وەک حیزب هیچ پەیوەندییەکمان لەگەڵ دیموکراتدا نەبوو، بەڵام خەڵکێکمان لەگەڵیاندا هەیانبوو، لەدوای گیرانی هەڵەبجە مەفرەزەیەکی دیکەمان لەلای ئەوانەوە هاتبوون بەمدیودا، پێشمەرگەیەکمان بەناوی ڕەحیم حەمەتەقی لەگەڵ هێزەکانی دیموکراتدا ببوو بە شەڕی لەوێ شەهید ببوو، ئەوکاتە بوو کە هێشتا دیموکرات لەوێ مابوون و لە پەنای هێزەکانی یەکێتیدا بوون، ئەمیش وابزانم پەیوەندی هەبوو لەگەڵ دیموکراتدا، ئەیانناسی، بوو بە شەڕیان و لەوێ شەهید بوو.

## دۆسیەیەکی تایبەت بە دیاردەی ئاینی لە هەڵەبجە

دوای ١٦ی مانگ، من بۆماوەی ٣٧ ڕۆژی تر لە هەڵەبجەدا مامەوە، بارەگمان لە عەبابەیلێ بوو، دوای سێ ڕۆژ من چوومە ناو بینای ئەمن کە دەکەوتە لای باخی گشتی، هەندێ ئەوراقم بینی پەرت و بڵاوببوونەوە، کوڕێک لەوێ بوو ناوی والی حاجی ئەوڕەحمان بوو، کە هەر خزمی خۆشمانە، وتی بۆچی ئەگەڕێی؟ وتم بزانم لەناو ئەم دۆسیە و وەرەقانەدا کێ موخابەرات و ئیستیخبارات بووە و کێ چی بووە و چی نەبووە، وتی من شتێکم لایە، ئەگەر ئەتەوێ بۆت ئەهێنم، وتم بیهێنە، والی کەسێکی ئیسلامی بوو، پێشتر زۆر چاوەڕێمان کرد کە لەگەڵمان بێتە دەرەوە، بەڵام دیارە بۆی نەگونجا،ماڵیشیان لای مزگەوتی بوخاری بوو، هێنای تەماشام کرد دۆسیەیەکە بەناوی(ظهور ظاهرة دينية في حلبجة)، باسی ئەوەی دەکرد کە زاهیرەیەکی دینی لە هەڵەبجە هەیە، ئەم زاهیرە دینییە ئەگەر ڕێگری لە بڵاوبوونەوەی نەکرێ، تەشەنەکە دەکات و کوردستان داگیر دەکات، چونکە کۆمەڵێک مامۆستا لێرە هەن کاریگەرییان هەیە، پێویستە ڕێگریی لە کاریگەرییان بگیرێت، پاشان دەهاتە سەر خۆپیشاندانەکەی ١٩٨٧/٥/١٣ و چی بکرێت، هەروەها تەواوی نەخشە و پلانەکانی تێدا بوو، نووسرابوو(قلع كاني عاشقان) یانی هەڵکێشان و بە تەواوەتی لەڕیشەوە دەرهێنانی، باسی کوشتن و زیندەبەچاڵکردنی خەڵکەکەی تێدا بوو.

نزیکەی ١٥ لاپەڕە ئەبوو، ماوەیەک لەلام بوو هەتا گەڕامەوە بۆ کامیاران، بە مامۆستا مەلا قادری کۆکۆییم گووت: دۆسیەیەکی وام لایە و زۆر لە بەرژەوەندی بزووتنەوەی ئیسلامییە، چونکە باسی باسی زاهیرە دینی لە هەڵەبجە و کاریگەری سەرکردەکانی بزووتنەوەی ئیسلامی دەکات، باسی خۆپیشاندانەکان و ناوی خەڵکەکەی تێدایە کە شەهید بوون، لەگەڵ ناوی ئەوانەی کە زیندەبەچاڵیان کردبوون، تەواوی دۆسیەکەم لەلایە، ئەگەر تەسلیمتی بکەم شتێکی باش ئەبێ. ئیتر من تەسلیمی ئەوم کرد، ئەویش چووبوو تەسلیمی مامۆستا مەلا عەلی و ئەوانی کردبوو، ئەوانیش دابویانە بە مامۆستا کرێکار، دواتر مامۆستا کرێکار بۆ یەکەمجار لە گۆڤاری (النفير)دا بەبێ ئاماژەدان بە سەرچاوەکەی کە لە کوێوە هاتووە و چۆن دەستیکەوتووە بڵاویکردەوە. لەوانەشە پێیان نەگووتبێ. منیش ئەو کاتە هەر ئەوەندە لە قەزیەکە حاڵی بووم، کە تەنها بەڵگەیەکە و کەوتووەتە لای ئێمە، لایەنەکانی دیکەش بەڵگەیەکی ئەوتۆیان لابووە یاخود نا نازانم، بەڵام بەڵگەیەکی ئەوتۆم لە لایەنەکانی ترەوە بە ڕاگەیاندنەکانیشەوە تا ئێستا نەبینیوە، لەسەر ئەو قەزییانە، ئەوەی ئێمە نەبێت.

## شەهید و بریندارەکان

دوای ئەو ڕووداوانە، ئەو ژمارە پێشمەرگە هاتینەوە ناو شار، لە ڕێگا ئەو جەنازانەمان لادەدا کە لەسەر جادەکە بوون هەتا گەیشتینە لای قوتابخانەی شارەزوور، کە ئێستا ڕەوزەکەیە و کەوتووەتە بەرامبەر ناوەندی کانی عاشقان، لەوێدا لەگەڵ هاوڕێکانمان کە خۆم ژماردمن بیست و شەش جەنازەمان لابرد، لاشەکان بەدەمدا کەوتبوون و کەف

لەدەمیان دەهاتە دەرەوە، هەڵمان دەگێڕانەوە بۆئەوەی خۆڵ نەچێتە ناو دەمیان، کە هەڵمان دەگێڕانەوە و دەمانخستنە سەر پشت گیانیان دەردەچوو. لەوکاتەدا کەسێک هات وتی کاکە ئەوە زۆری ماوە لە کیمیاوی دەربچین، وتم ٥٠٠ مەترێکی دیکە بڕۆن نەجاتتان دەبێ، لەم قسانەدا بووین لە پاڵمدا کەوت، زۆری نەبرد هەر لەوێدا گیانی دەرچوو. دواتر بەم گەڕەکەدا هاتینە سەرەوە و گەڕاینەوە بۆ باوەکۆچەک.

دوای کەمێک پشوودان وتم باشە دنیا بۆ ئەوەندە سوور و تاریک بووە؟ نەمزانی کە کیمیاوی تەئسیری لێ کردووم، ئاخر من خێرا هاتبوومەوە ناو شار، لایتێکم تازە کڕیبوو، دامگیرساند بە حاڵ نوزەی ئەهات، وتم باشە ئەم لایتە تازە کڕیومە بۆ سکوت بووە، تۆ بڵێی داگیرسابێ و پێم نەزانیبێ، فیعلەن کیمیاوی لێی دابووم، چاوم هەر کەمێک دەیبینی. دوای ماوەیەک مانەوە لە باوەکۆچەک ڕۆیشتین بۆ بامۆک، ئەمەی دەیڵێم دوای عیشایە، لە ڕێگا خەڵکێکی زۆر هاوار و واوەیلا و گریانیان بوو، بە جادەی پشتدا ڕۆیشتینە مزگەوتی بامۆک، لەناو مزگەوتەکەدا بە چاوی زەعیف و لە تاریکایی شەودا خەڵکێکم دەبینی بەرکەوتەی کیمیاوی بوون بەتایبەتی یەکێتییەکان، هەندێکیان کە کیمیاوی لێ دابوون زۆر خراپ تیکچووبوون...

دواتر مەفرەزەکەی ئێمە بەو دەشتەی کە لە پشتی بامۆکەوەیە و ڕێگای سازانە بەرەو عەبابەیلێ بەڕێکەوتین، لای ڕێگاکەی سازان لەو شوێنەی کە خەڵکەکەی ساڵی ١٩٨٧ لێ زیندەبەچاڵ کرابوو چاوەکانم لە بینین کەوت یان بڵێم بە حاڵ تروسکایی تێدا مابوو، دوو کەس دەستیان گرتم هەتا بردمیانە مزگەوتەکەی عەبابەیلێ، لە مزگەوتەکە دەموچاومان شۆری، برادەران نانێکیان هێنا، ئێستاش نازانم برنج بوو یان ساوەر، تۆزێکمان خوارد، ئەو شەوە لەوێماینەوە. خانووەکەی حەمەڕەشید هۆمەر کە بە بەرزاییەکەوە بوو، دواتر کردمان بە مقەڕی خۆمان. بۆ بەیانییەکەی وتیان با لێرە دەرچین، چونکە لەوانەیە ئێرە قەسف بکرێ، من چاوم بەحاڵ نوزەیەکی هەبوو، مقەڕێکی یەکێتییەکانیش لەناو عەبابەیلێ بوو، مامۆستا فەتاح کە هەم زاوا و هەم پورزام بوو لەوێ بوو، دەرزییان لابوو، دەرزییەکیاندا لە ڕانم، الحمد الله دوای کەمتر لە سێ سەعات چاوم باش بوو.

دوای دوو ڕۆژ پیاوێک هات بۆ عەبابەیلێ بۆ لامان، وتی کاکە ڕۆژێک پێش کیمیاباران، بەهۆی تۆپبارانەکەوە کوڕێکم شەهید بووە، لە مزگەوتەکەی عەنەب کفنمان کردووە و لە تابوتەکایە بەڵکو هاوکاریم بکەن بیناژین، وتمان باشە بەسەرچاو، ئێمە میکزەمینییەکمان پێ بوو، لەگەڵی ڕۆیشتین یەک جەنازە لە عەنەب بنێژین، لە ڕێگادا بەرەو عەنەب لە نزیک بیاوێڵە ئەمبەروبەری ڕێگاکە پڕ بوو لە جەنازە، دابەزین هەرچی لەسەر ڕێگاکە بوو لاماندا، ڕۆیشتین سەیرمان کرد تەنها ئەم باوکە کە بەدیار جەنازەکەوە بوو دەرچووە، زۆر عەجیب بوو، هەر سەرئاوێکی مزگەوتەکەی عەنەب دوان سیانێکی تێدا بوو، حەوزی دەستنوێژ و حەوزی غوسڵەکە، ناو مزگەوت، پڕ بوون لە جەنازە، سەربانی مزگەوت،

پڕبوو، وتمان وەڵڵا کاکە ئێمە هیچمان پێ ناکرێ، لەبەرئەوە هاتینەوە. تومەز ئێوارەی ڕۆژی یەکەمی کیمیاباران هەرچی لە عەنەبەوە هەوڵی دەرچوونی داوە بەرکەوتووە، شەوەکەشی سەیارە تێپەڕی بوو بەسەریاندا و شێلابوونیان، جەنازەکان زۆر خراپ تێکچووبوون. ئەوەش بڵێم، کیمیایی هەر لەناو شار نەدابوو، فڕۆکەکان بەرزاییەکانیشیان بۆردومان کردبوو، چونکە ئەوان ئەیانزانی خەڵک بۆ بەرزاییەکان ئەڕۆن و لەوێوە هەوڵی دەرچوون ئەدەن، بۆیە فڕۆکەکان بەرزاییەکانی چواردەوری هەڵەبجەشیان بۆردومان کردبوو، بەوهۆیەوە خەڵکێکی زۆریش کە بۆ خۆ ڕزگارکردن پەنایان بۆ بەرزاییەکان بردبوو لەوێ پێوەببوون.

ئێمە کە ڕەوشەکەمان بەوشێوەیە بینی هیچمان پێنەکرا، هەواڵمان نارد بۆ سەرکردایەتی بۆ مامۆستا مەلا عوسمان لە سنە، حاڵەتێکی وا هەیە و خەڵکێکی زۆر شەهید بووە، ئێمە چ ئەرکێکمان لەسەرە، مامۆستا لەبری ئەوەی وەڵامان بداتەوە کۆمەڵێک خەڵکی نارد بۆ هاوکاریمان، ئەوانیش بریتی بوون لە مامۆستا شێخ صدیق و مامۆستا مەلا مەحمودی ئازادی و خەڵکێک کە مابوون لە ئیعلامی بۆ تەصویرکردن و ئەو پێشمەرگانەشی کە نەهاتبوون و هەرلەوێ مابوونەوە، ئێمەش یەک دوو مەفرەزەمان دروستکرد، لەگەڵ مەجموعەیەک پۆلیس کە پاسەوانی بانقەکە بوون و ئێرانییەکان گرتبوونیان، ئەو فەقیرانەش کیمیاوی لێیدابوون و بارودۆخیان زۆر خراپ بوو.

ئاغای مەسعودیش کە بەرپرسێکی ئێرانی بوو، بنکەکەی لە عەبابەیلێ بوو، پیاوێکی چوارشانە بوو، دوو مەسعودی بنکەکەی لەوێ بوو، بەڵام موحسینی پیاوێکی کەڵەگەتی زۆر قەبە بوو، واوەیلا بیزانیایە پاسدارێک لە دوکانێک شتێک دەخوات یان دەیبا، ڕۆژانە هێزە کوردییەکان لەگەڵ ئەواندا دەڕۆیشتین بۆ ناو شار، بۆ ئەو ئیشوکارانە غورفەیەکی عەمەلیات لەوان و هێزە کوردییەکان تەشکیل کرابوو. قەرارگاکەی ناوشار لە خانووەکەی ئەحمەدی قەتە بوو لای صەناعەکە، لە ڕێگەی تەربیەی ئێستا، ئەگەر کورد یان فارسی یان هەرکەسێکی بگرتایە کە شتی پێبوایە ئەو ئیجرائاتی لەگەڵ ئەکرد، ڕۆژانە خەڵکانێک دەگیران لە ماڵەکاندا کە خەریکی کەلوپەل بوون و ئەیانبردن، ئەگەر ئێمە یان سۆشیالیست یان یەکێتی بماننناسینایە ئەمانگووت کاکە ئەوە ماڵی خۆیەتی و ئەوانیش بەریان ئەدان.

ئیدی ئێمە بەهاوکاری ئەو خەڵکەی کە مامۆستا مەلا عوسمان ناردنی بۆ هاوکاریمان، بەدرێژایی ئەو ماوە جەنازەمان کۆکردەوە، نزیکەی ٣٥ ڕۆژێکمان پێچوو، لەو ماوەدا جەنازیەکی زۆر کەسوکارەکەی دەهات دەیگووت کاکە ئەوە کەسوکارەکەم لەوێن، وەرن هاوکاریم بکەن بیانگوازینەوە یان بیانێژین، ئێمەش هاوکاریمان دەکردن و دەمانناشتن، ئەوانەشی کە کەسوکاریان نەدەهات، هەموویمان کۆدەکردەوە و لە چەند شوێنێکدا دەمانکردن بە ژێر خۆڵەوە.

وەک بەڵگەی ئەو ڕۆژگارەش، من وێنەی زۆرم لایە، وێنەی خۆمم لایە لەکاتی کیمیبارانەکەدا، وێنەی کەوتنەخوارەوەی فڕۆکەم لایە. تا ساڵی پار ئەو وێنانەم لەلای خۆم پاراستبوو، پار کۆمەڵێک وێنەم تەسلیمی ئارام شەمێرانی کرد ئیتر نازانم لە کتێبەکەیدا ئاماژەی بەناوی من کردووە یاخود نا.

لەو دیمەنانەی کە ئەو ڕۆژانە دیومن، وەستا مستەفام لە مزگەوتەکەی باوەکۆچەکدا بینی، مچەی خانەلییان پێ ئەگووت، وەستای تەختە و دار بوو، پیاوێکی زۆر بەڕێز و ئەوەبوو بوو لەلای ئێمە، خۆی لە ئەسڵدا پیاوێکی عەسەبی بوو، کیمیاویش لێی دابوو تەواو عەسەبی ببوو، ئاو دەهاتە خوارەوە بەدەموچاویدا، جنێوی ئەدا، پاسدارەکان گاڵتەیان پێ ئەکرد، هاتمە خوار بۆ بەردەم مزگەوتی باوەکۆچەک سەیرم کرد ئافرەتێک لەوێیە و پیاوی لەگەڵدا نییە، چوار منداڵی پێ بوو، دوانیان کوڕ و دوانیان کچ، چاویان لەدەست دابوو، کوێر ببوون، یەکێک لە کوڕەکان مێردمنداڵێک بوو تەمەنی لە دەوروبەری ١٣ ساڵیدا بوو، گوێی لە تەقەی پێی ئێمە بوو، بانگی کرد، وتی کاکە، وتم بەڵێ گیان، وتی تۆ چیت؟ تەبعەن ئەوە دیمەن و مەشهەدێکە هەرکاتێک دەیگێڕمەوە دڵم پڕ ئەبێ، چونکە ئەو کاتە بێ ئەناز دڵم پڕ بوو، وتم من پێشمەرگەم، وتی دەی توخوا ماچێکم بدەرێ، فەقیرە چاوی کوێر ببوو، ئەم گەنجە عاشقە ئاواتی ئەوەبوو ڕۆژێک پێشمەرگە ببینێ، وەڵڵا فیعلەن دەستم کردە ملی، گوێم نەدایە ئەوەی کەوا کیمیاوی لێی داوە، پڕ بەدڵ گوشیم بە خۆمەوە و باش ماچم کرد، دیمەنێکە هەرگیز لەبیرم ناچێ!! یانی ئەو گەنجانە کوێر ببوون، بەو کوێرییەی خۆی، گوێی لەوە نەبوو کە کوێرە، ئاواتی بوو ماچی پێشمەرگەیەک بکات. ئیدی ئێمە بەدرێژایی ئەو ماوەیە دیمەنی زۆرمان بینی.

### دوای کیمیاباران

لە کۆبوونەوەکەی خارگێلاندا کە لە نیوان ئێرانییەکان و نوێنەری حیزب و لایەنە کوردییەکاندا بەسترا بۆ چارەسەری هەندێک گرفت کە لە نێوان ئێرانییەکان و لایەنە کوردییەکاندا ڕۆژانە ڕووی دەدا من لەوێ بووم، بەڵام لە دەرەوە نەک لەناو کۆبوونەوەکە، کە هاتینەوە مامۆستا مەلا عەلی کە نوێنەری بزووتنەوە بوو لە کۆبوونەوەکەدا وردەکارییەکەی گێڕایەوە.

من ناکرێ بڵێم ئێران بەبێ هۆکار لە ڕێکەوتنەکەی لەگەڵ لایەنە کوردییەکان پەشیمان بووەتەوە، ئیحتماله وەکو ئێوە دەیڵێن دەیتوانی هێرشەکە بکات، چونکە هێزەکانی پێشمەرگە تەنها هاوکاری سوپای ئێران بوون لە شەڕی سووکدا، ئەگەرنا تەیارە و مەدفەعی و پێویستی تەداویی و تەداروکات و ئەوانە لای ئەوان بوو، زۆرە لە مەنتیقەی باڵامبۆ خواردنت بە گەرمی بۆ بێت، خواردن و کەمپوتت بۆ بێ، شپرزەیی ناو هێزەکانی پێشمەرگە بۆخۆیان، کە هەرکەس دەیویست خۆی باڵادەست بێ، ئێمە دەمانگووت

هەڵەبجە لەسەر ئیسلامییەکان مەحسوبە، نابێ پاشکۆ بین، فیعلەن قبوڵمان نەئەکرد پاشکۆ بین، یەکێتی خۆی وا دادەنا، لە مەنتیقەی سورێن و ئەوانە سۆشیالیست خۆی پێ شت بوو، لە هەوارمان و مڵەخورد و ئەو ناوچەیە، پارتی پێی وابوو ئەو شتە، بەداخەوە هەندێک پێشمەرگەی نا ئەهل و نامەسئول، بۆ بەرژەوەندی خۆی، بەتایبەتی من دەمەوێ ئەمە بڵێم، هەندێ لە هێزەکان پێشمەرگەیان هێنابوو خەڵکی سنوورەکە نەبوون، نە بە تەنگ فەوتانی خەڵکەکەوە بوون، نە بەتەنگ سەروەت و سامانی خەڵکەکەوە، دزیی و ڕاوڕووت و جەردەیی لەنێو ماڵ و سەروەت و سامانی خەڵکەکە ڕووی دەدا. ئێرانییەکان هەندێ جار پێشمەرگەیان نارەحەت دەکرد، بەڵام واوەیلا بۆ پاسدارێکیش کە تاک و جیاببوایەتەوە، لە کۆڵانێ لە کۆلانەکاندا لەوانەیە ڕووت بکرایەتەوە. ئەنواع شت لەناو هێزی پێشمەرگەدا هەبوو. من لە خزمەت مامۆستا مەلا عەلیدا بووم لە عەبابەیلێ، چەند جارێک ئێرانییەکان هاتن وتیان وەرن با هەڵەبجە بدەینە دەست ئێوە، مامۆستا مەلا عەلی وتی من هەڵەبجەیەکی وێرانم بۆچییە، مەسئولیەتەکەی بخەمە سەرشانی خۆم.

دیارە لە ئێرانییەکانیش، هەندێ خەڵکی نامەسئولیان بەشداربوون، بەناوی ئەوەی کە ئەو کەلوپەلانە کۆدەکەنەوە و دواتر دەیدەینەوە بە خاوەنەکانیان، هەندێک شت کۆکرایەوە، دواتر لە پاوە و ئەو ناوچانە ئەگەر خاوەنی بۆ پەیدا ببوایە دەیاندایەوە، دیارە لە پاڵ ئەوانەشدا شت کراوە.





پ.د. یادگار لەتیف شارەزووری
زانکۆی سەلاحەدین – هەولێر

# کراوەیی بیر – (ابن تیمیە) لە نێوان ئەوسا و ئێستادا

یەکێك لەو زانایانەی کە گرنگی تەواوی بە عەقڵ و عەقڵخوازی داوە، زانا و نوێکاری سەردەمی خۆی و پێشەنگی مسوڵمانان لە سەدەکانی ناوەڕاست و نوێکەرەوەی بیری ئیسلامیی (ابن تیمیە)ـیە کە لەلای هەندێك کەس بە سەرچاوەی بیری توندڕەوی ناسێنراوە. بەپێچەوانەی ئەم جۆرە لە تێڕوانین و هەڵسەنگاندنە ئامادەیە؛ (ابن تیمیة) یەکێکە لەو زانایانەی لە ڕوانگەیەکی زۆر فراوانەوە تەماشای بابەتە هەستیارەکانی وەك باوەڕ و بێباوەڕی کردووە، یەکێکە لەو زانایانەی بە سنگ فراوانی و یەکتر خوێندنەوە تایبەتمەندن، ناوی زاناکان بەڕێزەوە دەهێنن با ڕێگاکانی ئیجتیهاد و شێوازی چارەسەرکردنی کێشەکانی سەردەمی خۆیان جیاواز بووبووبێت، بەپێچەوانەی کەسانی لاساییکەرەوە (المقلدون) کە بە هەموو جیاوازییەکی بیروڕا قەڵس دەبن.

**(١) زیندوویی بیر:**

(ابن تیمیة) لە کتێبی (بەرگرتن لە نایەکانگیری عەقڵ و نەقل - درء تعارض العقل والنقل)دا زۆر بەڕێز و شکۆوە باسی کۆمەڵە زانایەکی گەورەی وەک:( الشافعي و أبو الحسن الأشعري والرازي والآمدي وأبو حنيفه) دەکات و بە بەڕێزەکان (الفضلاء) ناویان دێنێت و زاراوە باوەکانی وەک (القديم والحادث والصانع) کە لە سەردەمی خۆیدا بەکارهاتوون، بەکاردەهێنێت(١/ ١٦٠).

(ابن تیمیة) لەم چەند ساڵەی دواییدا بووەتە مایەی گرنگی پێدانی زانکۆ ڕۆژئاواییەکانی وەک: (Georgetown University) و (Indiana University) و (کتێبخانەی (Cornell University) و (Nottingham university) و (Stanford University).

زۆر بیریاری ڕۆژئاوایی وەک ڕۆژهەڵاتناسی فەڕەنسی (ئۆغی لاووست) خاوەن کتێبی (نظريات شيخ الإسلام ابن تيمية في السياسة وعلم الاجتماع) و خانمە ڕۆژهەڵاتناسی ئەڵمانی (کۆج گولان Koj Glenn) کاری زانستی وردیان لەسەر هزری کردووە. لە ناوەندەکانی توێژینەوەی زانکۆ گەورەکانی ڕۆژئاواش گرنگی بە بیر و هزری (ابن تيمية) دراوە، وەک چۆن ئەم گرنگی پێدانە لەلای (د.جان هوڤەر John Hoover) - خاوەنی کتێبی (ابن تيمية وعصره) لە زانکۆی نۆتنگهام و لەلای هەردوو نووسەری کتێبی (ابن تيمية وعصره Ibn Taymiyya and his times)؛ (یوسف ربوبورت) مامۆستا لە (Queen Marine University) و (شهاب أحمد) مامۆستا لە (Harvard university) دەبینین. هەموو ئەم توێژەرانە کاریان لەسەر گرنگی بیری (ابن تيمية) کردووە بۆ سەردەمی خۆی و بۆ سەردەمی ئێستاشمان، ئاماژەشیان بەوە کردووە کە بیری (ابن تیمیه) پشتی بەگرێدانی عەقڵ و نەقڵ پێکەوە بەستووە، ئەمەش وایلێکردووە خاوەن بیرکردنەوەیەکی پراگماتیکی فیقهی بێت.

(Dr Jon Hoover - «God›s relation to body and space in the theology of Ibn Taymiyyah»
https://m.youtube.com/watch?feature=youtu.be&v=rUVPqePz_wQ
https://youtu.be/fIKPA5hdupM. و) . ( https://www.worldcat.org/.../ibn-taymiyya.../oclc/837548712) https://youtu.be/_EQOEOkdWZg
https://www.google.com.tr/url?sa=t&source=web&rct=j&url=https://searchworks.stanford.edu/view/2785007&ved=2ahUKEwiZotSD3_7gAhWS16YKHSMSAVw4ChAWMAZ6BAgGEAE&usg=AOvVaw0BuIZDXoYxbwqkEoxHffOY) و (https://onlinelibrary.wiley.com/doi/full/10.1111/muwo.12228). و (https://youtu.be/iRgm85xQhNI) .

سەرچاوەی ئەم گرنگیپێدانەیان بۆ گرنگیپێدانی (ابن تیمیه)ییە بە عەقڵ و بیرکردنەوەی




زانستیانە لە سەردەمێکی زۆر هەستیاردا؛ لە مێژوویەکی پڕ ئاشووب لەسەر ئاستی هەموو جیهانی ئەو کاتە. ڕووبەڕووبوونەوەی چەقبەستوویی و شوێنکەوتنی کوێرانە و چاولێکەریی لە هەرە تایبەتمەندییەکانی بیری (ابن تیمیە)یە. لە کتێبی (درء تعارض العقل والنقل)دا دەڵێت: ئەوەی بە عەقڵی ڕاشکاو زانرابێت، ڕێی تێناچێت ڕاستییەکی مەنقول پێچەوانەی بێت، لە هەموو ئەو شتانەی کە خەڵکی لەسەری ناکۆکن کۆڵیمەوە، بینیم ئەوەی پێچەوانەی دەقە ڕاستەکانە کۆمەڵە گومانێکی پووچن بە عەقڵ دەزانرێت کە نارەوان، بەڵکو بەهۆی عەقڵەوە دەزانرێت کە پێچەوانە هاوتەریبییەکەی شەرع ڕاستە. تێڕامانم کردووە دەربارەی هەموو بابەتە گەورەکانی وەک یەکتاپەرستی و سیفاتەکانی خودا و بابەتی قەزاوقەدەر و پێغەمبەرایەتی و زیندوو کردنەوە و ئەوانی دیکە. بۆم دەرکەوت ئەوەی بە عەقڵی ڕاشکاو پێمان دەگات، هەرگیز بیستن پێچەوانەی نییە، بەڵکو ئەوەی دەوترێت پێچەوانەی عەقڵە یان فەرموودەیەکی هەڵبەستراوە یان بەڵگەیەکی هەڵەیە، دەستنادات ببێتە بەڵگە گەر هاتوو هاوتەریبی عەقڵی ڕاشکاو نەبێت، ئەی ئەگەر ڕاشکاوی بەجێ (معقول) پێچەوانەی بێت.

> **(ابن تیمیە) بە بەڵگەی عەقڵی ڕوون سەلماندی کە ئەو بابەتانەی مسوڵمان لەسەری جیاوازن بەشێك نین لە بنەماکانی ئایین، بۆیە نابێت خاوەن بیر و بۆچوونە جیاوازەکانی لەسەر بە کافر دابنرێت.**

ئێمە دەزانین کە پێغەمبەران شتێک نا گەیەنن کە عەقڵ پێی ئەستەم بێت، بەڵکو هەواڵی ئەوە دەدەن کە عەقڵ پێی گونجاو بێت، شتێک ناڵێن کە عەقڵ لای ڕوون بێت وانییە، بەڵکو ئەوە دەڵێن کە عەقڵ بێ توانایە لە زانینی (درء تعارض العقل والنقل: ١/ ١٤١ و١٤٤ و ١٤٨ و ١٥٣ و ١٨٦).

لە کتێبی (منهاج السنة)شدا هەمان تێڕوانین دووپات دەکاتەوە و دەڵێت: هەر قسەیەک چەندێک لەڕووی شەرعەوە پووچ و خراپ بێت، لە عەقڵیشدا وایە، پێغەمبەران تەنیا عەقڵیان دواندووە، خوای گەورەش مرۆڤی لەسەر زانینی ڕاستی بەدیهێناوە، پێغەمبەران نێردراون بۆ تەواوکردنی فیترەت نەک بۆ گۆڕینی، خوای گەورە دەفەرمێت: **(سنريهم آياتنا في الآفاق وفي أنفسهم حتّى يتبيّن لهم أنّه الحق أَوَلم يكف بربّك أنّه على كلّ شيء شهيد)** فصلت:٥٣ (ئێمە لە ئایندەدا بەڵگە و نیشانەی سەرسوڕهێنەریان نیشان دەدەین لە ئاسۆکانی

بوونەوەردا و لە خودی خۆشیاندا، ئەمەش بۆ ئەوەی تا چاک بۆیان دەرکەوێت ئەم قورئانە پیرۆزە حەقە و لەلای خوای گەورەوە هاتووە، ئایا شایەتی پەروەردگارت بەس نییە کە بێگومان ئاگا و زانایە بە هەموو شتێک؟!).

خودای گەورە پێمان دەڵێت ئێمە بەڵگە گەردوونی و دەروونییە ڕوونەکانیان پیشان دەدەین، بەمەش هەردوو بەڵگە هێنانەوەی قورئانی و بینراویی وەکویەک دەبن، هەردوو بەڵگەداری شەرعی وەرگیراو و بینینی بەجێ ڕاست دەردەچن»(منهاج السنة النبوية: ٨٢). لە کتێبی (الرد على المنطقيين)یشدا، گرنگی پایەی عەقڵ دەچەسپێنت و بەپێوەرێکی سەرەکی قورئانی پیرۆزی دادەنێت، ئەوە دووپات دەکاتەوە کە ترازووی عەقڵی ڕاست و دروستە، خوای گەورە لە قورئاندا باسی کردووە(الرد على المنطقيين: ٤٢٨).

**٢- چەمکی باش دانان و خراپ دانانی عەقڵی**

زۆرکەس پێیانوایە تەنیا موعتەزیلەکان باوەڕیان بە چەمکی باش دانان و خراپ دانانی عەقڵی هەبووە، (ابن تەیمیە) دەڵێت هەموو ڕێبازەکانی ئومەتی ئیسلام پێیانوایە کە باشە و خراپە بە عەقڵ هەستی پێدەکرێت:»زۆربەی ڕێبازەکان باوەڕیان بە چەسپاندنی چاکە و خراپەی عەقڵی هەیە.. زانایانی حەنەفیی لەسەر هەمان ڕێچکەن، ئەمە قسەی زۆربەی زانایانی سەر بە ڕێبازی مالیکیی و شافیعی و حەنبەلییە، هەروەها ئەهلی فەرموودەش، بەڵکو ئەوەیان وتووە کە بەرپەرچدانەوەی ئەمە یەکێکە لەو بیدعانەی کە لە ئیسلامدا ڕوویداوە، ئەوەشیان وتووە: بەرپەرچدانەوەی چاکە و خراپەی عەقڵی بەشێوەیەکی ڕەها هیچ یەک لە پێشین و زانایانی پێشین نەیانگووتووە، بەڵکو بەپێچەوانەوە لە شیکارکردنیان بۆ حوکمەکانی خودای گەورە و ڕوونکردنەوەی حیکمەتی لە بەدیهێناندا و لە ڕوونکردنەوەی فەرمانەکانیدا کە بە عەقڵ دەزانرێت باشە و لە ڕێگرییەکانی کە بە عەقڵ دەزانرێت خراپە، ئەوەمان بۆ ڕوون دەبێتەوە کە دژی نەبوون.

چاکە و خراپە لە کردەوەی بەندەکان بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە چاکەی کردەوەکان بۆ خۆیانە و خراپەکانیشی بەسەر خۆیاندا دەشکێتەوە، بێگومان ئەمەش بە عەقڵ دەزانرێت. بۆیە تایبەتمەندترین تایبەتمەندی عەقڵ لەلای مرۆڤ زانینی چاکەیە و بیکات، زانینی خراپەیە و لێی دوورکەوێتەوە، مەبەستیش لە چاکە - پەسەندی (الحسن) بەسوودە، مەبەستیش لە خراپە - ناپەسەندی (القبح) زەرەرمەندە، ئیتر چۆن دەوترێت عەقڵی مرۆڤ چاکە و خراپە لە یەک جیاناکاتەوە؟ ... «. (کتاب الرد على المنطقيين، ابن تيميه: ٤٢٠- ٤٣٣) و بڕوانە (شيخ الإسلام ابن تيمية وجهوده في تفسير القرآن الكريم تطبيقا على آيات السنن الربانية: ١٥). بەو واتایەی باوەڕنەبوون بەوەی کە عەقڵ پەی بە باشە و خراپەی شتەکان نابات، بیدعەیەکە هاتووە بەسەر ئومەتی ئیسلامدا و هیچ پەیوەندییەکی بە ئیسلامەوە نییە. پاشان ئیبن تەیمیە دەڵێت:»هەرچی عەقڵە، ئەوا تایبەتترین تایبەتمەندی مرۆڤە «(کتاب مقام العقل ١١٧).

بۆ جیاکردنەوەی بابەتی ڕەخنەی زانستی لە شتی نازانستی دەڵێت: لەبەرئەوەی عەقڵەکان یەک شت نین تا بتوانێت خۆی خۆی ڕوونبکاتەوە گەر ڕەخنەیەک گیرا لە هەندێک بابەتی عەقڵی، ئەوا ئەمە ڕەخنە نییە لە هەموو بواری عەقڵ (العقليات)، هەروەها گەر ڕەخنەیەکیش گیرا لە هەندێک بابەتی گێڕانەوە، ئەوا ئەمە ڕەخنە نییە لە هەموو گێڕانەوە (السمعيات)، وەک چۆن دروستی هەندێک بابەتی عەقڵی، ڕاستی هەموو بابەتەکانی ناگەیەنێت، بە هەمان شێوەش دروستی هەندێک بابەتی گێڕانەوە هەموو بوارەکە ناگرێتەوە. بەڵگە عەقڵییە دروستەکان، ئەوانەی هیچ گومانی نا دروستیان لەسەر نییە، هاوتایە لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە، نەمبینی هیچ زانایەکی بواری عەقڵخوازی بەڵگەیەک بهێنێتەوە دەربارەی بابەتێکی دیاریکراو، پێچەوانە بێت لەگەڵ ئەوەی پێغەمبەران هێناویانە، بەڵکو یەکانگیرە لەگەڵیاندا، تەنانەت لەلای ئەو فەیلەسووفانەشی کە دەیانووت جیهان کۆنە، وەک ئەرستۆ و شوێنکەوتووانی (درء تعارض العقل والنقل: ١/ ١٥٥ و ١٧٨ و ١٨٥).

عەقڵخوازی ئیسلامی نکۆڵی ناکات لە زانینی چاکە و خراپە بە عەقڵ، بەڵام بە هەمان شێوە دەگەڕێتەوە بۆ شەرع بۆ دیاریکردنی ئەم بە چاکە دانانە و بە خراپە دانانە، بۆئەوەی عەقڵخوازییەکی ئیماندارانە بێت، لەسەر هەردوو بنەمای (شەرع) و (عەقڵ) دابمەزرێت، وەک چۆن هەردەم ئەمە سروشتی بووە (مقام العقل فی الاسلام: ٤٧).

### ٣- تێڕوانینی (ابن تيميه) بۆ تەکفیر:

سەبارەت بە تەکفیر و بەو بابەتانەی پاشتر جیاوازی لەسەر دروست بوو لە عیلمی کەلامدا وەک قسەکردن لەسەر ناچارکردن (جەبر) و هەڵبژاردن و لێکچواندن (تشبیه) و پاکڕاگرتن (تنزیه) و ئایا پەروەردگارمان لە هەموو شوێنێکدایە یان تەنیا لە شوێنێکدا؛ (ابن تەیمیە) پێیوایە کە ئەمانە بەشێک نین لە بنەمای ئایین، بۆیە بە مەرجێک لە مەرجەکانی دروستی ئیسلام هەژمار ناکرێن، گەر مەرج بوایە لە مەرجەکانی دروستی ئیسلام، ئەوا پێغەمبەر د.خ بۆ هاوەڵەکانی ڕوون دەکردەوە و فێری دەکردن، هیچ شتێک لەمبارەوە ڕووینەداوە و هیچ قسەیەکیش لەسەر ئەم بابەتە نەکراوە لە سەردەمی تابیعییەکاندا.

(ابن تەیمیە) بە ئاماژە بۆ کردن بۆ (أبو الحسن الأشعري) بەڕاشکاوی دەڵێت: «هیچ کەس لە ئەهلی قیبلە بە کافر دانانێین، بۆ بەڵگەش لەسەر ئەمە دەڵێین: ئەو بابەتانەی کە ئەهلی قیبلە جیاواز بوون لەسەری لەم نمونانەیە: ئایا خودای گەورە زانایە بە زانست یان بە خود؟، ئایا خودای گەورە بەدیهێنەری کردەوەی بەندەکانە یاخو نا؟، ئایا ئەو شوێنێکی گرتووە؟ ئایا لە شوێنێکی ڕووتێکراوە؟ ئایا بینراوە یاخود نا؟. ئەم – بابەتانە – لەمە بەدەر نییە: ئایا ڕاستی و دروستی ئایین لەسەر ئەمانە ڕاوەستاوە یاخو نا؟ یەکەمیان پوچە و وانییە، چونکە گەر زانینی ئەم بنەمایانە بەشێک بوونایە لە ئایین، ئەوا پێویست دەبوو لەسەر پێغەمبەر (د.خ) داوای ئەم بابەتانەی لێبکردنایە، بکۆڵیایەتەوە لە چۆنیەتی باوەڕبوون پێیان، کە داوای ئەم بابەتانەی لێنەکردن، بەڵکو لە سەردەمی ئەمدا (د.خ) و

لەسەردەمی هاوەڵانی و تابیعیندا (خ.ر) قسە لەسەر ئەم جۆرە بابەتانە نەهاتە ئاراوە. زانیمان کە ڕاستی و دروستی ئیسلام لەسەر ئەم بابەتانە ڕانەوەستاوە، گەر ئەمە وابێت، هەڵەکردن لەم بابەتانەدا هەڵەکردن نییە لەسەر ڕاستێتی ئیسلام، ئەمەش ئەوە دەخوازێت کە دەستبهەڵبگیرێت لە بە کافرکردنی ئەهلی قیبلە، سەرەڕای بوونی جیاوازی دەربارەی ئەم بابەتانە» (درء تعارض العقل والنقل: ١/ ١٥٨).

پاش ئەوەی (ابن تیمیە) بە بەڵگەی عەقڵی ڕوون سەلماندی کە ئەو بابەتانەی مسوڵمان لەسەری جیاوازن بەشێک نین لە بنەماکانی ئایین، بۆیە نابێت خاوەن بیر و بۆچوونە جیاوازەکانی لەسەر بە کافر دابنرێت، بابەتی کافربوون باشتر ڕوون دەکاتەوە و دەڵێت: کافربوون؛ بە درۆزانینی ئەوەی پێغەمبەر هێناویەتی دەبێت، یاخود بەشوێن نەکەوتنی لەگەڵ ئەوەی بزانیت ڕاستگۆیە. بۆ باشتر ڕوونکردنەوەی ئەم بابەتە هەستیارە و وەک ئەوەی بڵێت ئەم تێڕوانینە تێڕوانینی ئەهلی سوونتە و جەماعەیە دەڵێت: ئیمامی شافیعی وتوویەتی: شەهادەتی هیچ کەس بەرپەرچ نادەمەوە، تەنیا شەهادەتی پێڕی (الخطابیة) نەبێت، چونکە ئەمانە دەستەیەکن لە (شیعە پەڕگیرەکان) درۆکردن بە حەڵاڵ دەزانن. لە (أبو حنیفة)شەوە گێڕدراوەتەوە کە هیچ کەسێکی ئەهلی قیبلەی بە کافر دانەناوە. (درء تعارض العقل والنقل: ١/ ١٥٧ – ١٥٨) و بڕوانە: (شیخ الإسلام ابن تیمیة وجهوده في تفسیر القرآن الکریم تطبیقا علی آیات السنن الربانیة: ١٦).

زانایەکی هاوچەرخی وەک (د.مصطفی زەڵمی) لەبارەی کراوەیی بیری (ابن تیمیە) ییەوە دەڵێت: «زانایاکی زۆر پێشکەوتووی عەقڵکراوە بوو، لەگەڵ قوتابییەکەیدا (ابن القیم) هەندێک شتیان خستووتە ناو مەزهەبی حەنبەلییەوە، کە ئەمڕۆ مسوڵمانەکان زۆر سودی لێوەردەگرن، وەک ئەوەی تەڵاقی سێ بەسێ یەک تەڵاقی پێ دەکەوێت، هەر تەڵاقێک تعلیق بکرێت بە شتێکەوە ناکەوێت، یان سوێند خواردن بە تەڵاق ئەویش تەڵاقی پێناکەوێت، چونکە سوێند خواردن بە غەیری خوا و سیفەتەکانی بە تاڵە. شایانی باسە تەعلیقی تەڵاق و سوێندخواردن بە تەڵاق لە ئیسلامدا نییە، نە لە سەردەمی پێغەمبەردا (د.خ) هەبووە نە لە سەردەمی (خلفاء الراشدین)دا، بەڵکو ئومەوییەکان ئەم دوو جۆرە تەڵاقەیان خستە ناو ئایینی ئیسلامەوە، کاتێک عەلەوییەکان بەربەرەکانیان دەکرد لەگەڵ ئومەوییەکان لەسەر خەلافەتی ئیسلامی، ئومەوییەکان گومانیان لە هەر کەسێک ببوایە کە لەگەڵ عەلەوییەکان بێت لە دژی ئەوان سوێندیان ئەدا بە قورئان، دوایی بۆیان دەرکەوت کە سوێند خۆرە عەلەوییەکە لە دژی ئەوان دەجوڵێتەوە سوێندەکەی بە درۆوە خواردووە، لەبەرئەوە وازیان هێنا لە سوێنددان بە قورئان گۆڕییان بە سوێنددان بە تەڵاق بۆئەوەی ئەو کەسەی بە درۆزن دەرچوو لە دوایدا ژنەکەی لێ بسێننەوە و نەهێڵن بڕواتە لای، بەم جۆرە بۆ یەکەمجار لە ئیسلامدا سوێند خواردن بە تەڵاق پەیدا بوو» (کاروانی ژیانم: ٤٠٢ – ٤٠٣).



نووسینی: محەمەد ڕەئوف

# الامر بامعروف والنهی عن المنكر المفهوم والممارسة

سەرەتا لە ڕیشەی (معروف و منکر)ەوە دەست پێدەکەین کە لە کوێوە و لە کەیەوە هاتووە و دەستی پێکردووە؟ ڕیشەکەی دەگەڕێتەوە بۆ دوو سەرچاوەی سەرەکی و بەردەوام لە نوێبوونەوە و پەرەسەندندا بووە و هەتاوەکو ژیانیش بەردەوام بێت، ئەویش بەردەوام نوێ دەبێتەوە.

سەرچاوەی یەکەم: ئاینە، هەر لە ئادەمەوە علیه السلام هەتاوەکو خاتەم ئاینەکان یەک لەدوای یەک لە پەرەسەندنێکی بەردەوامدابوون و یەکێک لە بابەت و پرنسیپ و بەها باڵاکانیش بریتی بووە لە هاندان و بەرچاوڕوونی لەسەر (معروف و منکر).

سەرچاوەی دووەم: فیترەتی مرۆڤە، ئەو فیترەتەی خوای گەورە مرۆڤی لەسەر دروستکردووە ((فطرة الله التی فطر الناس علیها))، فیترەتیش خوڕسکانە لەگەڵ مرۆڤدا شێلراوە و مرۆڤ بە پاکی لەدایک دەبێت، بۆیە سەروەر (د.خ) دەفەرموێت:(کل مولود یولد علی الفطرة)

هەر لەبەر ئەم دوو هوكار و سەرچاوە بنەڕەتیەیە زانایان پێناسەی (معروف و منكر) دەكەن و دەڵێن: (معروف) بریتییە لە هەركار و ئاكارێک بەجوان و باش و بەكەڵک بناسرێت و خێری مروڤ و ژیانی تێدابێت و دڵنیایی ببەخشێت. (منكر)یش بریتییە لە هەر كار و ئاكار و ڕەفتارێک كە پێچەوانەی شەرع بێت یان شەرع پەسەندی نەكات، یان پێچەوانەی بەرژەوەندییەكانی ژیانی مروڤ بێت. لێرەدا ڕاغب دەڵێت: (معروف) ناوە بو هەركارێک بە عەقڵ یان بە شەرع بە باش ناسرا بێت، و (منكر)یش ناوە بو هەر كارێک بە عەقڵ یان بە شەرع بە خراپ و ناپەسەند ناسرابێت یان بناسرێت.

## پێگەی ئەم بابەتە لای زانایان

لەبەرئەوەی بابەتی (أمر بە معروف و نهی لە منكر) لە قورئان و سوننە و سیرەدا زور بە گرنگ گیراوە و زور دووبارە بووەتەوە و پانتاییەكی زوری پێدراوە و شێلراوە بە ئیمان و نوێژ و شەعیرەكانی دیكەوە و بە شێوازی جیاجیاش لە سەدان جێگای قورئاندا باسیان كراوە، لەبەرئەوە زانایانی تەفسیر و عەقیدە و فیكری ئیسلامی پێی دەڵێن: شعیرة، فریضة، و هەندێكیشیان وەک پایەی شەشەمی ئیسلام باسی دەكەن. لەبەرئەوەی (شعیرة یان فریضة)یە، پێویستە مسوڵمان حوكمی كارپێكردن و جێبەجێكردنی بزانێت، زانایان كودەنگ نین لەسەر حوكمی شەرعی كارپێكردنی و ڕای جیاوازیان هەیە لەوبارەیەوە، زورینە دەڵێن: فەرزی كیفایەیە. كەمینە ئەڵێن: فەرزی عەینە هەندێكیش دەڵێن: لە هەندێک حاڵەت و هەڵوێستدا دەبێتە فەرزی عەین، هوكاری نەبوونی كودەنگییەكە چییە؟

دوو هوكاری سەرەكی هەیە كە ئەمانەن:

یەكەم: دەقەكانی قورئان و فەرموودەكانی پێشەوا، ئەو دەقانە تەئویل و ڕاڤەی جیاوازی بو كراوە.

دووەم: ئەم فەریزەیە بە(أمە)تێكی تایبەت دەكرێت كە خاوەنی تایبەتمەندی بن وەک (زانست، تقوی، حیكمەت، حیلم و صبر، زانیاری، وردەكاری، ئازایەتی، فیقە و تێگەیشتن، عەقڵ و ڕوشد.... ئەم پێداویستییانەش لە كەسێكدا كونابنەوە، بویە ئەوانەی كە بانگخوازن ئەركیان زور قورس و گرانە و هەمیشە دوو ئایەت دەیانترسێنێت:-(فاستقم كما أمرت) و ئایەتی (لم تقولون مالا تفعلون).

## خوێندنەوەیەک بو دەقەكان

١-دەقەكان دەكرێن بە سێ بەشەوە:-

بەشی یەكەم/ لە (الامر بامعروف والنهی عن المنكر) پێكەوە هاتووە.

بەشی دووەم/ لە (المعروف) یان (معروف) بەتەنها هاتووە، ئەمجورە زورترینەیە لە قورئاندا.

بەشی سێیەم / لە (المنكر) یان (منكر) بەتەنها هاتووە.

٢- دەقە قورئانییەكان لە هەردوو جوری مەككی و مەدەنین.

٣- دەقە قورئانییەکان بە سێ صیغە دابەزیون:-

أ. صیغەی خبر وەک ئایەتی (٦٧ی التوبە) **(الْمُنَافِقُونَ والْمُنَافِقَاتُ بَعْضُهُم مِّن بَعْضٍ يَأْمُرُونَ بِالْمُنكروينْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ ويَقْبِضضونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ)**

ب. صیغەی وەصف وەک ئایەتی(١١٠ی ال عمران) **(كُنتُمْ خَيْرَأُمَّةٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وتَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكروتُومِنُونَ بِاللَّهِ ولوْ امَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لكانَ خَيْرًا لَّهُم مِّنْهُمُ الْمُومِنُونَ وأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ)**

ج. صیغەی أمر وەک ئایەتی (١٠٤ی ال عمران و ١٧ی لقمان)

**(ولْتَكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَي الْخَيْرِويأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وينْهَوْنَ عَنِ الْمُنكروأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)**١٧ لقمان**(يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وأْمُرْبِالْمَعْرُوفِ وانْهَ عَنِ الْمُنكرواصْبِرْعَلَيٰ مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذذلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ)**

ڕاڤە و تفسیری دەقەکان بەپێی ئایەت و بەپێی سیاقات: پێمباشە سەرنجی خوێنەر ڕابکێشم بو چەند ئاماژەیەک وەک سەردێڕ و تایتڵ و متن:

یەکەم/ تەنها (١٠) ئایەت لە قورئاندا بە(الامر بامعروف والنهی عن المنكر) پێکەوە هاتووە، لەو (١٠) ئایەتە تەنها ٣ سێ ئایەتیان مەکییە و ٧ حەوت ئایەتەکەی دیکە مەدەنین، ئەو ٣ سێ ئایەتە مەککیە بریتین لە (١٥٧و١٩٩ ی الاعراف، ١٧ی لقمان) و ٧ حەوت ئایەتە مەدەنییەکەش بریتین لە (١٠٤ و ١١٠ و ١١٤ی ال عمران،٦٧ و ٧١ و ١١٢ی التوبە،٤١ی الحج) تێبینی ئایەتی ١٩٩ی الاعراف تەنها باسی العرف واتە المعروفە.

دووەم/ هوکاری سەرەکی کەمی ئایەتە مەکییەکان ئەگەڕێتەوە بوئەوەی کە قورئان لە قوناغی مەککەدا زیاتر بایەخ ئەدات بە عەقیدە و ئیمان و مەبادی و و صەبر و خوراگریی و دامەزراندنی ژێرخانی کەسایەتی تاکی ئیمانداری مەحکەم-توکمە- و خوڕاگر، لەبەرئەوە زور کەم باس لە معاملات و أحوال شەخصی و بابەتە گشتییەکانی ژیان ئەکات.

سێیەم/ ڕاڤە و تەفسیر بەپێی سیاق:

ئایەتی (١٥٧ الاعراف) خەبەرییە و مەککیە: ئاماژەیە بە داهێنانی یەکەم دەستەواژە و چەمکی قورئانی دەربارەی(الامر بامعروف والنهی عن المنكر) ، هەروەها باسی ئەهلی کیتابە کە هەر لە ئێستاوە خویان ئامادە بکەن کە قورئان و ئاخر پەیام و ئاخر تەشریع هاتووە و یەکێک لە پەیامەکانی بو ئەوانە و ڕزگاریان دەکات لەو گێژاوەی تێی کەوتوون، هەروەها ئاماژە بەوەی کە لە ئایندەدا دەچێتە مەدینە و لەوێوە حیوارەکە ڕووبەڕوو دەستپێدەکات. ئایەتی (١٩٩) الاعراف **(خُذذ الْعَفْووأْمُرْبِالْعُرْفِ وأَعْرض عَنِ الْجَاهِلِينَ)** ئەمرە و مەکییە، فەرمانی بە سێ پرنسیپ و بەهای گرینگ کردووە، کە برتییە لە دەرهێنانی سێ بەردی بنەڕەتی لە دیواری کومەڵگەی نەفامی و زوڵم و موجتەمەعی باو.

یەکەم: فەرمان دەکات بە پێغەمبەر بە (خذ العفو) واتە (بمكارم الاخلاق بالسهل و اليسير فی معاملة الناس و معاشرتهم).

دووەم: (وامر بالمعرف) واتە بالمعروف – هەموو کار و ئاکار و مامەڵەیەکی جوان و باش و پەسەندکراو.

سێیەم: (و اعرض عن الجاهلین) واتە (لا تقابل السفهاء بمثل سفهم بل احلم علیهم....)
ئەم سێ فەرمانە فەرمانی دامەزراندنی کەسایەتی نوێ و کومەڵگەی نوێ سیستەمی زیانێک نوێ پێکدەهێنن، فەرمانەکە ئاسمانییە و جێبەجێکارە کە مروڤ و نەتیجەکەش باسی مروڤ و شکوی مروڤ و پێگەی مروڤە لای پەروەردگار.
ئایەتی (١٧) لوقمان **(يَا بُنَيَّ أَقِمِ الصَّلَاةَ وأْمُرْ بِالْمَعْرُوفِ وانْهَ عَنِ الْمُنكروَاصْبِرْ عَلَيٰ مَا أَصَابَكَ إِنَّ ذٰلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ)** فەرمانە و ڕوو لە تاکە و مەککییە. ئەم ئایەتە سێ فەرمانی تێدایە، دوو شەعیرە کە نوێژ و ئەمر بە مەعروف و نەهی لە منکر و یەک ئەخلاق کە (صبر) ە، صەبریش بەهایەکی ئەخلاقی گەورە و بنەڕەتییە تەواوکەر و گرەنتی ئیمان و بەها باڵاکانی دیکەشە و لەهەمانکاتدا ئاماژەیە بەوەی کە نوێژ و ئەمر بە مەعروف و نەهی لە منکر بە صبر نەبێت بەردەوام نابێت، (ابن جریح) دەڵێت: ئەو فەرمانانەی پێشوو لە مکارم الاخلاقن و لە کارە هەرە گەورە گرینگەکانی ڕێبازی ڕێگای سەرفرازین.
تێبینی ئەم سێ ئایەتە مەککییە، دەبنە ڕابەر و پێشەکی مەبدەء بو قوناغی مەدینە و لەوێ صیغە و سیلقەکان بە شێوازێکی دیکە دادەبەزن و زوربەی بوار و لایەنە گرنگەکانی ژیان دەگرنەوە. ئایەتەکانی قوناغی مەدینە و ڕاڤە و تەفسیر بەپێی ئایەت و سیاق حەوت ئایەتن بەم شێوازەی خوارەوە:
ئایەتی (١٠٤) ال عمران **(ولْتكُن مِّنكُمْ أُمَّةٌ يَدْعُونَ إِلَي الْخَيْرِ ويَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ ويَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكروأُولَٰئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ)**، لێرەدا بارودوخ گوڕاوە، هەل و مەرج ڕەخساوە، کاتی ئەوە هاتووە کە ئەرک و کارەکان بەپێی پسپوڕی بێت، یان بە گرووپ و ڕاوێژی ناو گرووپ بێت، لە مەدینە سەرەتای دروستکردنی کومەڵگەیە، بو سەرەتای دروستکردنی دەوڵەت و دەسەڵات، بویە صیغەکە دەگوڕێت لە خەبەر و تاکەوە بو فەرمان و دەستە جەمعی و پسپوڕی، باسی بانگەوازە بو (خیر)، واتە خێری دنیا و دواڕوژ و یەکێک لە میکانیزم و بەها باڵاکانی ئەو بانگەوازەش بریتییە لە (الامر بالمعروف والنهی عن المکر) و کوتایەکەشی وەعدی خوای گەورەیە بە سەرکەوتن و ڕزگاربوون لە سەرگەردانی دونیا و ئاکامی خەتەرناکی دواڕوژ.
ئایەتی(١١٠) ال عمران **((كُنتُمْ خَيْرَ أُمَّهٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ تَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وتنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكر وتُومِنُونَ بِاللَّهِ ولَوْ امَنَ أَهْلُ الْكِتَابِ لَكانَ خَيْرًا لَّهم مِّنْهُمُ الْمُومِنُونَ وأَكْثَرُهُمُ الْفَاسِقُونَ))**، لێرەدا صیغەی ئایەتەکە و سیاقەکە گوڕانێکی بەرچاوی بەسەردا دێت و دوخەکە دەگوڕێت و پێشدەکەوێت، بویە (الخیر) لە ئایەتی پێشوودا لەبەرئەوەی بەردەوام بووە و جێگیر بووە و گوڕانکاری ڕیشەیی لە کومەڵگەی مەدینە و دەوروبەریدا ڕوویداوە، ئیتر صیغەکە دەبێتە (خیر أمه) و (ئوممەتەکەش صیفەتی خەیریەت وەردەگرێت) وەصفی زورینەی کومەڵگەکە دەکات و ئەرکەکەش دەبێتە ئەرکی گشتی بەردەوام و ئەمر بە مەعروف و نهی لە منکر دەکەوێتە نێوان **(خَيْرَ أُمَّهٍ أُخْرِجَتْ لِلنَّاسِ و.... وتُومِنُونَ بِاللَّهِ)**.

تێبینی: جگە لەو گەشە کردن و پەرەسەندن و گوڕانکارییە ناوخۆییە، ئایەتەکە ئامانجە گەورەکە زەق دەکاتەوە کە بریتییە لە(أخرجت للناس)، واتە دەبێت خەیرییەتی ئەم ئوممەتە بۆ هەموو خەڵک بێت بۆ ئەوەی ببێتە (رحمة للعالمین)، بەم پێودانگ و سیاقە قورئانییە پێویستە بانگەواز و خەمی معروف و منکر و خەمی دونیا و دوا ڕۆژی خەڵک دەبێت ڕوو لە خەڵک و بۆ خەڵک و لەناو خەڵک بێت، نابێت مسوڵمانان بە هیچ پاساوێک و بە هیچ بیانوویەک لە خەڵک دابڕێن و أمر بە معروف و نهی لە منکر یان پڕۆژەکانی خەیرییەت و عەدالەت و چاکسازی تەنها لەناو خۆیان و بە قسە بێت لەناو ماڵە داخراوەکان و کۆبوونەوە داخراوەکان و میکانیزمە داخراوەکاندا.

ئایەتی(١١٣) ال عمران ((**لَيْسُوا سَوَاءً مِّنْ أَهْلِ الْكِتَابِ أُمَّةٌ قَائِمَةٌ يَتْلُونَ آيَاتِ اللَّهِ آنَاءَ اللَّيْلِ وَهُمْ يَسْجُدُونَ**)) (١١٤) **يُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِوَيَأْمُرُونَ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَوْنَ عَنِ الْمُنكرِوَيُسَارِعُونَ فِي الْخَيْرَاتِ وَأُولَٰئِكَ مِنَ الصَّالِحِينَ**))

لەم ئایەتە پیرۆزەدا دەرەنجامی ئایەتی یەکەمی قوناغی مەککە دێتە خوارەوە و حیوار و لەیەککەشتن بەرهەمی داوە و چەند کەسێک لە جوولەکە باوەڕیان هێناوە بە حەقیقەتی قورئان و ڕۆژی دوایی و وەک ئیماندارانی نوێ قورئان دەخوێنن و نوێژ دەکەن و فەرمان بە چاکە و قەدەغە لە خراپە دەکەن و لەگەڵ ئوممەتی خەیردا سەرقاڵی پێشبڕکێن لەسەر خەیر و خوای گەورەش شایەتییان بۆ دەدات کە ئەوانیش بەشێکن لە صالح و سەر ڕاستەکان و ئەمانە بە شاهیدی قورئان جیاوازن لەوانەی دیکەی ئەهلی کیتاب کە ڕاستییەکان دەشارنەوە واتە زانا و خوێنەدەوارەکانیان.

ئایەتی (٦٧) التوبه ((**الْمُنَافِقُونَ والْمُنَافِقَاتُ بَعْضهُم مِّن بَعْض يَأْمُرُونَ بِالْمُنكرويَنْهَوْنَ عَنِ الْمَعْرُوفِ ويَقْبِضونَ أَيْدِيَهُمْ نَسُوا اللَّهَ فَنَسِيَهُمْ إِنَّ الْمُنَافِقِينَ هُمُ الْفَاسِقُونَ**))، ڕاڤە و تەفسیری ئەم ئایەتە و سیاقی قورئانییەکەی چەند ئاماژەیەک دەدات لەوانە:

یەکەم: مونافیقەکان پیاو و ژنیان وەک یەک وان و هەموویان هەڵگری یەک جور ڤایروسی عەقیدەتی و دوور لە ئەخلاق و بەهای ئیمانی و کومەڵایەتین و هەرشتێک خێری تێدا بێت ئەوان پێچەوانەکەی دەکەن و دەڵێن و بڵاوی دەکەنەوە.

دووەم: زور بەخیل و دەستنوقاون، دژن بە بەخشین و یارمەتی هەژاران و لێقەوماوان.

سێیەم: خوایان لەبیر خویان بردووەتەوە و خوای گەورەش ئەوان لەبیر خوی دەباتەوە، واتە شایەنی هیدایەت و ڕەحم و بەزەیی خوا نین، چونکە جگە لە کوفری عقیدەتی خێریان بو هیچ کەسێکیش ناوێت.

چوارەم: ئەم مونافیقانە کە لە هەموو سەردەمێکدا بە شێوازێک کەم و زور هەن، بە شائیعە و درو و بوختان کار و ئەرکی ئیمانداران و گرووپ و بانگخوازەکان قورس و ناڕەحەت دەکەن و هەوڵ دەدەن بەردەوام چەواشە بکەن.

ئایەتی (١١٢) التوبة ((**التَّائِبُونَ الْعَابِدُونَ الْحَامِدُونَ السَّائِحُونَ الرَّاكِعُونَ السَّاجِدُونَ الْامِرُونَ**

**بِالْمَعْرُوفِ والنَّاهُونَ عَنِ الْمُنكروالْحَافِضونَ لِحُدُودِ اللّٰهِ وبَشِّرِ الْمُومِنِينَ))**
لەم ئایەتەدا جێگەی ئایەتەکە دەگورێت و بەرِوونی گەشە و پێگەیشتن و بەرەوپێشچوونی کومەڵگەی مەدینە و کومەڵگەی ئیسلامی دەبینرێت و أمر بە معروف و نهی لە منکر دەکەوێتە جێگایەکی زور گرنگ و دەبێتە سیفەتی کەسانێک کە ماوەیەکە خەریک و سەرقاڵی خوپێگەیاندن و خەڵک و تاک و کومەڵگە پێدەگەیەنن، سیما و ڕوخسار و ڕەفتاریان زور تایبەت و جیاوازە و بەردەوام (توبەکارن، عابدن، سوپاسگوزارن، بانگخوازن، لە نوێژدان، فەرمان بە چاکە دەکەن و ڕێگری لە خراپە دەکەن، سنوورەکانی خوای گەورە دەپارێزن، مژدەیان پێ بدە ئەوانە ئیماندارن). ئێستا بەرەی شەڕ و فەساد و دژە خودا و دژە مروڤ و دژە خێر و دژە ژیان تاقمێکی دیکەی لێ پەیدا بووە و جگەلە کافر و موشریک و هەندێک لە ئەهلی کیتاب ئەم مونافیقانەش لە مەدینە سەریانهەڵداوە و جگە لە بێباوەڕیی و ئەخلاقی ناپەسەند خیانەتکاریشن و لەگەڵ دوژمنان هاوپەیمانی دروزنن و لەگەڵ ئەوانیش درو دەکەن، بویە قورئان ئەو هەموو سیفەت و بەها و ئەخلاقە جوانە لەگەڵ (الامرین بالمعروف و الناهین عن المنکر)کو دەکاتەوە، چونکە ئەرکەکە قورستر بووە و پانتایی قەڵەمڕەوی بانگەوازیش زیاتر بووە و بەرەو دونیای دەرەوەی مەدینە پەلیکێشاوە.
ئایەتی (٤١) الحج ((**الّذِينَ إِن مَّكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْض أَقَامُوا الصَّلّاه واتَوُا الزَّكَاة وأَمَرُوا بِالْمَعْرُوفِ ونَهَوْا عَنِ الْمُنكرولِلّٰهِ عَاقِبَه الْأُمُور**))، لە ڕاڤە و سیاقی ئەم ئایەتەدا لەگەڵ ئایەتەکانی پێشوو کومەڵێک ئاماژە هەن، وەک:
یەکەم: لە پێش تمکین و دەسەڵات و دەوڵەت، و لە پاش تمکین و دەسەڵاتیش أمر بە معروف و نهی لە منکر هەر فریضة و شعیرة یە و واجبە دەبێت پروسەیەکی بەردەوام بێت.
دووەم: ئیقامەی نوێژ و زەکات دان و أمر بە معروف و نهی لە منکر، لە مەرجەکانی تەمکینن.
سێیەم: ئەم ئایەتە لە دوای ئایەتی ٣٨و٣٩و٤٠ دێت کە هەرچوار ئایەتەکە یەک سیاقی قورئانی دروست دەکەن و هەریەکەشیان بوخوی مەبدەء و پرنسیپێکی سەربەخو دەچەسپێنێت، ئایەتی ٣٨ خوای گەورە بەڵێنی داوە دیفاع لە ئیمانداران بکات و هیچ خیانەتکارێکی بێباوەڕیشی خوش ناوێت... ئایەتی ٣٩: خوای گەورە موڵەتی داوە بەو کەسانەی ستەمیان لێ دەکرێت بجەنگن بو مافی خویان و لابردنی زوڵمەکە و بەڵێنی پشتگیریشی و سەرخستن داوە.... ئایەتی٤٠: شەرح و ڕاڤەی زوڵمەکە دەکات و دەفەرموێت: ئەوانە لە ماڵ و موڵک و نیشتیمانی خویان دەرکراون و لەسەر ئەوەی ڕایانگەیاندووە کە تەنها پەروەردگاری ئەوان الله یە، پاشان یاسا و ڕێسا و سوننەتی (ندافع) واتە دەفعی شەڕ و بەرەی شەڕ بە خەیر و بەرەی خەیر و، دەفەرموێت ئەگەر ئەو سوننەتی (تدافع)ە نەبێت جێگایەک بو پەرستش نامێنێت بو هیچ ئاینێک، لەبەر ئەم ئایەتە و هەندێک لە ئایەتەکانی دیکەیە بەشێک لە زانایان (أمر بالمعروف و نهی عن المنکر) بە جیهاد تەفسیر دەکەن لەکاتی پێویستدا.

## بەشی دووەمی دەقەکان

ئەو دەقە قورئانییانەی کە تەنها (دەستەواژەی معروف)ی تێدا هاتووە، بریتین لە ٢٧ ئایەت، زیاتر بابەتی کومەلایەتی و مامەڵە و موعامەلاتن و زوربەیان باسی مافی ژنە لە بابەتەکانی نیحاح و تەلاق و مارەیی و موڵک و سامان و سەبەخویی لەو بوارانەدا. ئەمەش لەبەرئەوەیە لە دونیای ئەو سەردەمەدا بە گشتی و لە نەفامی عەرەبدا بەتایبەت مافەکانی ژن نەک پارێزراو نەبوون، بەڵکو وەک گیانلەبەران هەندێک جار مامەڵەیان پێوەکراوە، بویە قورئان ئەو مافانەی نەداوەتە دەست عورف و ئیجتیهادی مسوڵمانان، بەڵکو بوخوی بەدەقی ڕاست و ڕەوان مافەکانی چەسپاندووە، لێرەدا تەنها ئاماژە بە ژمارەی ئایەت و ناوی سورەتەکە دەکەین و پەیوەندی و بوارەکەیان:

١. ئایەتی ١٧٨ البقره) **يأَيُّهَا الَّذِينَ امَنُوا كُتِبَ عَلَيْكُمُ الْقِصَاصُ فِي الْقَتْلَى الْحُرُّ بِالْحُرِ والْعَبْدُ بِالْعَبْدِ والْأُنثَىٰ بِالْأُنثَىٰ فَمَنْ عُفِيَ لَهُ مِنْ أَخِيهِ شَيْءٌ فَاتِّبَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ وأَدَاءٌ إِلَيْهِ بِإِحْسَانٍ ذَٰلِكَ تَخْفِيفٌ مِّن رَّبِّكُمْ ورَحْمَةٌ فَمَنِ اعْتَدَىٰ بَعْدَ ذَٰلِكَ فَلَهُ عَذَابٌ أَلِيمٌ** (وشەی) **بِالْمَعْرُوفِ** (تێیدا باسی خوێنی کوژراوە.

٢. ئایەتی ١٨٠ البقرة (**كُتِبَ عَلَيْكُمْ إِذَا حَضَرَ أَحَدَكُمُ الْمَوْتُ إِن تَرَكَ خَيْرًا الْوَصِيَّةُ لِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ** (وشەی) **بِالْمَعْرُوفِ** تێیدا باسی وەسیەتە بە عدل.

٣. ئایەتی ٢٢٨ البقرة (**وَالْمُطَلَّقَاتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَاثَةَ قُرُوءٍ وَلَا يَحِلُّ لَهُنَّ أَن يَكْتُمْنَ مَا خَلَقَ اللَّهُ فِي أَرْحَامِهِنَّ إِن كُنَّ يُؤْمِنَّ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَبُعُولَتُهُنَّ أَحَقُّ بِرَدِّهِنَّ فِي ذَٰلِكَ إِنْ أَرَادُوا إِصْلَاحًا وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَلِلرِّجَالِ عَلَيْهِنَّ دَرَجَةٌ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ**) وشەی (**بِالْمَعْرُوفِ**) لێرەدا مەبەستی ئەوەیە کە ئەو مافی یەکسانەی لە نێوان ژن و مێردا هەیە دەبێت پارێزراو بێت، پاش گەڕانەوە و چاکردنەوەی تەلاق و نابێت هیچکامیان نیەتی خراپیان هەبێت، بەتایبەت پیاو.

٤. ئایەتی ٢٢٩ البقرة (**الطَّلَاقُ مَرَّتَانِ فَإِمْسَاكٌ بِمَعْرُوفٍ أَوْ تَسْرِيحٌ بِإِحْسَانٍ وَلَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَأْخُذُوا مِمَّا آتَيْتُمُوهُنَّ شَيْئًا إِلَّا أَن يَخَافَا أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا يُقِيمَا حُدُودَ اللَّهِ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا فِيمَا افْتَدَتْ بِهِ تِلْكَ حُدُودُ اللَّهِ فَلَا تَعْتَدُوهَا وَمَن يَتَعَدَّ حُدُودَ اللَّهِ فَأُولَٰئِكَ هُمُ الظَّالِمُونَ**) وشەی (**بِمَعْرُوفٍ**) لێرەدا مەبەستی کە بە پیاوەکان دەڵێت، لەم دوا فرسەتەدا یان بەشەرعی و جوانی مامەڵە و ڕەفتار لەگەڵ هاوسەرەکانتان بکەن و بەردەوامی بدەن بە هاوژینیتان یان ((بإحسان)) دەستبەرداریان ببن، واتە بەڕێزەوە لەیەک جیاببنەوە و، ئەزیەتیان مەدەن و، کاتیان پێ مەکوژن و ناویان مەزڕێنن و لەکەداریان مەکەن، ئەوەش بو پاراستنی ئافرەتە و کرانەوەی فرسەتی هاوسەرگیرییە، ئەگەر ویستی شوو بکاتەوە.

٥. ئایەتی ٢٣١ البقرة (**وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ سَرِّحُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَلَا تُمْسِكُوهُنَّ ضِرَارًا لِّتَعْتَدُوا وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَقَدْ ظَلَمَ نَفْسَهُ وَلَا تَتَّخِذُوا آيَاتِ اللَّهِ هُزُوًا وَاذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَمَا أَنزَلَ عَلَيْكُم مِّنَ الْكِتَابِ وَالْحِكْمَةِ يَعِظُكُم بِهِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِكُلِّ شَيْءٍ عَلِيمٌ**)، وشەی(**بِمَعْرُوفٍ**) لێرەدا مەبەستی کە بە پیاوەکان دەڵێت ئایەتی ٢٢٨ و ٢٢٩ تان لەبیر نەچێت و نەکەن بەمەبەستی زەرەر پێگەیاندن و سنوبەزاندن و زوڵمکردن

ژنەکانتان بهێنەوە، پاش ماوەی تەڵاقی یەکەم، چونکە ئەگەر ئەو نیاز و نیەت و پلانەتان هەبێت ئەوە زوڵم لە خۆتان دەکەن و گاڵتەجاری بە ئایات و فەرمانەکانی خودا دەکەن.

٦. ئایەتی ٢٣٢ البقرة (**وَإِذَا طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ فَبَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا تَعْضُلُوهُنَّ أَن يَنكِحْنَ أَزْوَاجَهُنَّ إِذَا تَرَاضَوْا بَيْنَهُم بِالْمَعْرُوفِ ذَٰلِكَ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ مِنكُمْ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِذَٰلِكُمْ أَزْكَىٰ لَكُمْ وَأَطْهَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ وَأَنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ**) وشەی (**بِالْمَعْرُوفِ**) لێرەدا مەبەستی ئەوەیە ئەگەر هەردوو هاوسەر گەیشتنە ڕێکەوتنی تەواو و پەشیمان بن لەوەی پێشتر ڕویداوە.

٧. ئایەتی ٢٣٣ البقرة (**وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ وَعَلَى الْمَوْلُودِ لَهُ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا لَا تُضَارَّوَالِدَةٌ بِوَلَدِهَا وَلَا مَوْلُودٌ لَّهُ بِوَلَدِهِ وَعَلَى الْوَارِثِ مِثْلُ ذَٰلِكَ فَإِنْ أَرَادَا فِصَالًا عَن تَرَاضٍ مِّنْهُمَا وَتَشَاوُرٍ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْهِمَا وَإِنْ أَرَدتُّمْ أَن تَسْتَرْضِعُوا أَوْلَادَكُمْ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِذَا سَلَّمْتُم مَّا آتَيْتُم بِالْمَعْرُوفِ وَاتَّقُوا اللَّهَ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ**)، وشەی (**بِالْمَعْرُوفِ**) لێرەدا مەبەستی ئەوەیە بەپێی عورف و دوور لە ئیسراف یان ڕەزیلی کردن دەبێت خزمەت بە دایکی شیردەر بکرێت پاش جیابوونەوەیان لەیەکتر.

٨ ئایەتی ٢٣٤ البقرة (**وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرْبَعَةَ أَشْهُرٍوَعَشْرًا فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ وَاللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ خَبِيرٌ**)، وشەی(**بِالْمَعْرُوفِ**) لێرەدا، مەبەستی ئەوەیە کە ئافرەت پاش تەواوبوونی وادەی تەڵاق بۆی هەیە خۆی جوان بکات و خۆی ئامادە بکات بۆ هاوسەرگیری نوێ و نابێت ڕێگری لێبکرێت، بەمەرجێک خۆجوانکردن و خۆسازدانەکە لە سنوری شەرعدا بێت.

٩. ئایەتی ٢٣٥ البقرة (**وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِ مِنْ خِطْبَةِ النِّسَاءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِي أَنفُسِكُمْ عَلِمَ اللَّهُ أَنَّكُمْ سَتَذْكُرُونَهُنَّ وَلَٰكِن لَّا تُوَاعِدُوهُنَّ سِرًّا إِلَّا أَن تَقُولُوا قَوْلًا مَّعْرُوفًا وَلَا تَعْزِمُوا عُقْدَةَ النِّكَاحِ حَتَّىٰ يَبْلُغَ الْكِتَابُ أَجَلَهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ يَعْلَمُ مَا فِي أَنفُسِكُمْ فَاحْذَرُوهُ وَاعْلَمُوا أَنَّ اللَّهَ غَفُورٌ حَلِيمٌ**)، وشەی (**مَّعْرُوفًا**) مەبەستی ئەوەیە کە نابێت ئافرەتی بێوەژن لەکاتی ((عیددە)) دا بخەڵەتێنرێت و چەواشە بکرێت، بۆ مەبەستی هاوسەرگیری نوێ.

١٠. ئایەتی ٢٣٦ البقرة (**لَّا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ إِن طَلَّقْتُمُ النِّسَاءَ مَا لَمْ تَمَسُّوهُنَّ أَوْ تَفْرِضُوا لَهُنَّ فَرِيضَةً وَمَتِّعُوهُنَّ عَلَى الْمُوسِعِ قَدَرُهُ وَعَلَى الْمُقْتِرِ قَدَرُهُ مَتَاعًا بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُحْسِنِينَ**)، وشەی (**بِالْمَعْرُوفِ**) مەبەستی ئەوەیە کە ئەو ئافرەتەی پێش گواستنەوە تەڵاق دەدرێت پێویستە تەواوی مافی خۆی بەپێی توانا و ئیمکانیاتی پیاوەکە پێ بدرێت، ئەگەر پارەدار و دەوڵەمەند بوو دەبێت دەستبەجێ مافەکان بەجوانی و بێ دواکەوتن جێبەجێ بکات ، ئەگەر هەژاریش بوو بەپێی ئیمکانیاتەکەی، لە هەموو حاڵەتێکدا نابێت مافی ئەو ئافرەتە بفەوتێ یان کەمبکرێتەوە یان دوابخرێ.

١١.ئایەتی ٢٤٠ البقرة (**وَالَّذِينَ يُتَوَفَّوْنَ مِنكُمْ وَيَذَرُونَ أَزْوَاجًا وَصِيَّةً لِّأَزْوَاجِهِم مَّتَاعًا إِلَى الْحَوْلِ غَيْرَإِخْرَاجٍ فَإِنْ خَرَجْنَ فَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِي مَا فَعَلْنَ فِي أَنفُسِهِنَّ مِن مَّعْرُوفٍ وَاللَّهُ عَزِيزٌ حَكِيمٌ**)، وشەی (**مَّعْرُوفٍ**) مەبەستی ئەوەیە کە ئەو ئافرەتەی کە هاوژینەکەی دەمرێت پاش تەواوبونی ((عیددە))

بۆی هەیە خۆی جوان بکات و خۆی ئامادە بکات بۆ هاوسەرگیری نوێ و بە شێوەیەک لە سنووری شەرعدا بێت و عورف و نەریتی جوان و پەسەندی کومەڵایەتیش بپارێزێت.

١٢. ئایەتی ٢٤١ البقرة (وَلِلْمُطَلَّقَاتِ مَتَاعٌ بِالْمَعْرُوفِ حَقًّا عَلَى الْمُتَّقِينَ)، وشەی (بِالْمَعْرُوفِ) مەبەستی ئەوەیە کە لەسەر پیاوە کاتێک هاوژینەکەی تەڵاق دەدات، لە ماوەی ((عیددە))دا خزمەتی پێویستی بکات دوور لە هیچ منەت و دواخستنێک.

١٣. ئایەتی ١٩ النساء (يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَن تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَن يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُّبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِن كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَىٰ أَن تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا)، وشەی (بِالْمَعْرُوفِ) مەبەستی جوان و باش مامەڵەکردنە لەگەڵ ئافرەت، بەوشێوەیەی خوای گەورە فەرمانی کردووە لە ڕەفتاری جوان و قسەی جوان و ڕێز و حورمەت گرتن.

١٤. ئایەتی ٢٥ النساء (وَمَن لَّمْ يَسْتَطِعْ مِنكُمْ طَوْلًا أَن يَنكِحَ الْمُحْصَنَاتِ الْمُؤْمِنَاتِ فَمِن مَّا مَلَكَتْ أَيْمَانُكُم مِّن فَتَيَاتِكُمُ الْمُؤْمِنَاتِ وَاللَّهُ أَعْلَمُ بِإِيمَانِكُم بَعْضُكُم مِّن بَعْضٍ فَانكِحُوهُنَّ بِإِذْنِ أَهْلِهِنَّ وَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ مُحْصَنَاتٍ غَيْرَ مُسَافِحَاتٍ وَلَا مُتَّخِذَاتِ أَخْدَانٍ فَإِذَا أُحْصِنَّ فَإِنْ أَتَيْنَ بِفَاحِشَةٍ فَعَلَيْهِنَّ نِصْفُ مَا عَلَى الْمُحْصَنَاتِ مِنَ الْعَذَابِ ذَٰلِكَ لِمَنْ خَشِيَ الْعَنَتَ مِنكُمْ وَأَن تَصْبِرُوا خَيْرٌ لَّكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)، وشەی (بِالْمَعْرُوفِ) مەبەستی ئەوەیە، ئەگەر پیاوێک نەیتوانی ئافرەتێکی ئازاد یان هاوشانی خۆی بێنێ و ناچار بوو خزمەتکارێک بخوازێت پێویستە لەسەری وەک هاوشانی خۆی ڕەفتاری لەگەڵ بکات و هەموو مافێکی ماددیی و مەعنەوی بپارێزێت و ڕێز و حورمەتی تەواوی بگرێت.

١٥. ئایەتی ١٢ الممتحنة (يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ إِذَا جَاءَكَ الْمُؤْمِنَاتُ يُبَايِعْنَكَ عَلَىٰ أَن لَّا يُشْرِكْنَ بِاللَّهِ شَيْئًا وَلَا يَسْرِقْنَ وَلَا يَزْنِينَ وَلَا يَقْتُلْنَ أَوْلَادَهُنَّ وَلَا يَأْتِينَ بِبُهْتَانٍ يَفْتَرِينَهُ بَيْنَ أَيْدِيهِنَّ وَأَرْجُلِهِنَّ وَلَا يَعْصِينَكَ فِي مَعْرُوفٍ فَبَايِعْهُنَّ وَاسْتَغْفِرْ لَهُنَّ اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ)، وشەی (م□ع□ر□وف□) مەبەستی ئەوەیە یەکێک لەو شەش مەرجەی دانراوە بۆ بەیعەتی پێغەمبەر لەگەڵ ئافرەتان ئەوەیە کە ئەو ئافرەتە سەرپێچی پێغەمبەر نەکات ئەگەر فرمانی پێکرد بە چاکە و قەدەغەی لێکرد لە خراپە، واتە پابەندی فرمانەکان بێت.

١٦. ئایەتی ٢ الطلاق (فَإِذَا بَلَغْنَ أَجَلَهُنَّ فَأَمْسِكُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ أَوْ فَارِقُوهُنَّ بِمَعْرُوفٍ وَأَشْهِدُوا ذَوَيْ عَدْلٍ مِّنكُمْ وَأَقِيمُوا الشَّهَادَةَ لِلَّهِ ذَٰلِكُمْ يُوعَظُ بِهِ مَن كَانَ يُؤْمِنُ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَمَن يَتَّقِ اللَّهَ يَجْعَل لَّهُ مَخْرَجًا)، وشەی (بِمَعْرُوفٍ) دووجار هاتووە، مەبەستی تەئکیدکردنەوەیە لە بەشێک لە ئایەتەکانی سورەتی البقرة پاش تەواوبوونی ((عیددە)) تەڵاقی یەکەم یان بەجوانی و بەڕێز و مافەکانەوە ڕێکەوتەوە، یان بە هەمان ڕێز و جوانییەوە دەستبەرداریان ببن و تەڵاقیان بدەن و، ئەزیەتیان مەدەن و مەیانشکێنن و، تورەییان بۆ دروست مەکەن.

١٧. ئایەتی ٦ الطلاق (أَسْكِنُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ سَكَنتُم مِّن وُجْدِكُمْ وَلَا تُضَارُّوهُنَّ لِتُضَيِّقُوا عَلَيْهِنَّ وَإِن كُنَّ أُولَاتِ حَمْلٍ فَأَنفِقُوا عَلَيْهِنَّ حَتَّىٰ يَضَعْنَ حَمْلَهُنَّ فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ وَأْتَمِرُوا بَيْنَكُم

**بِمَعْرُوفٍ وَإِن تَعَاسَرْتُمْ فَسَتُرْضِعُ لَهُ أُخْرَى)**، وشەی (**بِمَعْرُوفٍ**) لێرەدا زۆر گرنگ و هەستیارە، چونکە باسی مافی منداڵی شیرەخۆرە کە دایکی تەڵاق دراوە، لێرە نابێت مافی منداڵەکە بفەوتێت بە تێربوون لە شیری دایک، ناشبێت مافی دایکەکە بفەوتێت کاتێک ڕازی بوو دوو ساڵ شیر بە منداڵەکە بدات، ئەگەر باوکەکە دەرامەتی باشی بوو شەرع و یاسا لەسەری فەرز دەکات مافی دایکەکە بدات بەرانبەر شیردانەکە، ئەگەر باوکەکە کەم دەست و هەژار بوو، دەبێت هەردوولا بەجوانی مامەڵەی یەکتر بکەن و منداڵەکە لەو نێوەندەدا پارێزراو بێت.

١٨. ئایەتی ٢٦٣ البقرة (**قَوْلٌ مَّعْرُوفٌ وَمَغْفِرَةٌ خَيْرٌ مِّن صَدَقَةٍ يَتْبَعُهَا أَذًى وَاللَّهُ غَنِيٌّ حَلِيمٌ**)، وشەی(**مَّعْرُوفٌ**) مەبەست قسەی جوان و شیرین بەرامبەر ئەوکەسەی کە زەکات یان صەدەقە و خێری پێ دەدرێت، یان داوا دەکات و نییە، یان داوالێکراو نایەوێ صەدەقە بکات.

١٩. ئایەتی ٥ النساء (**وَلَا تُؤْتُوا السُّفَهَاءَ أَمْوَالَكُمُ الَّتِي جَعَلَ اللَّهُ لَكُمْ قِيَامًا وَارْزُقُوهُمْ فِيهَا وَاكْسُوهُمْ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا**)، وشەی(**مَّعْرُوفًا**) واتە قسەی باش و جوان و خێر بکرێت بۆ (سفیه-دەستبڵاو) پوشتە بکرێن و تێربکرێن، بەڵام پارە نەخرێتە بەردەستیان.

٢٠. ئایەتی ٦ النساء. (**وَابْتَلُوا الْيَتَامَى حَتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَلَا تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا**)، وشەی( **بِالْمَعْرُوفِ**) مەبەست پێی بێ نیازیی و دوورەپەرێزی (کافل الیتیم) لە ماڵی هەتیو یان وەرگرتن و خەرجکردن بە ئەندازەی پێویست.

٢١.ئایەتی ٨ النساء) **وَإِذَا حَضَرَ الْقِسْمَةَ أُولُو الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينُ فَارْزُقُوهُم مِّنْهُ وَقُولُوا لَهُمْ قَوْلًا مَّعْرُوفًا**)، وشەی( **مَّعْرُوفًا**) مەبەست پێی قسەی جوان و گونجاو بوو لەگەڵ کەس و خزمی مردوو لەکاتی بەشکردنی میراتدا.

٢٢.ئایەتی ١١٤ النساء) **لَّا خَيْرَ فِي كَثِيرٍ مِّن نَّجْوَاهُمْ إِلَّا مَنْ أَمَرَ بِصَدَقَةٍ أَوْ مَعْرُوفٍ أَوْ إِصْلَاحٍ بَيْنَ النَّاسِ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ ابْتِغَاءَ مَرْضَاتِ اللَّهِ فَسَوْفَ نُؤْتِيهِ أَجْرًا عَظِيمًا**)، وشەی معروف واتە کاری چاکە و خێر و نێوان خۆشکردن.

٢٣.ئایەتی ٦ الاحزاب) **النَّبِيُّ أَوْلَى بِالْمُؤْمِنِينَ مِنْ أَنفُسِهِمْ وَأَزْوَاجُهُ أُمَّهَاتُهُمْ وَأُولُو الْأَرْحَامِ بَعْضُهُمْ أَوْلَى بِبَعْضٍ فِي كِتَابِ اللَّهِ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُهَاجِرِينَ إِلَّا أَن تَفْعَلُوا إِلَى أَوْلِيَائِكُم مَّعْرُوفًا كَانَ ذَٰلِكَ فِي الْكِتَابِ مَسْطُورًا**) وشەی **مَّعْرُوفًا** واتە ئەولەویەتی میرات بۆ خزمەکانی مردوو.

٢٤.ئایەتی ٣٢ الاحزاب **يَا نِسَاءَ النَّبِيِّ لَسْتُنَّ كَأَحَدٍ مِّنَ النِّسَاءِ إِنِ اتَّقَيْتُنَّ فَلَا تَخْضَعْنَ بِالْقَوْلِ فَيَطْمَعَ الَّذِي فِي قَلْبِهِ مَرَضٌ وَقُلْنَ قَوْلًا مَّعْرُوفًا** وشەی (**مَّعْرُوفًا**) تایبەتە بە خێزانەکانی پێغەمبەر.

٢٥.ئایەتی ٢١ محمد) **طَاعَةٌ وَقَوْلٌ مَّعْرُوفٌ فَإِذَا عَزَمَ الْأَمْرُ فَلَوْ صَدَقُوا اللَّهَ لَكَانَ خَيْرًا لَّهُمْ**)، وشەی **معْرُوفٌ** واتە قسەی جوان.

- بەش و جوری سێیەمی دەقەکان، ئەوانەن کە تەنها باسی (منكر)یان تێدا هاتووە ئەو ئایەت و دەقانە تەنها (٧) دەقن.

**دەقەکان بەپێی تەرتیبی سورەتەکان بەم شێوەیەی خوارەوەن:**

١. ئایەتی ٧٨ مائده **(لُعِنَ الَّذِينَ كَفَرُوا مِن بَنِي إِسْرَائِيلَ عَلَىٰ لِسَانِ دَاوُودَ وَعِيسَى ابْنِ مَرْيَمَ ذَٰلِكَ بِمَا عَصَوا وَّكَانُوا يَعْتَدُونَ)** (٧٩) **(كَانُوا لَا يَتَنَاهَوْنَ عَن مُّنكَرٍ فَعَلُوهُ لَبِئْسَ مَا كَانُوا يَفْعَلُونَ)** مەبەست لە ((منكر)) ئەوەیە کە بەنی ئیسرائیل بەهوی سنووربەزاندن و گوناهی دووبارەی زۆرەوە تووشی کومەڵێک نەخۆشی و لادانی زۆرەوە بوون، یەکێک لە خەسڵەتەکانیان ئەوەبوو کە، هەر کار و ڕەفتارێکی مونکەر و نەشیاو بکرایە کەس ڕێگری لێ نەدەکرد، کەواتە گوناهو سنووربەزاندن و زوڵمکردن وەک عورف و مۆدە بێ ڕێگریی و بەرهەڵستکاریی باو بووە.

٢. ئایەتی ٩٠ النحل **(إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَىٰ وَيَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ)**، مەبەست لە ((منكر)) ئەوەیە هەر کار و ڕەفتارێک پێچەوانەی فیترەت بێت بەشێوەیەکی گشتی.

٣ ئایەتی ٧٢ الحج **(وَإِذَا تُتْلَىٰ عَلَيْهِمْ آيَاتُنَا بَيِّنَاتٍ تَعْرِفُ فِي وُجُوهِ الَّذِينَ كَفَرُوا الْمُنكَرَ يَكَادُونَ يَسْطُونَ بِالَّذِينَ يَتْلُونَ عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا قُلْ أَفَأُنَبِّئُكُم بِشَرٍّ مِّن ذَٰلِكُمُ النَّارُ وَعَدَهَا اللَّهُ الَّذِينَ كَفَرُوا وَبِئْسَ الْمَصِيرُ)**، مەبەست لە ((منكر)) لێرەدا ئەوەیە کە هەرکات ئایەتەکانی خوای گەورە دابەزیبایە، دەموچاوی موشریکەکان عەبووس دەبوون و تێکدەچوون، دەم و لوتیان دەدا بەیەکدا.

٤ ئایەتی ٢١ النور **(يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَتَّبِعُوا خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ وَمَن يَتَّبِعْ خُطُوَاتِ الشَّيْطَانِ فَإِنَّهُ يَأْمُرُ بِالْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَوْلَا فَضْلُ اللَّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ مَا زَكَىٰ مِنكُم مِّنْ أَحَدٍ أَبَدًا وَلَٰكِنَّ اللَّهَ يُزَكِّي مَن يَشَاءُ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ)**، مەبەست لە ((منكر)) لێرەدا بریتییە لە هەر کار و هەڵوێستێک شەرعی نەبێت یان پێچەوانەی عەقڵی سەلیم بێت.

٥ ئایەتی ٢٩ العنکبوت **(أَئِنَّكُمْ لَتَأْتُونَ الرِّجَالَ وَتَقْطَعُونَ السَّبِيلَ وَتَأْتُونَ فِي نَادِيكُمُ الْمُنكَرَ فَمَا كَانَ جَوَابَ قَوْمِهِ إِلَّا أَن قَالُوا ائْتِنَا بِعَذَابِ اللَّهِ إِن كُنتَ مِنَ الصَّادِقِينَ)**، مەبەست لە ((منكر)) لێرەدا بە زۆر گشتگیرە و زۆربەی ئەو کار و ڕەفتار و هەڵسوکەوتە ناشرین و بێزارانە دەگرێتەوە کە بە ئاشکرا لەناو یانە و نادییەکاندا دەیانکرد و، وەک عورفێکی قێزەون ڕەفتاریان پێدەکرد لەوانە، نێربازیی و گاڵتە بە یەککردن و، فیکە کردن لەیەکتر و، تانە و تەشەردان و بەیەکترپێکەنین.

٦ ئایەتی ٤٥ العنکبوت **(اتْلُ مَا أُوحِيَ إِلَيْكَ مِنَ الْكِتَابِ وَأَقِمِ الصَّلَاةَ إِنَّ الصَّلَاةَ تَنْهَىٰ عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنكَرِ وَلَذِكْرُ اللَّهِ أَكْبَرُ وَاللَّهُ يَعْلَمُ مَا تَصْنَعُونَ)**، مەبەست لە ((منكر)) لێرەدا بابەتێکی زۆر گرنگ و هەستیارە، زۆر بنەڕەتییە، ئەویش باسی پێگەی نوێژە لە دین و شەرعدا و، کاریگەری نوێژە لە ژیانی ئیماندار و پێناسەیەکی تێر و تەسەلە بۆ نوێژ، کە نوێژی تەواو دروست ئەو نوێژەیە کە ڕێگری دەکات لە هەموو جۆرە مونکەرەکان لە گەورە بۆ بچووک.

٧ ئایەتی ٢ المجادلة **(الَّذِينَ يُظَاهِرُونَ مِنكُم مِّن نِّسَائِهِم مَّا هُنَّ أُمَّهَاتِهِمْ إِنْ أُمَّهَاتُهُمْ إِلَّا اللَّائِي وَلَدْنَهُمْ وَإِنَّهُمْ لَيَقُولُونَ مُنكَرًا مِّنَ الْقَوْلِ وَزُورًا وَإِنَّ اللَّهَ لَعَفُوٌّ غَفُورٌ .)** مەبەست لە ((منكر)) لێرەدا ئەوەیە، کە قورئان ((اظهار) بە مونکەر ناودەبات، واتە قسەیەکی نەشیاو و نەگونجاو ناشرین و درۆ و بوختان.



پ.ی.د.هاشم عومەر ئەحمەد
مامۆستا لە زانکۆی هەڵەبجە

# بانکی ئیسلامی

## ناساندن و کار و چالاکی و گرێبەستەکانی لە ڕوانگەی شەریعەتەوە



## بەشی دووەم : ناساندن و مێژووی سەرهەڵدان و گەشەسەندنی بانکی ئیسلامی

بانکی ئیسلامی لەم سەردەمەدا هەنگاوی گەورەی ناوە لە بواری کاری بانکی و مامەڵە دارایی و گرێبەستەکاندا، ئەمەش بەڕوونی دەردەکەوێت لەئەنجامی ئەو گەشە و بڵاوبونەوە فراوانەی بانکی ئیسلامی لە زۆربەی و ڵاتەکاندا، و بووەتە ڕکابەر و جێگرەوەی بانکی تەقلیدی لە هەندێکیاندا، ئەمەش زیاتر دەگەڕێتەوە بۆ سروشت و جۆری کاری ئەم بانکانە و چۆنیەتی مامەڵەکردنیان لەگەڵ خوازیاران و کڕیار و سەوداکاراندا، ئەویش پابەندی و پەیوەست بوونیەتی لەڕووی بنەما و ئاکار و کارکردنەوە بە بنەما گشتیی و بەها باڵا و ڕەوشتەکانی ئایینی ئیسلامەوە، هەر ئەمەش پاڵنەری سەرەکییە بۆ کارکردن و هەوڵدان لەپێناو ڕاستکردنەوەی کار و وەزیفەی بانکی لە کۆمەڵگەدا، دواتریش چۆنیەتی کارکردن لەسەر گەشە و پەرەپێدانی ئابووریی و ڕۆشنبیرکردنی تاک و کۆمەڵگە لە چۆنیەتی بەگەڕخستنی ماڵ و داراییان و گەشەپێدانی ئەو سەرمایەی کە هەیانە و ئەوجا هەوڵدانیشە بۆ پاراستنی سەرمایە و ماڵ و دارایی تاک و کۆمەڵ و گەشتن بە دادپەروەری لە ماف و دابەشکردندا.

بۆ زیاتر تێگەشتن لە سروشت و دیدگا و تایبەتمەندییەکانی بانکی ئیسلامی، پێویستە سەرەتا پێناسە و چەمکی بانکی ئیسلامی بناسێنین تاوەکو خوێنەر و توێژەران ئاشنا بن بەناوەڕۆک و دیدگای ئەم جۆرە بانکانە.

### یەکەم: پێناسە و چەمکی بانکی ئیسلامی

پاش ئەوەی بانکی ئیسلامی بووە واقعێکی دیار و کارا لە بواری کاری بانکیدا، دیدگا و پێناسەش بۆ چەمکی بانکی ئیسلامی زیادی کرد، دەکرێت بڵێین چەندین پێناسەی جۆراوجۆر و جیاواز کرا بۆ بانکی ئیسلامی، ئەم جیاوازییەش هۆکارەکەی پەیوەست بوو بە گەشەسەندنی کاری بانکی و زیادکردن و جۆراوجۆرکردنی مامەڵە و چالاکییەکانی ئەو جۆرە بانکانە بوو کە سەرەتا کار و چالاکی سنوردار بوو دواتر گەشەیکرد و تائێستاش لە گەشەکردندایە و لە چەندین بوار و کار و مامەڵەدا کار دەکات، لەو پێناسانەش کراوە بۆی:

١- ئەو بانکانەن کە پابەندن بەجێبەجێکردنی شەریعەتی ئیسلام لە گشت مامەڵە بانکی و وەبەرهێنانەکانیاندا لە ڕێگەی جێبەجێکردنی چەمکی نێوەندگیری دارایی ڕاوەستاو لەسەر بنەمای هاوبەشی لە قازانج و زیاندا لەچوارچێوەی بریکارنامەیی گشتی و تاکیدا(١).

٢- دامەزراوەیەکی داراییە لە یاسای دامەزراندن و پەیڕەوی سەرەکیدا بەئاشکرا و ڕوونی ئەوەی جێگیر کردووە کە پابەندە بە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامییەوە و بەهیچ شێوەیەکیش مامەڵە بەسووەوە ناکات نەوەرگرتن نەپێدان(٢).

٣-دامەزراوەیەکی دارایی ئابوورییە هەڵدەسێت بەنێوەندگیری نێوان خاوەن سەرمایە (پاشەکەوت) و وەبەرهێنەران لە چوارچێوەی شەریعەتی ئیسلامدا(٣).

٤- دامەزراوەیەکی داراییە مەبەستی کۆکردنەوەی ماڵ یان ئەو پاشەکەوتانەیە لەو

کەسانەی کە پێیان خۆش نییە مامەڵە بەسوەوە بکەن، و تەرخانکردن و بەکارهێنانی ئەو ماڵە لە بواری چالاکی ئابووریدا بەشێوازێک بگونجێت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا(٤).

٥-دامەزراوەیەکی دارایی بانکی نێوەندگیرە، پابەندە بەشەریعەتی ئیسلام و بنەما مەقاصدیەکانەوە لە سەرجەم مامەڵە و کاروچالاکییە و وەبەرهێنان و کارگێڕیی و بەڕێوەبردنی کارەکانیدا، و مەبەستی بەدیهێنانی قازانج و سوود و کارکردنە لەسەر پەرەپێدان و گەشەی ئابووریی و کۆمەڵایەتی بۆ تاک و دامەزراوەکان(٥).

ئەمانە و چەندین پێناسەی دیکە هەن بۆ بانکی ئیسلامی کە هەموویان لەڕووی ناوەڕۆک و بابەتەگشتییەکانەوە کۆکن لەسەر پابەندبوون بەبنەما سەرەکیی و مەقاصیدەکانی شەریعەتی ئیسلامەوە، لەپێناو خزمەتگوزاری باشتر و گەشە و پەرەپێدانی تاک و کۆمەڵگە لەڕووی ئابووریی و کۆمەڵایەتی و زانستی و بەهاکانەوە، و ئەمەش بانکی ئیسلامی بە بەرپرسیاریێتی خۆیانیان داناوە و ەک ئەرکێکی ئاینی و بەهایی و کۆمەڵایەتی، لەسەر بنەمای فەرموودەی خوای گەورە [ **تَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ و التَّقْوَى و لَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ و الْعُدْوَانِ و اتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ** ] (سورة المائدة:٢) و [**وَاعْتَصِمُوا بِحَبْلِ اللَّهِ جَمِيعًا و لَا تَفَرَّقُوا و اذْكُرُوا نِعْمَتَ اللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ كُنْتُمْ أَعْدَاءً فَأَلَّفَ بَيْنَ قُلُوبِكُمْ فَأَصْبَحْتُمْ بِنِعْمَتِهِ إِخْوَانًا وكُنْتُمْ عَلَى شَفَا حُفْرَةٍ مِنَ النَّارِ فَأَنْقَذَكُمْ مِنْهَا كَذَلِكَ يُبَيِّنُ اللَّهُ لَكُمْ آيَاتِهِ لَعَلَّكُمْ تَهْتَدُونَ**] (سورة آل عمران: ١٠٣).

**دووەم: ڕواڵەت و شێوەی بانکی ئیسلامی:**

لەو پێناسانەی پێشوو و چەندین پێناسە و تێڕوانینی دیکەوە بۆ بانکی ئیسلامی چەند ڕووگە و ڕواڵەتێکی مەنهەج و پەیڕەوی بانکی ئیسلامیمان بۆ دەردەکەوێت ئەوانیش(٦):

١-بوونی سروشتێکی ئاینی: بەومانایەی سروشتی کارکردن و مامەڵەکردن و چالاکییە دارایی و بانکی و خزمەتگوزارییەکانی سرۆشتیکی ئاینییە و لەسەر بنەماکانی ئاینی ئیسلام کار دەکات.

٢-بانکی ئیسلامی وەک هەر بانکێکی دیکە دامەزراوەیەکی دراوییە، هەوڵ دەدات بۆ ڕاکێشان و گرتنەخۆی سەوداکاران و کۆکردنەوەی ماڵ و سامان و بەکارهێنانی بەشێوەیەک کاری بانکی ڕێکوپێک بکات و گەشەی پێبدات، بەڵام بەشێوە و شیوازێک گونجاو بێت لەگەڵ بنەما گشتیەکانی شەریعەتی ئیسلامدا، لەلایەک، لەلایەکی دیکەوە خزمەت بێت بە تاک و کۆمەڵگە.

٣-هەوڵ دەدات بۆ بەدەستهێنانی قازانج و پارە، بەڵام لە چوارچێوەی ئیسلامدا، و پەیداکردنی پارە مامەڵەی دارایی و چالاکی و قازانجیش ڕاوەستاوە لەسەر کۆڵەکەیەکی بنەڕەتی گرنگ و بایەخدار ئەویش بەشدار و هاوبەشییە لە قازانج و زیاندا.

٤-بانکی ئیسلامی دەزگایەکی داراییە و مەبەستی گەشەی ئابورییە، ئەویش بەهاندانی و ەبەرهێنان و کارکردن تیایدا و بەدیهێنانی دادپەروەری لەدابەشکردن و هاریکاری کۆمەڵایەتیی، لەلایەکی دیکەوە ئامانجی دروستکردن و بونیادنانی تاکێک و کۆمەڵگەیەکە

ئاسودە و بەختەوەرە، و بەدیهێنانی خواست و هەلی کاریش بۆ تاک لەپێناو هەستانەوە و گەشەسەندنی کۆمەڵگە لەسەر بنەمای پابەندبوون بناغە و بنچینەی حەڵاڵ و حەرام و ڕاست و دروستی کارەکان.

٥-دامەزراوەیەکی بانکی سوونەخۆرە لە حاڵەتی وەرگرتنی قەرز و پێدانیدا، بەهیچ شێوەیەک و لەژێر هیچ ناو و نازناوێکدا مامەڵەی سوو ئەنجام نادات نەبەوەرگرتن و نەبەدانیش، لەگەڵ ئەمشدا پابەندە بەسەرجەم بنەماکانی شەریعەتەوە لەگشت کار و چالاکی و مامەڵەکانیدا،ئەویش لەڕێگەی دەزگایەکی شەرعییەوە کەپێی دەوترێت دەزگای چاودێری شەرعی سەر بانک،تاوەکو چاودێری کاروچالاکی و مامەڵە داراییەکانی بانکی ئیسلامی بکات، تا چەندە پابەندە بە بنەماکانی شەریعەتی ئیسلامەوە و بواری پێ بدەن یاخود ڕێگەی لێبگرن.

### سێیەم: مێژووی سەرهەڵدان و قۆناغەکانی گەشەی بانکی ئیسلامی(٧):

لەم بابەتەدا ئاماژە بەدوو تەوەری مێژوویی گرنگ دەدەین تایبەت بەمامەڵە و چالاکییە ئابووریی و داراییەکانی سەردەمی سەرەتاکانی هاتنی ئیسلام و سەردەمی هاوچەرخ بەشێوەیەکی گشتی:

أ-مامەڵە و گرێبەست و گۆڕینەوە(کردەی بانکی)لەسەرەتاکانی هاتنی ئیسلامدا:

لێرەدا تیشک دەخەینە سەر سەرهەڵدان و دروستبوونی بانکی ئیسلامی بەمانا فراوانەکەی بەواتای ئەوەی چۆنیەتی سەرهەڵدانی لە سەرەتای دەرکەوتنی ئاینی ئیسلام و بڵاوبونەوەیی و ئەو قۆناغانەی کە بانکی ئیسلامی پیادا تێپەڕیوە و گەشەیکردووە تاوەکو ئەم قۆناغەی ئێستا کە وەک دەزگا و سیستەم و دامەزراوەیەکی دارایی هاوچەرخ کاردەکات لە سیستەمی داراییدا. پێش قسەکردن لەسەر دروستبوونی بانکی ئیسلامی هاوچەرخ، تیشک دەخەینە سەر ئەو باگراوەند و ڕیشە مێژووییە سەرەتاییەی کە هۆکار و پاڵنەربوون بۆ دامەزراندنی بانکی ئیسلامی هاوچەرخ. ئەگەر سەیری مێژوویی دارایی و مامەڵەکان بکەین لە ئیسلامدا چەندین چەمک و مامەڵە و گرێبەستی هاوشێوەی ئەمڕۆ بونی هەبووە و لەوکاتانەشدا جێبەجێکراوە.

بۆیە گەر سەیری چالاکیی و مامەڵەکانی ئەو کات بکەین کە مسوڵمانان وەک پیشە و کاری دارایی خۆیان پێی هەستاون جۆرێک بووە لەو کار و چالاکییانەی ئەمڕۆمان لەگەڵ هەندێک گۆڕانکاری لەڕووی هونەریی و جێبەجێکارییەوە، ئەگەرنا وەک ڕەسەنایەتی و ڕیشەیی کارەکە هەمان کاربوون، و سەرچاوەی شەرعیبوون و نەبوونی کارەکەشیان لە قورئان و فەرموودەی پێغەمبەر(د.خ)و تێگەشتنی هاوەڵان و زانایانەوە وەرگیراوە، لەو کارانەش وەک: ئەسپەردە و بارمتە و سەفتەجە و حەواڵە و قەرز و هاوبەشی بازرگانی یان (المضاربة) و قازانجی هاوبەش و خوورکردنەوە و کرێ و و چەندین چالاکی و کاری دیکە.

گەر بۆ ئەمانەش سەیری شوێنی جوگرافی و پێگەی پیرۆز و گەورەی مەککە و مەدینە بکەین ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، لەگەڵ ئەوەشدا جێگەیەکی ئارام و سەقامگیر بووە بۆ بازرگانی نێوخۆیی و دەرەکی، خۆ خەڵکی مەککە بەهۆی ئەو بارودۆخەوە ئەزمونێکی زۆرباش و تەواویان هەبوو لەڕووی بازرگانی و مامەڵە داراییەکانەوە، مەککەش بەوە ناسراو بووە کە دوو کاروانی بازرگانی بەڕێکردووە کاروانێکی زستانە و کاروانێکی هاوینە(٨) ،کە لە زستاندا لە مەککەوە دەڕۆیشت بەرەو وڵاتی حمیر لە یەمەن و لە هاوینیشدا بەڕێدەکەوتن بەرەو شاری بوصرا لە وڵاتی شام، ئەوەتا خوای گەورەش ئەم کارە بەنیعمەتێکی گەورە بۆ خەڵکی شاری مەککە باس دەکات و دەفەرموێت **[لِإِيلَافِ قُرَيْشٍ (١) إِيلَافِهِمْ رِحْلَةَ الشِّتَاءِ وَالصَّيْفِ (٢) فَلْيَعْبُدُوا رَبَّ هَذَا الْبَيْتِ (٣) الَّذِي أَطْعَمَهُمْ مِنْ جُوعٍ وَآمَنَهُمْ مِنْ خَوْفٍ]**( سورة قريش:١-٤)، ئەم دەقی ئایەتە بەڵگەیەکی ڕوونە لەسەر ئاڵوگۆڕی بازرگانی و چۆنیەتی مامەڵەکردنی خەڵکی ئەو سەردەمە، هەروەها خودی پێغەمبەر(د.خ) بەکەسێکی(ڕاستگۆ و دەسپاک) ناسراو بووە لەناو خەڵکدا، چونکە پێش پێغەمبەرایەتیشی کار و مامەڵەی هاوبەشی لەسەر قازانج و زیان ئەنجامداوە، و پاکێتی و دروستی و دەستپاکی لە مامەڵەکانیدا ئەنجامداوە و شوناسی کەسێتی بووە، دوای ئەوەشی پێغەمبەر(د.خ) سروشی بۆ دادەبەزێت دوورنەکەوتوەتەوە لە بواری بازرگانی و مامەڵەکان بەڵکو بەوردی چاودێری بازاڕی کردووە و سیستەمی حوسبەی داناوە بۆ پاکی و دروستی بازاڕ، و چەندین فەرموودە و حوکمی لەبارەی مامەڵە و کاری بازرگانی و داراییشەوە هەبووە.

لەو سەردەمەدا چەند مامەڵەیەکیان ئەنجامداوە کە هەمان مامەڵەی ئەم سەردەمەیە و پێغەمبەر (د.خ) بەدەقی ئایەت و فەرموودەکانی قسەی لەسەر هەبووە و حوکمەکانی بۆ ڕوون کردونەتەوە لەوانەش(٩):

١-وەبەرهێنانی ماڵ لەڕێگەی بازرگانییەوە بەشێوازی قازانجی هاوبەش(المضاربة)، وەک خوای گەورە دەفەرمێت:**[ و آخَرُونَ يَضْرِبُونَ فِي الْأَرْضِ يَبْتَغُونَ مِنْ فَضْلِ اللَّهِ]**(سورة المزمل:٢٠)

٢-قەرزدان لەسەر بنەمای سوو وەرگرتن، وەک خوای گەورە دەفەرموێت: **[قَالوا إِنَّمَا الْبَيْعُ مِثْلُ الرِّبَا وأَحَلَّ اللَّهُ الْبَيْعَ وحَرَّمَ الرِّبَا]**(سورة البقرة:٢٧٥).

٣-دروستی بابەتی سەلەم یان سەلەف (پێشین وەرگرتن) لە باخ و کشتوکاڵ و بابەتەکانی دیکەدا وەک لەم فەرمودەدا هاتووە کە ئیبن عەباس(ڕەزای خوای لێ بێت) لە پێغەمبەرەوە (د.خ) دەگێڕێتەوە:قدم النبي (ص) المدينة و هم يسلفون في الثمار السنة و السنتين فقال:(من أسلف في تمر فليسلف في كيل معلوم و وزن معلوم إلى أجل معلوم)(١٠).

ئەمانە و چەندین نمونەی مامەڵەی دیکە هەیە کە پێغەمبەر(د.خ) حوکمی خوای بەسەردا جێبەجێکردووە و خەڵکی لێ ئاگادار کردووەتەوە بە دروستی یان نادروستی مامەڵەکە.

ئەمانەش کۆمەڵێک ڕوایەت و گێڕانەوەن لە هاوەڵانەوە و لە سەرەتاکانی دەوڵەتی

ئیسلامییەوە کە باس لە چۆنیەتی کاروچالاکییەکانیان دەکات لە بواری داراییدا تایبەت بەو بابەتانە:

١. إن هند ابنة عتبة قامت إلى عمربن الخطاب فاستقرضته من بيت المال أربعة آلاف تتجر فيها و تضمنها فأقرضها فخرجت فيها إلى بلاد كلب فاشترت و باعت فلما أتت إلى المدينة شكت الوضيعة-الخسارة فقال لها عمر:( لو كان مالي لتركته لک و لكنه مال المسلمين)(١١).

٢. ماورد عن عبدالله بن الزبير أن أباه الزبير (ر.خ) كان يشترط على من يودع أمواله عنده من أجل الحفظ أن يضمن له أمواله فكان يقول الزبير:(لا ولكن هوسلف إني أخشى عليه الضيعة)(١٢).

٣. هەریەک لە زوبێری کوڕی عەوام و ئیبن عەباس(ڕەزای خوایان لەسەر بێت) کاری سەفتەجەیان ئەنجامداوە و هەریەکەیان لە مەککە و کوفە و بەسرە و شوێنیان هەبووە بۆ گۆڕینەوە و وەرگرتنی سەفتەجە(١٣) (ئەوەی کەئەمڕۆ وەک کەمبیالە و حەوالە ناسراوە)، ئیمامی بەیهەقی ڕیوایەتێک لەم بابەتەدا لە عطائی کوڕی ڕەباح دەگێڕێتەوەدەڵێت کە:(**عَبْدَ اللهِ بْنَ الزُّبَيْرِ كَانَ يَأْخُذُ مِنْ قَوْمٍ بِمَكَّةَ دَرَاهِمَ , ثُمَّ يَكْتُبُ بِهَا إِلَى مُصْعَبِ بْنِ الزُّبَيْرِ بِالْعِرَاقِ فَيَأْخُذُونَهَا مِنْهُ , فَسُئِلَ ابْنُ عَبَّاسٍ عَنْ ذَلِكَ فَلَمْ يَرَ بِهِ بَأْسًا , فَقِيلَ لَهُ: إِنْ أَخَذُوا أَفْضَلَ مِنْ دَرَاهِمِهِمْ، قَالَ: « لَا بَأْسَ إِذَا أَخَذُوا بِوَزْنِ دَرَاهِمِهِمْ »**)(١٤).

ئەم کاروچالاکییانە و چەندینی دیکە کە لە پەڕتووکەکانی زانستی فیقهی ئیسلامیی و مێژووی ئیسلامیی و شارستانیەتدا هەن و بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە جۆرێک لەو کار و مامەڵانەی ئەمڕۆ هەیە بوونیان هەبووە لە پێشتردا و مسوڵمان مامەڵەیان پێوەکردووە لە زاناکانیش قسەوباس و ئیجتیهاد و فەتوایان لەسەر داوە بە دروستی یان نادروستی، کە دواتر لە بەشەکانی دیکە بەدرێژی ڕا و سەرنجی زانایانی پێشین و هاوچەرخ لەسەر ئەو مامەڵە و کار و چالاکییانە باس دەکەین.

ب- سەرهەڵدان و قۆناغەکانی گەشەی بانکی ئیسلامی (گۆڕینەوەی هاوچەرخ) :

لە سەردەمی هاوچەرخدا گۆڕانکاریی و پێشهاتەکان زۆر و خێرا ڕوویاندا لەسەرجەم بوارەکانی ژیاندا جا کۆمەڵایەتی یان ڕۆشنبیری یان ئابووری..... هەر ئەمەش وایکرد کە بواری بازرگانی و دارایی جۆرێکی دیکە مامەڵە بەخۆیەوە ببینێت و هەنگاوی گەورە بنێت لە جۆر و چۆنیەتی و چەندێتی بازرگانی و مامەڵەکاندا، و لەوانەش دروستبوونی دراوی ئاسنی و پاشانیش دراوی کاغەزیی و ئەمڕۆش دراوی ئەلیکترۆنی و سەرهەڵدان و دروستبوونی چەندین بانک و بازاڕی دراویی و بازاڕی ئەلیکترۆنی. ئابووری ئیسلامیش لەم نێوەندەدا دوورەپەرێز و بەدەر نەبووە لەو پێشهاتانەی لە کۆمەڵگە و جیهاندا ڕوویانداوە، و جۆرێک لە جۆرەکان کاریگەر بووە بەو پێشکەوتنە و ڕاهاتووە و گونجاوە لەگەڵ گۆڕانکارییەکاندا، ئەویش بەهۆی شیاویی و گونجاویی و گەورەیی ئەحکام و ڕێساکانی ئاینی ئیسلام و مەبەستەکانییەوەیەتی.

دیارە ئەم پێشهات و گۆڕانکارییانە لە بواری ئابووریی و داراییدا بەتایبەت کە بانک و مامەڵە ڕیبەوییە و سووییەکان و نادروستەکان بڵاوبوونەوە لە کۆمەڵگەدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی کە پێویستی و داخوازیی و داواکردن بۆ دامەزراوەیەکی دارایی ئایینی زیاتر بێت بەتایبەت لە کۆمەڵگە و وڵاتە مسوڵمانەکاندا، بۆئەوەی ببێتە وەڵامدانەوەی پێداویستی و داخوازییەکانی تاک و کۆمەڵگەی مسوڵمان چ لەڕووی وەبەرهێنان یان لەڕووی دەستکەوتن و بەدەستهێنانی دراوەوە، ئەمەش کارێکی سروشتییە کە مسوڵمان بەدوای بەدیل و جێگرەوە بگەڕێت بۆ ئەو ژینگە نادروست و ناشەرعییە ئابووریی و داراییەی کە لەچواردەوریدایە و پێویستی پێیەتی، بۆیە هەنگاونرا بۆ دامەزراندنی دەزگایەکی دارایی ئیسلامی. بەرمەبنای ئەوەی باسمان کرد، ڕەوش و بزاڤی کاری بانکی ئیسلامی بە چەند قۆناغێکدا تێپەڕیوە، بەکورتی باسی ئەو قۆناغانە دەکەین:

**قۆناغی یەکەم: لەدایکبوونی بیرۆکە (قۆناغی سەرەتایی سەرهەڵدانی بانکی ئیسلامی)(١٥):**

مێژووی لەدایکبوون و سەرهەڵدانی بیرۆکەی دامەزراندن و دروستکردنی دامەزراوەی تەمویلی و کاری بانکی ئیسلامی دەگەڕێتەوە بۆ پاش ڕوخانی خیلافەتی عوسمانی لە ساڵی ١٩٢٤، کە لە دوای ئەوەوە دەوڵەتانی مسوڵمان بەرەو ڕووی تەوژمێکی سیستەمی ئابووری سوویی(ریبا) بوونەوە، بۆیە لەوە بەدواوە هەوڵدرا جێگرەوەی ئەو ئابوورییە ریباییە بدۆزرێتەوە تاوەکو ساڵی ١٩٤٠، کاتێک لە وڵاتی مالیزیا چەندین سنوقی پاشەکەوتی بێ سوو دروستبوون. هەر لەو ماوەدا لە پاکستانیش بیرکردنەوەیەکی مەنهەجی ڕێکوپێک هەبوو بۆ دانانی جۆرێک لە شێوازی دراو وەرگرتن و تەمویلی ئیسلامی و پابەند بە بنەمای شەریعەتەوە لە ئەنجامدا دامەزراوەیەکی ئیسلامی لە یەکێک لە گوندەکان دروستکرا وەک سەرەتایەک و ئەزمونێک بۆ ئەو کارە بۆ هاوکاریی و دەستگرۆیی دانیشتوانە هەژارەکەی.

**قۆناغی دووەم: قۆناغی هزریی و لێکۆڵینەوە و تیۆرەکانی بانکی:**

ئەم قۆناغەش دەستپێکی لە سەرەتاکانی سەدەی بیستەمەوە بوو ئەویش پاش ئەوەی کۆڕبەندی فیقهی زانایان و کۆڕبەندی توێژینەوەی زانستی هەستان بە لێکۆڵینەوە و گفتوگۆیەکی چڕوپڕ لە بابەت و کار و چالاکییەکانی بانکەکان بەتایبەت بانکە سووییەکان، لێرەوە چەند فەتوایەکیان دەرکرد بە قەدەغەکردن و تەحریمکردنی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەو جۆرە بانکانەدا لە بەرامبەریشدا هەندێک لە زاناکان بانگەشەی کردنەوە و دامەزراندنی بانکی ئیسلامییان دەکرد لەسەر بنەماکانی ئیسلام، ئەم بیرکردنەوە و شیکردنەوە و گفتوگۆیانە پێشکەوتنی بەرچاوی بینی بۆ بونیادنان و بناغەیەک بۆ کاری بانکی ئیسلامی، هەربۆیەش دەرئەنجامی ئەم لێکۆڵینەوە و گفتوگۆیانە ئەوەبوو لە ساڵی١٩٦٣ لە وڵاتی میسر بانکێکی ئیسلامی دروست بوو(١٦). هەر لەم ساڵانەشدا ژمارەیەکی زۆر پەڕتووک و توێژینەوەی گرنگی زانستی لەو بوارەدا لەلایەن چەندین ئابووریناسی پاکستانی و عێراقی و میسرییەوە نوسران(١٧).

**قۆناغی سێیەم: جێبەجێکردنێکی کردەیی بانکی ئیسلامی(دامەزراندنی بانکی ئیسلامی):**

تایبەتمەندی ئەم قۆناغە لەوەدا بوو زانایان و نوسەران و بیرمەندانی شەریعەتی ئیسلامی هەموویان پێکەوە هەوڵ و توانایی خۆیان خستەگەڕ بۆ دامەزراندنی بانکی ئیسلامی. هەنگاوی یەکەمیش لەم قۆناغەدا سەرهەڵدانی بانکی ئیسلامی بوو لە ساڵی ١٩٦٣ کە کۆمەڵێک بانکی نێوخۆیی بچووک دروست بوون بەناوەکانی (بانکی پاشەکەوتی نێوخۆیی)، ئەم جۆرە لە بانک هەنگاوی یەکەم و کارێکی سەرەتایی بوو لەو بوارەدا، سەرەتا لە وڵاتی میسر دروست بوو لە شاری(میت غمر) لەلایەن زانای ناوداری ئیسلامەوە(د. أحمد النجار)، کە چالاکییەکانی لە ٥٣ شوێندا بڵاوبوویەوە(١٨). پاش ئەم هەنگاوە و لە سەرەتاکانی ساڵانی حەفتای سەدەی پێشووەوە بزاڤ و ڕێڕەوی کاری بانکی ئیسلامی بە دامەزراندنی چەند بانکێک لە چەند وڵاتێکی ئیسلامیدا دەستیپێکرد، لەوانەش(١٩):

١. بانکی (ناصر الإجتماعی) ساڵی ١٩٧١ لە وڵاتی میسر دامەزراوە:

ئەم بانکە بەیەکەم بانک دادەنرێت کە لە یاساکانی دامەزراندنیدا بەڕوونی ئەوەی دانابێت کە بەهیچ شێوەیەک مامەڵە بەسووەوە ناکات، خاوەندارێتی ئەم بانکە دەگەڕایەوە بۆ دەوڵەت.

٢. بانکی (الإسلامي للتنمية) ساڵی ١٩٧٥ لە وڵاتی سعودیە دامەزراوە.

٣. بانکی(دبي الإسلامي)ساڵی ١٩٧٥ لە وڵاتی ئیمارات دامەزراوە.

دامەزراندنی ئەم جۆرە بانکانە بە وەرچەرخانێکی ئابووری گرنگ دادەنرا لەوکاتەدا کە توانرا هاوکار و بەشداربوویەکی باش و چالاک بن بۆ هێنانەدیی و پیادەکردنی بنەماکانی ئیسلام لە کاروچالاکییەکانیاندا و یارمەتیدەری باشیش بوون بۆ گەشەی ئابووریی و کۆمەڵایەتی لەوکاتەدا لەڕێگەی وەبەرهێنان و گرێبەست و پێدانی قەرزی حەسەنە و چالاکییەکانی دیکە بانکەوە، لەلایەکی دیکەوە ئەم بانکانە بوونە هەوێن و بناغەیەکی زۆرباش بۆ فراوانکردن و گەشە و پەرەپێدانی کاروچالاکی و مامەڵەکانی بانکی ئیسلامی لە وڵاتەکانی دیکەدا.

**قۆناغی چوارەم: قۆناغی فراوانکردن و پێگەشتن و بڵاوبوونەوە:**

لەم قۆناغەدا بانکە ئیسلامییەکان توانیان چ لەڕووی فیکر و نوسینەوە و چ لەڕووی فراوانکردنی کار و دامەزراندنەوە هەنگاوی زۆر گەورە و چالاکانە بنێن لەسەر ئاستی وڵاتە ئیسلامییەکان بەتایبەتی و وڵاتانی دیکی جیهان بەگشتی.

لەم قۆناغەدا لە چەند تەوەرێکەوە کاری گرنگ کرا لەسەر بانکی ئیسلامی، لەوانە:

١. لەڕووی مەنهەج و پرۆگرامی کار و پیشەیی بانکی ئیسلامییەوە.

٢. لەڕووی کارگێڕیی و بەڕێوەبردن و ستافی بانکەکانەوە.

٣. لەڕووی مامەڵە و گرێبەستەکانەوە: کە چەندین گرێبەست و مامەڵەی نوێ چووە نێو بانکی ئیسلامییەوە، لەوانەش (المرابحة المضاربة المشاركة الإجارة المنتهية بالتمليك)و چەندینی دیکە.

٤. لەڕووی وەربەرهێنان و سەوداکاران و خزمەتگوزارییەوە.

٥. لەڕووی جێبەجێکردنی بنەماکانی شەریعەتی ئیسلام و چاودێریکردنی کار و

چالاکییەکانەوە لەلایەن دەستەیەکی شەرعی و زانستییەوە.

٦. بەرفراوانکردنی کاروچالاکییەکان لە وڵاتانی دیکە بەتایبەت لە ئەوروپا.

٧. کردنەوەی پەنجەرەی بانکی ئیسلامی لە بانکە سووییەکاندا: واتە بەشێکی تایبەت دادەنرا لە بانکێکی سوویدا بۆ کاروچالاکییەکانی بانکی ئیسلامی بۆ ئەو کەسانەی خوازیارن مامەڵە و سەودا لەگەڵ بانکی ئیسلامیدا بکەن، ئەمانەش زیاترن لە وڵاتانی ئەووروپا و ئەمریکادا سەریهەڵدا، لەو بانکانەش هەستاون بەم کارە بانکی سیتی بانک ولویدز چەندینی دیکە.

**ناوی هەندێک لەو بانکانەش کە لە سەرەتاوە دروستبوون دەخەینە ڕوو(٢٠):**

أ- بانکی فیصل الإسلامي السوداني: ساڵی ١٩٧٧ لە وڵاتی سودان دامەزراوە.

ب- بانکی فیصل الإسلامي المصري: ساڵی ١٩٧٧ لە وڵاتی میسر دامەزراوە

ت- ماڵی التمویل الکویتي: ساڵی ١٩٧٧ لە وڵاتی کویت دامەزراوە.

ث-بانکی الإسلامي الأردني للتمویل و الاستثمار: ساڵی ١٩٧٨ لە ئوردن دامەزراوە.

ج-بانکی الإسلامي الدولي للاستثمار و التنمیة: ساڵی ١٩٨١ لە میسر دامەزراوە.

ح- بانکی قطر الإسلامي: ساڵی ١٩٨٢ز لە قەتەر دامەزراوە .

خ- بانکی فیصل الإسلامي البحریني: ساڵی ١٩٨٣ لە بەحرەین دامەزراوە.

د- بانکی البرکة الإسلامي: ساڵی ١٩٨٤ز لە بەحرەین دامەزراوە.

ذ- بانکی العراقي الإسلامي: ساڵی ١٩٩٢ لە عێراق دامەزراوە.

ر- بانکی الإسلامي التایلندي: ساڵی ١٩٩٤ لە وڵاتی تایلەند دامەزراوە.

ز- بانکی التضامن الإسلامي الدولي: ساڵی ١٩٩٥ لە یەمەن دامەزراوە.

س- بانکی العربي الإسلامي الدولي:  ساڵی ١٩٩٧ دامەزراوە.

**قۆناغی پێنجەم: فراوانی بڵاوبوونەوەیی و بەجیهانیکردنی:**

ئەم قۆناغەش بەشێوەیەکی فراوان بانکی ئیسلامی تیایدا گەشەی کرد و بەشێوەیەکی بەربڵاو و فراوان لەناو و وڵاتانی جیهاندا بڵاوبوویەوە کە لە ساڵی ٢٠٠٠ دەستپێدەکات تاوەکو ئەمڕۆ، کە دەتوانین بڵێین ئێستا ژمارەی دامەزراوە داراییە ئیسلامییەکان زیاتر لە ٢٠٠٠ دامەزراوە و بانکیی و دارایی دەزگای ئابووری تێپەڕاندووە لە ئاستی جیهاندا، لە ئاستی وڵاتە عەرەبیەکاندا زیاتر لە ١٧٠ بانکی ئیسلامی تێپەڕاندووە(٢١). ئەمانە هەندێک لەو بانکانەن کە لە قۆناغی چوارەمی گەشەی بانکە ئیسلامییەکاندا سەریانهەڵدا و دامەزراون، بەڵام ئەمانە ئەو ڕێچکە و پەیڕەو بنەما و ڕێگایەیان بڕی کە پێویست بوو وەک سەرەتایەک بوونی هەبێت لە هەر بانکێکی ئیسلامیدا، ئەم گەشەسەندن و فراوانبوونە بەردەوامە و هەتا ئێستاش کردنەوەی بانکی ئیسلامی بەردەوامی هەیە و ڕۆژ لەدوای ڕۆژ مامەڵە و کارکردن لەگەڵ ئەم دامەزراوە داراییەدا زیاد دەبێت لەلایەن سەوداکار و خاوەن پڕۆژە و ساماندارانەوە. هەرچەندە ئەم بانکانە لە ماوەیەکی کەمدا سەریانهەڵدا وەک دامەزراوەیەکی نوێ، بەڵام جێگە و پێگەیەکی گەورە و کاریگەریان هەبوو لەسەر ئاستی ناوخۆیی و نێودەوڵەتیدا لە بواری ئابووریی و بازاڕی کار و پیشەسازی بانکیدا.

## سەرچاوەکان


- پاش قورئانی پیرۆز.

١ دور المصارف الإسلامية في الحد من تداعيات الأزمة المالية العالمية (دليل المصارف الإسلامية الأردنية): د.حسني على خريوش، و رقة عمل مقدمة إلى المؤتمر العملي الدولي الرابع،كلية الإقتصاد و العلوم الإدارية-جامعة الكويت،٢٠١٠م : ١٦.

٢ اتفاقية إنشاءالاتحاد الدولي للبنوك الإسلامية: مطابع الاتحاد الدولي للبنوك الإسلامية، الاتحاد الدولي للبنوك الإسلامية- مصر الجديدة- القاهرة/١٩٧٨: المادة: ٥: ٥٣.

٣ المصرفية الإسلامية الميلاد و النشاة و التطور: د.سمير رمضان الشيخ،ورقة عمل /٢٠١١م، موقع موسوعة الاقتصاد و التمويل الاسلامي http: //iefpedia.com/arab: ١١.

٤ البنوك الإسلامية و دورها في التنمية الاقتصادية: فاطمة عبدللي و فطيمة عماري، مذكرة تخرج لنيل شهادة ليسانس علوم اقتصادية، المركز الجامعي يحي فارس-بالمدية، معهد علوم التسيير-قسم علوم اقتصادية-فرع نقود بنك و مالية،٢٠٠٥-٢٠٠٦م: ٧.

٥ سەیری: المصارف الإسلامية مقررات لجنة بازل- تحديات العولمة-استراتيجية مواجهتها ، أحمد سليمان خصاونة، عالم الكتب الحديث و جدارا للكتاب العالمي-الأردن،ط١/٢٠٠٨م:٦١ ، عبدالرحمن يسري أحمد: دور المصارف الإسلامية في تعبئة الموارد المالية للتنمية، بحث مقدم في ندوة البنوك الإسلامية و دورها في تنمية اقتصاديات المغرب العربي- البنك الإسلامي للتنمية،١٨-٢يونيو١٩٩٠ م : ١٢٩.

٦ الضوابط الشرعية للعقود المصرفية الإسلامية- دراسة مقارنة مقاصدية، هاشم عمر أحمد، أطروحة دكتوراه غير منشورة، ٢٠١٤، هەروەها سەیری: بيع المرابحة في البنوك الإسلامية مع دراسة حالة بنك البركة الجزائري-وكالة البليدة- محمد قصير و شعيب عياش، مذكرة تدخل ضمن متطلبات نيل شهادة الليسانس في العلوم الاتصادية - تخصص نقودبنوك و مالية، وزارة التعليم العالي و البحث العلمي- المركز الجامعي -يحيى فارس-معهد علوم التسيير،دائرة علوم الاقتصادية بالمدية، ٢٠٠٦م: ٤، و البنوك الإسلامية: فليح حسن خلف، عالم الكتاب الحديث و جدارا للكتاب العالمي- عمان، ط١/ ٢٠٠٦: ٩٢-٩٣، الفروق الجوهرية بين المصارف الإسلامية و المصارف الربوية: سامر مظهر قنطقجي، شعاع للنشر و العلوم - سورية، ط ١ /٢٠٠٧م: ١٥-١٧،و مجلة الإيمان:مكتبة الإيمان،العراق- أربيل، السنة ١٢ /ع ٢٠١١،٤٥م: ١٥١-١٦٠.

٧ هاشم عمر أحمد، سەرچاوەی پێشوو.

٨ السيرة النبوية لابن هشام:عبد الملك بن هشام بن أيوب الحميري المعافري، أبو محمد، جمال الدين (المتوفى: ٢١٣هـ)، ت:مصطفى السقا وإبراهيم الأبياري و عبد الحفيظ الشلبي،شركة مكتبة و مطبعة مصطفى البابي الحلبي و أولاده بمصر ، ط ١٩٥٥/٢م: ١ / ٥٦ .

٩ أصول المصرفية الإسلامية وقضايا التشغيل: الغريب ناصر، توزيع دار أبوللو للطباعة و النشر- القاهرة، ط١٩٩٦/١م :٦-١٠.

١٠رواه مسلم فى صحيحه: صحيح مسلم، مسلم بن الحجاج أبوالحسين النيسابوري، دار إحياء التراث العربي–بيروت، ت: محمد فؤاد عبد الباقي،:كتاب المساقاة، باب السلم، رقم (١٦٠٤) : ٣/ ١٢٢٦.

١١ تاريخ الأمم و الرسل و الملوك المشهور بـ( تأريخ الطبري): الطبري(أبو جعفر محمد بن جرير، ت- ٣١٠هـ)، دار الكتب العلمية- بيروت: ٢ / ٥٧٦- ٥٧٧.

١٢ الطبقات الكبرى: ابن سعد(أبو عبدالله محمد بن سعد بن منيع،ت–٢٣٠هـ)، ت: إحسان عباس، ط١٩٦٨/١م، دار صادر–بيروت: ١٠٨/٣.

١٣ الطبقات الكبرى، سەرچاوەی پێشوو:١١٠/٣، والمبسوط: السرخسي محمد بن أحمد بن أبي سهل (ت: ٤٨٣هـ)، دار المعرفة–بيروت، ١٩٩٣م: ٣٧/١٤.

١٤رواه البيهقى فى السنن الكبرى: أحمد بن الحسين بن علي ، أبو بكر البيهقي(ت:٤٥٨هـ)، ت: محمد عبد القادر عطا، دار الكتب العلمية- بيروت،ط٣ / ٢٠٠٣م، كتاب البيوع، باب ماجاء فى السفاتج ، رقم (١٠٩٤٧):٥ / ٥٧٦ .

١٥سەيرى:المصارف الإسلامية الأسس النظريةوالتطبيقات العملية:محمود حسين الوادي و حسين محمد سمحان،دار المسيرة–عمان، ط٣/ ٢٠٠٩م :٤٢ ، ودورالمصارف الإسلامية في تعبئة الموارد المالية للتنمية: ٨٨، وإدارة الموجودات/ المطلوبات لدى المصارف التقليدية و المصارف الإسلامية- دراسة تطبيقية مقارنة: عمر محمد فهد شيخ عثمان، أطروحة دكتوراه في العلوم المالية و المصرفية - تخصص المصارف–جامعة دمشق–سوريا،٢٠٠٩ م: ٢٠، والرقابة الشرعية على أعمال المصارف الإسلامية: ١١، ونشأة و تطور البنوك الإسلامية: د.عزالدين خوجة، بحث مقدم لمؤتمر المصارف الليبية و الصيرفة الإسلامية -طرابلس من ٧ –١٠ / ٦ / ٢٠٠٩ م: ٢٧١.

١٦البنوك الإسلامية بين النظرية و التطبيق، فؤاد الفسفوس، كنوز المعرفة – الأردن، ط١ /٢٠١٠م :٤٩-٥٢.

١٧ لەو زانایانەش کە بەشداربوون لە نووسین و بڵاوکردنەوەی توێژینەوە و پەڕتووکدا لەبارەی دامەزراندنی بانکی ئیسلامیەوە: محمد عزيز، حول(الاطار العام للبنوك بلافوائد) سنة(١٩٥٥=١٩٥٨م)، ومحمد حميد الله حول (اقتراح بإنشاء صندوق نقد اسلامي) عام ١٩٥٨، وأحمد النجار عام ١٩٦٠م و محمد عبدالله العربي من علماء مصر حول (المعاملات المصرفية المعاصرة ورأي الإسلام فيها، والمعاملات المصرفية المعاصرة و النظرية الاسلامية) و محمد باقر الصدر بالعراق عام ١٩٦١م. قراءة تأريخية في تطور العمل بالصيرفة الإسلامية في دول المغرب العربي: لخديمي عبدالحميد و بخيت حسان، ورقة بحثية في الملتقى الدولي الأول: الاقتصاد الاسلامي: الواقع ورهانات المستقبل- المركز الجامعي بغرداية - المغرب ،٢٣-٢٤ /٢/ ٢٠١١م ، متاح في العنوان الألكتروني: http: //iefpedia.com/arab /: ٥-٦.

١٨سەيرى:المصارف الإسلامية دراسة علمية فقهية للممارسات العملية: د.عايد فضل الشعراوي، دار البشائر الإسلامية: ٧٥-٧٦، و المصارف الإسلامية: الأسس النظرية و التطبيقات العملية: ٤٢-٤٣.

١٩ المصارف الإسلامية المعاصرة، عبدالحق عيفة، البدرالساطع للطباعة، ط١/ ٢٠٢١: ٧٨ ومابعدها.

٢٠ سەرچاوەی پیشوو: ٨٣-٨٤.

٢١ سەرچاوەی پیشوو: ٨٥.



# ئابووری

## بیبلیۆگرافیا و پێڕستی لە پڕۆژەی (کورد و کوردستان- بیبلیۆگرافیا و پێڕستیان لە کتێبی کوردیدا ١٩٢٠ -٢٠١٠)

**ئامادەکردن: بوار نوورەدین**

........................................................................................

ئەم بیبلیۆگرافیا تایبەتییە، کەڵکی لە پڕۆژەی بیبلیۆگرافیا کورد و کوردستان وەرگرتووە، کە ٥٦٨٠ کتێبی تێدا ناسێنراوە و لە ٥٢٠٦ لاپەڕە پێکهاتووە و بەسەر ١٢ بەرگ و بەشدا دابەشکراون، تایبەت کراوە بەو کتێبانەی لە نێوان ساڵانی ١٩٢٠- ٢٠١٠دا، لەبارەی «کورد و کوردستان»ەوە نووسراون، کتێبی نووسراوی بە هیچ زمانێکی تر لەخۆنەگرتووە.

کتێبەکان بە دوو ئاڕاستە خراونەتەڕوو، باری «ناسنامە»ی کتێبەکان: ناوی نووسەر، وەرگێڕ –ئەگەر هەبوو-، دەزگای چاپ، چاپخانە، نۆبەتی چاپ، شوێنی چاپ، ساڵ، ژمارەی لاپەڕە و پێوانە. دووەم ئاڕاستە، جگە لە ناونیشانی کتێبەکە، ناوەرۆکی کتێبەکان نووسراونەتەوە، بۆئەوەی (لێکۆڵەر، خوێنەر، بەکاربەر) بزانێ کتێبەکە باسی چی دەکات.

لەم بیبلیۆگرافیایەدا، هەروەک تەواوی پڕۆژەکە، کتێبەکان بە پێی ساڵ و لە هەر ساڵێکیشدا، بە پێی «تیپ»ەکانی زمانی کوردی ڕیزکراون، ناونیشانی کتێبەکانیش، وەک خۆیان نووسراونەتەوە.

**کورتکراوەکان:**

پ.: پێوانە (بە سانتیمەتر و «پانی»ی پێش «درێژی»ی نووسراوە)

چاپ.: نۆبەتی چاپ

چ.: چاپخانە

ژ.: ژمارە

ژ.س.: ژمارەی سپاردن

ز.: زانکۆ

س.: ساڵ

ش.: شوێن

کۆڕ.: چاپخانەی کۆڕی زانیاریی کورد

ل.: لاپەڕە

و.: وەزارەت

ی.ن.ک.: یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان

؟: بۆ هەر زانیارییەکی نەزانراو و نادیار دانراوە

ISBN: International Standard Book Number ژمارەی جێگیری نێودەوڵەتیی کتێب

## تەوەرەی دووەم: پێڕستی (ئابووری) لە ناوەڕۆکی کتێبی کوردیدا ١٩٥٨- ٢٠١٠

### بەشی سێیەم: کتێبی ساڵانی ٢٠٠٧- ٢٠١٠

**١- ئایندەی بارودۆخی ئاسایش لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا**

نووسین: نوورا بێنساهیل- دانیاڵ ل. بیمان

وەرگێڕانی لە ؟: مەروان کاکل- هێمن غەنی

بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ.: یەکەم، چ.: ئاراس، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٤٠٠، س.: ٢٠٠٧، ل.:٥١١، پ.:١٥×٢١

ناوەڕۆک: بەشی سێیەم: چاکسازیی ئابووری لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا- ڕووبەڕووبوونەوەی دەسەڵات.

تێبینی: لەسەر بەرگ بەم شێوەیە و لە یەکەم لاپەڕە و ناسنامەشدا، ناونیشانی کتێبەکە بەم شێوەیە نووسراوە: ئاییندەی ئاسایشی نەتەوەیی لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

**٢- بنەمایێن جوگرافیا گشتی و جوگرافیا کوردستانێ- جوگرافیا مرۆڤی**

نووسین: نەشوان شوکری هرۆری

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیریز

چاپ: دووەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٨٠، س: ٢٠٠٧، ل:٣٢، پ:٢١×٢٩

ناوەرۆک: چار: جوگرافیا ئابووری.

تێبینی: ناوەرۆکی چاپی یەکەم و دووەم جیاوازییان هەیە.

**٣- بەرکۆڵێک لە مێژووی کورد و کوردستان**

نووسین: سەعید مەموزینی

چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٤، س: ٢٠٠٧، ل:٢٧٩، پ:١٧×٢٣

بەشی دووەم: جوگرافیای کوردستان/ ئاووهەوا و ڕووبارەکانی کوردستان/ چیاکانی کوردستان/ ئابووریی کوردستان.

**٤- پەیوەندییە سیاسییەکانی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا ١٩٩١- ١٩٩٨**

نووسین: هێرش عەبدوڵڵا حەمەکەریم

بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٠٣١، س: ٢٠٠٧، ل:٢١٦، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: بنەماکانی پەیوەندی نێوان هەرێمی کوردستان و تورکیا... ئابووری.

**٥- جولەکەکانی شاری سلێمانی- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- سیاسییە**

نووسین: بەرزان ئەحمەد کوردە

بڵاوکراوەی مەکتەب ڕێکخستن- بەشی ڕووناکبیریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٤٧، س: ٢٠٠٧، ل:٧٢، پ:١٥×٢٠

ناوەرۆک: بەشی چوارەم: باری کۆمەڵایەتی و چالاکییە ئابووری و سیاسییەکانی جوولەکەکانی سلێمانی.

**٦- چەند لاپەڕەیەک لە مێژووی گەلی کورد لە ڕۆژهەڵاتی کوردستان- بەرگی یەکەم**

نووسین: د.یاسین سەردەشتی

چاپ: یەکەم، چ: سیما، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٤١، س: ٢٠٠٧، ل:٢٩٢، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: کورتە مێژوویەکی هەلومەرجی ئابووریی و کۆمەڵایەتیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە سەرەتای سەدەی بیسەمدا/ سەرنجێک لە هەلومەرجی سیاسی و ئابووری و کۆمەڵایەتیی ڕۆژهەڵاتی کوردستان لە ساڵانی ١٩٣٠- ١٩٣٩.

**٧- خوو پێوەگرتن بە ماددە هۆشبەرەکان**

نووسین: فائیز ئیبراهیم محەممەد

بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی

چاپ: یەکەم، چ.: خانی، ش.: دهۆک، ژ.س.: ١٣٧٤، س.: ٢٠٠٧، ل.:٨٦، پ.:١٦×٢٢

ناوەرۆک: ئاسەواری ئابووری.

**٨- ڕۆژنامەگەری تایبەتمەند- گرنگترین بوارەکانی ڕۆژنامەگەری کوردیی تایبەتمەند ١٩١٤- ١٩٩١**

نووسین: کاروان عەلی

بڵاوکراوەی مەکتەبی ناوەندی ڕاگەیاندنی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ.: شەهید ئازاد هەورامی، ش.: کەرکووک، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٧، ل.:١٦٠، پ.:١٧×٢٤

ناوەرۆک: بواری کرێکاران/ بواری ئابووری.

**٩- شاری کەرکوک ١٩١٧- ١٩٢٦ توێژنەوەیەکی مێژوویی سیاسییە**

نووسین: پشکۆ حەمەتاهیر عەبدولڕەحمان ئاغجەلەری

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ.: حەمدی، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ٥٥، س.: ٢٠٠٧، ل.:٣٩٢، پ.:١٧×٢٤

ناوەرۆک: بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری و تەندروستی شاری کەرکووک.

**١٠- فەرهەنگی مێژووی کورد**

نووسین: مایکڵ گەنتەر

وەرگێڕانی لە ؟: مامکاک

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ.: ئاراس، ش.: هەولێر، ژ.س.: ١٤٠٠، س.: ٢٠٠٧، ل.:٣١٩:١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەرکوڵ (لێرەدا هاتووە: ئەم فەرهەنگە مێژووییەی کورد، بە زۆری سەربەندە مێژوویی و سیاسییەکانی لە خۆگرتووە و پتر بایەخ بە بابەتەکانی ئێستا دەدات. لەگەڵ ئەمەشدا، هەوڵم داوە ناو و ڕووداوە هەرە گرینگەکانی پێشتریشی تێدا باس بکەم، جگە لەمەش، هەندێ بابەتی کولتووری و ئابووری و کۆمەڵایەتیشم تێدا باس کردووە...).

**١١- کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر ڕۆژنامەوانیی کوردی ١٩٦١- ١٩٧٥**

نووسین: ئازاد عوبێد ساڵح

چاپ: یەکەم، چ.: و. ڕۆشنبیری، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٣١٨، س.: ٢٠٠٧، ل.:٣٩٢، پ.:١٧×٢٣

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: کاریگەریی شۆڕشی ئەیلوول لەسەر پێشخستنی ڕۆژنامەوانیی کوردی لە باشووری کوردستاندا ١٩٦١- ١٩٧٠/ بواری ئابووری/ بواری ئابووری و کۆمەڵایەتی/ بەشی دووەم: کاردانەوەی ڕێککەوتننامەی ١١ی ئادار لەسەر ڕۆژنامەوانیی کوردی لە ١٩٧٠- ١٩٧٤/ بواری ئابووری.

**١٢- کورد لە عێراق**

نووسین: کەریم یەڵدز

وەرگێرانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: شاهۆ بورهان

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی خانەی وەرگێڕان

چاپ: یەکەم، چ: کارۆ، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٢٣، س: ٢٠٠٧، ل:٤١٤، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: کێشە ئابوورییەکان.

**١٣- کوردستان لە بازنەی کێشەی ڕۆژهەڵاتیدا ١٨٠٠- ١٩٠٠ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی**

نووسین: کامەران محەممەد حاجی

بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسیی و چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٤، س: ٢٠٠٧، ل:٣٢٢، پ:١٦×٢٣

ناوەرۆک: بەرژەوەندییە: ئابوورییەکان- سیاسیی و سەربازییەکان- ئاینییەکان.

**١٤- کەرکوک لە سەردەمی دەوڵەتی عوسمانیدا لە نێوان ساڵانی ١٨٧٦- ١٩٠٩ز**

نووسین: گۆران ئیبراهیم ساڵح

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٠، س: ٢٠٠٧، ل:٢٢٦، پ:١٥×٢١

ناوەرۆک: بەشی سێیەم: ڕەوشی خوێندن و فەرهەنگی و ئابووریی شاری کەرکووک/ ڕەوشی ئابووریی شاری کەرکووک.

**١٥- کەرکوک و بزاڤی شیعری کوردی- لێکۆڵینەوە و هەڵسەنگاندن**

نووسین: د.محەممەد ئەحمەد سەعید (کەساس جەباری)

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ٨٧٤، س: ٢٠٠٧، ل:٣٦٩، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: ئاوڕێکی خێرا لە بارودۆخی کەرکووک- لێکۆڵینەوەیەکی هەمەلایەنە/ باری جوگرافیایی- ئابووری.

**١٦- گوندی گردەزبێر- شارباژێڕی سەخت**
ئامادەکردن: دەستەیەک لە گەنجانی گردەزبێر
کۆکردنەوە: نەوزاد محەممەد ئەحمەد
چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ٥٣٠، س: ٢٠٠٧، ل: ١٩٠، پ: ١٦×٢٢
ناوەڕۆک: ئابووریی گردەزبێر.

**١٧- مێژوونامە لە ١-١-٢٠٠١ تاکو ١-٦-٢٠٠٦ بەرگی یەکەم**
نووسین: عەلی کەندی
چاپ: یەکەم، چ: و. پەروەردە، ش: هەولێر، ژ.س: ٤٢: ٢٠٠٧، ل: ٩١٧: ق: ١٧×٢٤
ناوەڕۆک: دەسپێک: (لێرەدا نووسراوە: ئەوەی دەیخەمە بەردەستان کارێکی مێژوویی گرنگە لە مێژووی ڕووداوەکانی کورد و کوردستان و گەلانی جیهان لە ١-١-٢٠٠١ تاکو ١-٦-٢٠٠٦ بەپێی قۆناغە تێپەڕبووەکانی پەرەسەندن و پێشکەوتن و گەشەکردن لە هەموو بوارە جیاجیاکانی نەتەوەیی و نیشتیمانی و ڕامیاریی و ئابووریی و سەربازیی و زمان و مێژوو و کەلتوور و دابونەریت و شوێنەوار و شارستانییەت...).

**١٨- میرعەبداڵ خانی بدلیس (١٦٠٥- ١٧٠١) بلیمەتێکی فەرامۆشکراو لە مێژووی** کورددا
نووسین: بوار نوورەدین
بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)
چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٥٠، س: ٢٠٠٧، ل: ٢٣٢، پ: ١٣×٢١
ناوەڕۆک: تەوەرەی سێیەم: چوارچێوەی سیاسی/ پێکهاتەی سەربازی/ سنووری میرنشینەکە/ بواری ئابووری و شارستانی.

**١٩- میرعەبدال خانی بدلیس بلیمەتێکی فەرامۆشکراو لە مێژووی کورددا**
نووسین: بوار نوورەدین
چاپ: دووەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٦٥٠، س: ٢٠٠٧، ل: ١٦٠، پ: ١٦×٢٤
ناوەڕۆک: هەمان ناوەڕۆکی چاپی یەکەمی هەیە، بە کەمێک زانیاریی زۆرترەوە، بڕوانە کتێبی پێش خۆی ژمارە ١٨.

**٢٠- یاداشتنامەی ژیانم**
نووسین: جەمال بابان
بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی چاپ و بڵاوکردنەوەی سلێمانی
چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٣٠، س: ٢٠٠٧، ل: ٣٩٦، پ: ١٦×٢٢
ناوەڕۆک: باری ئابووری- قەرەداغ.

**٢١- یەكێتیی نیشتمانیی كوردستان و چۆنیەتی گەشەكردنی هەمیشەیی**

نووسین: هیوا سەرهەنگ

چاپ: ؟، چ: ؟، ش: هۆڵەندا، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٧، ل:٢٨، پ:١٢×١٧

ناوەرۆک: ئابووری.

**٢٢- ئازادی، سەربەخۆیی، میری و گەورەیی- داوا بکەن بە زار و زمان و ددان و لێو- ژیان و شێعرە کوردییەکانی سەیفولقوزاتی قازی** (١٩٤٥- ١٨٧٦)

نووسین: سەیفولقوزاتی قازی

ئامادەکردن: ئەنوەری سوڵتانی و حەسەنی قازی

بڵاوکراوەی بنکەی ژین

چاپ: ؟، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٧٢٨، س: ٢٠٠٨، ل:٤٢٣، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: بانگەواز بۆ دانانی ژێرخانێکی ئابووریی بەهێز بۆ کوردستان.

**٢٣- ئەحمەدی خانی ١٦٥٠-١٧٠٧ شاعیر و بیرمەند فەیلەسوف و سۆفی**

نووسینی بە زمانی عەرەبی و وەرگێڕانی بۆ زمانی کوردی: پ.د.عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ

بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)

چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥٢٥، س: ٢٠٠٨، ل:٥٣٢، پ:١٧×٢٣

ناوەرۆک: باری سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی کوردستان لە سەردەمی خانیدا.

**٢٤- ئەندازیاریی خانووبەرەی لادێکانی کوردستان**

نووسین: عەبدولجەبار مستەفا باخەوان (ئەندازیاری تەلارسازی)

بڵاوکراوەی ناوەندی چاپەمەنی و ڕاگەیاندنی خاک

چاپ: دووەم، چ: خاک، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٢٧٠، س: ٢٠٠٨، ل:٩٨، پ:١٨×٢٧

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: کورتە مێژوویێکی کوردستان- باری ئابووری/ بەشی سێیەم: گوند لە کوردستاندا- باری کۆمەڵایەتی و ئابووریی دانیشتوانی لادێ.

**٢٥- تاڤگەی هەقیقەت- بەشێک لە بەرهەمەکانی دکتۆر قاسملوو- بەرگی یەکەم**

کۆکردنەوە: کاوە بەهرامی

چاپ: دووەم، چ: ؟، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٨، ل:٣٨٦، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: فەسڵی دووەم: ئابووریی سیاسی.

**٢٦- تەوژمی ئیسلامی و عەلمانی- خاڵە هاوبەش و جیاوازەکانیان**

نووسین: عەلی باپیر

بڵاوکراوەی نووسینگەی تەفسیر

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: هەولێر، ژ.س: ١٣٥، س: ٢٠٠٨، ل:٣٣٥، پ:١٧×٢٣

ناوەڕۆک: ئاڵقەی پێنجەم: لە بواری ئابووریی و ژیان و گوزەراندا.

**٢٧- جیۆگرافیای باشووری کوردستان**

نووسین: د.عەبدوڵلا غەفوور

بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥١٤، س: ٢٠٠٨، ل:٣٦٩، پ:١٧×٢٤

ناوەڕۆک: بەشی سێیەم: جیۆگرافیای ئابووری.

**٢٨- خوێندنەوەی کۆمەڵگەی کوردی- دوای ڕاپەڕین**

نووسین: حەمەی ئەحمەد ڕەسووڵ

بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆمان، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥٣٦، س: ٢٠٠٨، ل:٢٢٢، پ:١٦×٢١

ناوەڕۆک: بەشی چوارەم: ڕەوشی ئابووری.

**٢٩- دابەشبوونی دانیشتوانی شاری هەولێر**

نووسین: فاتیمە قادر مستەفا

بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٣٦٣، س: ٢٠٠٨، ل:١٨٤، پ:١٧×٢٤

ناوەڕۆک: بەشی چوارەم: ئەو فاکتەرانەی کاردەکەنە سەر دابەشبوونی دانیشتوان/ فاکتەری مێژوویی/ فاکتەرە ئابوورییەکان/ پیشەسازی/ گواستنەوە و بازرگانی/ نرخی زەوی/ بەرزی ئاستی گوزەرانی تاک.

**٣٠- ڕۆژنامەوانیی کوردی سەردەمی کۆماری دیمۆکراتی کوردستان ١٩٤٣- ١٩٤٧**

ئامادەکردن: د.هیمداد حسێن

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان

چاپ: یەکەم، چ: گرین گالۆری، ش: لوبنان، ژ.س: ١٦٨٤، س: ٢٠٠٨، ل:١١٥٠، پ:١٧×٢٤

ناوەڕۆک: فەسڵی یەکەم: مێژووی ئابووری و سەربازی و پەروەردە و فەرهەنگی و دیموکراسی.

تێبینی: بۆ نۆبەتی چاپ (یەکەم) نووسراوە و چاپێکی تریشی هەیە؟ بۆ زانیاریی زۆرتر بڕوانە کتێبی ژمارە ٩٣.

**٣١- ڕەهەندە کۆمەڵایەتییەکانی ناسەقامگیریی سیاسی لە هەرێمی کوردستاندا**
نووسین: ڕۆزە عەبدوڵڵا شەریف
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ١٥٩١، س: ٢٠٠٨، ل:٣١١، پ:١٧×٢٣
ناوەرۆک: بەشی چوارەم: ... ڕەهەندە ئابوورییەکان.

**٣٢- سەردەمی تەنزیمات ١٨٣٩- ١٨٧٨**
نووسین: پۆل دۆمۆن
وەرگێڕانی لە زمانی فرەنسییەوە: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوە ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٤١٤، س: ٢٠٠٨، ل:١٦٦، پ:١٥×٢١
ناوەرۆک: پەرەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

**٣٣- صەلاحەدینی ئەیووبی**
نووسین: د.عەلی محەممەد سەلابی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: جەمیل قادر
بڵاوکراوەی پرۆژەی ١٠٠ کتێبی کوردی
چاپ: یەکەم، چ: دار الفکر، ش: بیروت، ژ.س: ٢٣٢٧، س: ٢٠٠٨، ل:٧٧٥، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: چاکسازی ئابووری و بوارەکانی خەرجی.

**٣٤- شارەزوور و لوڕستانی باکوور لە سەدەکانی ناوەڕاستدا- لێکۆڵینەوەیەکی (مێژوویی و شارستانی)یە**
نووسین: د.حوسامەددین عەلی غالیب نەقشبەندی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: ڕەنج ئەبوبەکر محەممەد
بڵاوکراوەی مەکتەبی بیر و هۆشیاریی (ی.ن.ک.)
چاپ: یەکەم، چ: حەمدی، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٥٢٣، س: ٢٠٠٨، ل:٥٨٠، پ:١٦×٢٣
ناوەرۆک: بەندی چوارەم: میرنشینی بەنو عەننازی شازنجانی/ بەندی پێنجەم: لایەنی شارستانی/ یەکەم: سیستمەکانی حوکمڕانی/ دووەم: باری ئابووری.

**٣٥- شاری سلێمانی ١٩٣٢- ١٩٤٥ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی- سیاسییە**
نووسین: د.ئاکۆ عەبدولکەریم شوانی
بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی
چاپ: یەکەم، چ: تیشک، ش: سلێمانی، ژ.س: ٥٥٨، س: ٢٠٠٨، ل:٢٧٦، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: باردۆخی شاری سلێمانی دوای بە ئەندام وەرگرتنی عێراق لە کۆمەڵەی گەلاندا/ بارودۆخی ئابووری/ ڕەوشی ئابووریی سلێمانی لە ساڵانی دووەم جەنگی جیهانیدا.

**٣٦- شیعری فێرکردن لە ئەدەبی کوردیدا- نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم**
نووسین: ئەحمەد قەرەنی
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ١٥٨١، س: ٢٠٠٨، ل:٢٠٨، پ:٢٣×١٦
ناوەرۆک: باری ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیریی کوردستان/ لە ڕووی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسییەوە.

**٣٧- کورتە دوانێک لەسەر مەسەلەی نەتەوایەتی**
نووسین: د.موکەڕەم تاڵەبانی
بڵاوکراوەی مەکتەب ڕێکخستن- بەشی ڕووناکبیریی (ی.ن.ک.)
چاپ: یەکەم، چ: ڕوون، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٠٤٠، س: ٢٠٠٨، ل:٣٤، پ:٢٠×١٥
ناوەرۆک: بناغەی ئابووریی پەرەسەندنی نەتەوەیی.

**٣٨- کورد و کوردستان- لە سەردەمی باستانەوە تا کۆتایی جەنگی جیهانی یەکەم**
نووسین: کەمال بورکای
وەرگێڕانی لە زمانی یۆنانییەوە: عەلی فەتحی
چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ١٩٤٥، س: ٢٠٠٨، ل:٥٧٩، پ:٢٣×١٦
ناوەرۆک: ئاڵوگۆڕی بارودۆخی سیاسی- ئابووری و پێوەندیی کورد و ئەرمەنی.
تێبینی: ئەم چاپە بە هەمان ژمارەی سپاردنی ساڵی ٢٠٠٥ لە ساڵی ٢٠٠٨دا چاپ کراوەتەوە.

**٣٩- کۆمەڵگەی کوردەواری لە دیدی ڕۆژهەڵاتناسیدا**
نووسین: پ.بەدرخان سندی
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: د.ئیسماعیل ئیبراهیم سەعید
بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٩٥٩، س: ٢٠٠٨، ل:٦٢٠، پ:٢٣×١٧
ناوەرۆک: بازرگانی و ئابووری.

**٤٠- کۆنگرەی بە جیهانناساندنی جینۆسایدی گەلی کورد- پڕۆژەی ئەرشیفکردنی جینۆسایدی گەلی کورد ژمارە: ٣ کانوونی دووەمی ٢٠٠٨**
ئامادەکردن: چەند نووسەرێک
بڵاوکراوەی پڕۆژەی بە دۆکیۆمێنت کردنی جینۆسایدی گەلی کورد ٣
چاپ.: یەکەم، چ.: ئاراس، ش.: هەولێر، ژ.س.: ١٨٥٨، س.: ٢٠٠٨، ل.:٥٤٤، پ.:٢٢×١٦
ناوەرۆک: شاڵاوی ئەنفال و کاریگەرییەکانی لەسەر باری ئابووری و دەروونی و کۆمەڵایەتیی ئافرەتی بەجێماوی ئەنفال: عەدالەت عومەر ساڵح.
تێبینی: جگە لە ژمارەی سپاردن کۆدی ISBN: ٩٧٨-٩٥٢-٩٢-٤٢٥٨-٠- وەرگرتووە.

**٤١- کۆیە- لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای هەرێمی**
نووسین: کامەران تاهیر سەعید
بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی
چاپ.: یەکەم، چ.: تیشک، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٣٦٢، س.: ٢٠٠٨، ل.:٢٧٢، پ.:٢٤×١٧
ناوەرۆک: بەشی سێیەم: خەسڵەتە ئابوورییەکانی قەزای کۆیە.

**٤٢- کەسایەتیا ژنێ د دیرۆکێ دا**
نووسین: هیڤی بەرواری
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی سپیریز
چاپ.: یەکەم، چ.: حاجی هاشم، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٤٥٩، س.: ٢٠٠٨، ل.:٢٣٧، پ.:٢٣×١٦
ناوەرۆک: باندورا جڤاکی و ئابووری.

**٤٣- نەتەوەیەک لەسەر کاغەز- ئیفادەیەکی کورت لەسەر نووسەرێکی «لابراوەوە»**
نووسین: ستران عەبدوڵڵا
بڵاوکراوەی دەزگای خەندان بۆ پەخش و وەشاندن
چاپ.: یەکەم، چ.: ڕەنج، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠٠٨، ل.:٤٨٤، پ.:٢٤×١٧
ناوەرۆک: باری ئابووری بەرگەی چەند شۆکی تر دەگرێت؟

**٤٤- هۆزی گەردی و... لە بنەڕەتدا (میرئاودەلی- بابان- فەیزوڵڵابەگی- گەرگرەی- عگێدات- گولی و ...) (لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانی- مێژوویی- کۆمەڵایەتی- ڕامیاری- زمانەوانی... یە) بەرگی یەکەم**
نووسین: حەمید گەردی
بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: و-ڕۆشنبیری، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٨، س: ٢٠٠٨، ل:٤٨٤، پ:٢٣×١٧
ناوەرۆک: بەشی چوارەم: کورتە باسێک دەربارەی ڕەوش و بوارەکانی ژیان لە ناو هۆزدا- باری ئابووری.

**٤٥- هەڵەبجە ١٨٨٩- ١٩٣٠ لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە**

نووسین: عادل سدیق
بڵاوکراوەی پڕۆژەی تیشک
چاپ: یەکەم، چ: نووسەر، ش: ؟، ژ.س: ٥٠، س: ٢٠٠٨، ل:٢٠٤، پ:٢٣×١٧
ناوەرۆک: بەشی دووەم: بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و کارگێڕیی هەڵەبجە لە ماوەی دەسەڵاتداریێتی عوسمانیدا/ بارودۆخی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

**٤٦- ئینسکلۆپیدیای هەولێر- مێژووی کۆن- مێژووی ئیسلام- مێژووی نوێ ٣**

ئامادەکردن: لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیا (د.عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د.مەولوود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد، د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان)
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان
چاپ: یەکەم، چ: گرین گالۆری، ش: لوبنان، ژ.س: ١٨٣٢، س: ٢٠٠٩، ل: ٩٦٨- ١٤٧٥، پ: ٢٨×٢٠
ناوەرۆک: گرنگی ئابووری و سەربازی سەردەمی ئاشووری نوێ: د.نەهلە شەهاب ئەحمەد.

**٤٧- ئینسکلۆپیدیای هەولێر- مێژووی هاوچەرخ ٤**

ئامادەکردن: لیژنەی باڵای ئینسکلۆپیدیا (د.عەبدوڵڵا عەلیاوەیی، د.مەولوود ئیبراهیم حەسەن، فەرید ئەسەسەرد، د.ئومێد جۆزەلی، حەمید ئەبوبەکر بەدرخان)
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی بەدرخان- لەسەر ئەرکی (کۆسرەت ڕەسووڵ) چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: گرین گالۆری، ش: لوبنان، ژ.س: ١٨٣٢، س: ٢٠٠٩، ل:١٤٧٦- ١٩٢٠، پ: ٢٨×٢٠
ناوەرۆک: باری ئابووریی هەولێر لە کاتی جەنگی دووەمی جیهانیدا: مەغدید حاجی.

**٤٨- ئەتنۆ- جۆگرافیای باشووری کوردستان**

نووسین: د.عەبدوڵڵا غەفوور
بڵاوکراوەی سەنتەری ڤەکولینێن کوردی و پاراستنا بەڵگەنامەکان
چاپ: یەکەم، چ: ز-دهۆک، ش: دهۆک، ژ.س: ٢٢٢٥، س: ٢٠٠٩، ل:١٦٦، پ:٢٢×١٧
ناوەرۆک: سەربابەتی سێیەم: باری ئابووریی ئەرمەنان/ سەربابەتی دووەم: بنەمای ئابووریی تیارییەکان/ سەربابەتی سێیەم: سامانی ئاژەڵ و گرینگی ئابووری بۆ ڕەوەند.

**٤٩- بۆ مێژوو: کەرکوک لە ڕوانگەی مێژووەوە- کۆمەڵە تێکستێکی مێژوویی- ڕۆشنبیریی- ئەدەبییە**
وەرگێڕانی لە ؟: د.ئازاد عەبدولواحید کەریم
لە زنجیرە بڵاوکراوەکانی کۆمەڵەی ڕووناکبیری و کۆمەڵایەتیی کەرکووک
چاپ: یەکەم، چ: ڕۆژ، ش: کەرکووک، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٩، ل:٨٦، پ:٢٠×١٥
ناوەرۆک: گرنگیی ئابووریی کەرکووک: د.محەمەد ساڵح زێباری.

**٥٠- بیبلیۆگرافیای کوردناسی- کورد و کوردستان لە سەرچاوە فڕەنسییەکاندا**
ئامادەکردن: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی
چاپ: یەکەم، چ: حاجی هاشم، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٨٤، س: ٢٠٠٩، ل:٥٢٨، پ:٢٤×١٧
ناوەرۆک: بەشی پێنجەم: سەفەرنامە- جوگرافیا و ئابووری.

**٥١- بیبلیۆگرافیای کوردناسی- کورد و کوردستان لە سەرچاوە ئینگلیزییەکاندا**
ئامادەکردن: د.نەجاتی عەبدوڵڵا
بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی
چاپ: یەکەم، چ: حاجی هاشم، ش: هەولێر، ژ.س: ٩٨٥، س: ٢٠٠٩، ل:٤٤٥، پ:٢٤×١٧
ناوەرۆک: بەشی پێنجەم: سەفەرنامە-جوگرافیا و ئابووری.

**٥٢- بەهێمنی**
نووسین: بەهرۆز گەلاڵی
چاپ: یەکەم، چ: ساری یلدز، ش: ئەنکەرە، ISBN: ٩٧٨-٩٧٥-٠٠٨٧٢-٣-٨، س: ٢٠٠٩، ل:١٠٩، پ:١٩×١٤
ناوەرۆک: مەسەلەی کورد لە تورکیا/ ڕۆڵی (ی.ن.ک.) لە چارەسەری کێشەی کورد/ باری ئابووریی ئەمڕۆی تورکیا.

**٥٣- تاوانە ڕێکخراوەکان- توێژینەوەیەکی زانستی شیکارییە لەسەر تاوانە هاوچەرخەکان**
نووسین: نەبەز تاڵیب ڕۆستەم
بڵاوکراوەی وەزارەتی ڕۆشنبیری- بەڕێوەبەرێتیی گشتیی ڕۆژنامەنووسی و چاپ و بڵاوکردنەوە
چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٨١٧، س: ٢٠٠٩، ل:٥٣٢، پ:٢٤×١٧
ناوەرۆک: بەشی یەکەم: شیکردنەوەی تاوانی ڕێکخراو/ شوێنەوار و کاریگەرییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان/ بەشی چوارەم: تاوانە ئابووری و داراییە نێودەوڵەتییەکان.

**٥٤- چەند لێکۆڵینەوەیەک دەربارەی بزاڤی هاوچەرخی کورد- بەرگی دووەم**

نووسین: د.عوسمان عەلی

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: کامەران جەمال بابان زادە

بڵاوکراوەی پەیمانگای جیهانیی فیکری ئیسلامی

چاپ: یەکەم، چ: ڕێنوێ، ش: ؟، ژ.س: ٢٦٥٥، س: ٢٠٠٩، ل:٤٨٤، پ:٢٤×١٧

ناوەرۆک: بەشی شانزەیەم: کۆماری کوردستان لە مەهاباد- سەرنج لەسەر هۆکارەکانی سەرهەڵدان و ڕووخانی کۆمار/ هۆکاری ئابووری و کەوتنی کۆمار.

**٥٥- عێراق- لێکۆڵینەوەیەکە لە مێژووە سیاسییەکەی ٢٠٠٨- ١٩٠٨**

نووسین: حەسەن زازا

وەرگێڕانی لە ؟: ئامانج نیعمەت

بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢٨٤، س: ٢٠٠٩، ل:٢١١، پ:٢٠×١٤

ناوەرۆک: بەشی سێیەم: تەنگژەی دیموکراتی لە عێراقدا/ تەنگژەی ئابووری لە قۆناغی سیستمی کۆماریدا.

تێبینی: ناونیشانی کتێبەکە خۆی وا نووسراوە.

**٥٦- سۆمەرییەکان- مێژوویان، شارستانێتیان، کۆتاییان**

نووسین: عەبدولخالید سابیر

بڵاوکراوەی بەڕێوەبەرێتیی گشتیی چاپ و بڵاوکردنەوە

چاپ: یەکەم، چ: شڤان، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٤٠١، س: ٢٠٠٩، ل:٣٢١، پ:٢٢×١٦

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: مێژووی سۆمەرییەکان/ بواری ئابووری/ بەشی پێنجەم: بواری ئابووری.

**٥٧- سیاسەت گەمەیەکی بەردەوام**

نووسین: سەعید مەموزینی

چاپ: یەکەم، چ: منارە، ش: هەولێر، ژ.س: ٢٥٦١، س: ٢٠٠٩، ل:٢٧٨، پ:٢٣×١٦

ناوەرۆک: بەشی پێنجەم: پەیوەندیی نێوان ئابووری و سیاسەت.

**٥٨- کورد پێویستی بە یەک زمانی نووسینی نیشتمانی هەیە**

نووسین: **هەندرێن** و کامیار سابیر

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٨٢٩، س: ٢٠٠٩، ل:١٥١، پ:٢١×١٤

ناوەرۆک: پایەختی سیاسی و ئابووری- زمانی ستانداردی کوردی.

**٥٩- کورد لە ئینسایکلۆپیدیای ئیسلامدا**

نووسین: ئیسماعیل فەتاح قازی

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: حەمە کەریم عارف

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپ: یەکەم، چ: سەردەم، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٩٤٨، س: ٢٠٠٩، ل:٢٦٩، پ:١٤×٢١

ناوەرۆک: بونیادی ئابووریی دەوارنشینی.

تێبینی: لە کتێبی (کرد در دائره المعارف اسلام، ترجمه: اسماعیل فتاح قاچی، چاپ أول، ١٣٢٧، أنتشارات صلاح الدین أیوبی) وەرگیراوە.

**٦٠- کورد لە بازنەی چەند مەسەلەیەکی هەڵایساودا (چەند وتارێکی رۆژنامەوانی)**

نووسین: دڵشاد مستەفا وەسانی

چاپ: یەکەم، چ: ڕۆژهەڵات، ش: هەولێر، ژ.س: ٧٣، س: ٢٠٠٩، ل:٢٧٩، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: ڕۆڵی لادێ لە گەشەپێدانی ئابووریی هەرێمی کوردستاندا.

**٦١- کوردی سووریا - بوونێکی نکۆڵی لێکراو**

نووسین: هێریەت مونتگومری

وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: مینە (محەممەد ئەمین حسێن عەلی) و پێشەوا عەبدولخالق محەممەد

بڵاوکراوەی مەڵبەندی کوردۆلۆجی

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٤٣٤، س: ٢٠٠٩، ل:٢٢٢، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: سەرکوتکاری ئابووری.

**٦٢- کەرکوک لەبەر رۆشنایی راستییە مێژووییەکاندا- لێکۆڵینەوەیەکی مێژوویی سیاسییە لەبارەی کوردستانییەتی شاری کەرکوک**

نووسین: دلێر حەسەن عارف

چاپ: یەکەم، چ: ؟، ش: کەرکووک، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٩، ل:١٥٠، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: باری ستراتیژی و گرینگی کەرکووک لە ڕووی ئابوورییەوە.

**٦٣- گوندەژۆر لە سەدەی چواردەهەمدا تا سەدەی بیست و یەک- لێکۆڵینەوەیەکی مەیدانییە تایبەتە بە گوندی گوندەژۆر**

نووسین: ئیسماعیل گوندەژۆری

چاپ: یەکەم، چ: ماردین، ش: ؟، ژ.س: ٧٨٢، س: ٢٠٠٩، ل:١٦٠، پ:١٦×٢٢

ناوەرۆک: ئابووری.

**٦٤- لە (ئوربیللۆم و ئەربەئیلۆ)وە بۆ هەولێر- ٣٠ وتار و لێکۆڵینەوە دەربارەی مێژووی هەولێر**
نووسین: مەغدید حاجی
لەسەر ئەرکی پارێزگاری هەولێر چاپکراوە
چاپ: یەکەم، چ: حاجی هاشم، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٩، س: ٢٠٠٩، ل:٢٣٢، پ:٢٤×١٧
ناوەرۆک: کاریگەریی دووەمین جەنگی جیهانی لەسەر باری ئابووریی هەولێر.

**٦٥- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی- مۆدێرنیتەی دیموکراتی و کێشەکانی تێپەڕاندنی مۆدێرنیتەی سەرمایەداری ٢**
نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٣٥٣، س: ٢٠٠٩، ل:٤٣٥، پ:٢٠×١٤
ناوەرۆک: ئیکۆنۆمیزم (ئابووریخوازی)/ شوێنی سەرمایەداری/ شارستانییە مێژوویی- کۆمەڵایەتییەکان و سەرمایەداری/ ٣- سەرمایەداری ئابووری نییە دەسەڵاتە/ پێدراوەکان سەبارەت بەوەی سەرمایەداری ئابووری نییە.
تێبینی: ئەم کتێبانە، چەند جارێک چاپکران و کۆپی کراونەتەوە و هەندێ زانیاریشیان ناتەواوە.

**٦٦- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی- پەرتووکی سێیەم- سۆسیۆلۆژیای ئازادی- تاقیکردنەوە سەبارەت بە سۆسیۆلۆژیای ئازادی**
نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٣٥٣، س: ٢٠٠٩، ل:٤٤٠، پ:٢٣×١٦
ناوەرۆک: فاکتەرەکانی شار و گوند/ فاکتەرەکانی ئابووری و زهنییەت.

**٦٧- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتی- پەرتووکی چوارەم- قەیرانی شارستانی لە خۆرهەڵاتی ناوین و چارەسەری شارستانێتی دیموکراتی**
نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان
وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٣٥٣، س: ٢٠٠٩، ل:٥١٠، پ:٢٠×١٥
ناوەرۆک: ٧- کێشەی ئایدیۆلۆژیا و ئابووری لە کۆمەڵگای خۆرهەڵاتی ناویندا.
تێبینی: جگە لەوەی کە ساڵی ٢٠٠٩ ژمارەی سپاردنی وەرگرتووە، ساڵی ٢٠١١یشی لەسەر نووسراوە؟

**٦٨- مانیفستۆی شارستانێتی دیموکراتیک- پەرتووکی پێنجەم- کێشەی کورد و ڕێگەچارەی نەتەوەی دیموکراتیک (لە ناو بەرداشی ژینۆسایدی کلتووریدا بەرگریکردن لە کورد)**

نووسین: عەبدوڵڵا ئۆج ئالان

وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە: لوقمان عەبدوڵڵا

چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ٢٣٥٣، س: ٢٠٠٩، ل:٦٤٩، پ:١٧×٢٣

ناوەرۆک: بەشی یەکەم: چوارچێوەی زاراوەیی و تیۆری/ ئابووری/ بەشی دووەم: ڕەهەندی ئابووریی ڕاستینەی کوردان.

تێبینی: ئەم کتێبانە، چەند جارێک چاپکران و کۆپی کراونەتەوە و هەندێ زانیاریشیان ناتەواوە...

**٦٩- مەزدەک و ڕۆڵی لە مێژووی دەوڵەتی ساسانیدا**

نووسین: سۆران عەلی محەممەد

چاپ: یەکەم، چ: سایە، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٤٨٩، س: ٢٠٠٩، ل:١٠٧، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: کۆتایی دەسەڵاتی ئایینی مەزدەک و ئەنجامە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکانی لە دەوڵەتی ساسانیدا.

**٧٠- مێژووی دەوڵەتی ساسانی- سەردەمی کیرەوییەکان ٢٢٦- ٦٥١**

نووسین: موفید ڕائف مەحموود عابد

وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: عەبدوڵڵا گەرمیانی

چاپ: یەکەم، چ: سایە، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٤٢٢، س: ٢٠٠٩، ل:٢٢٠، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: بەشی دووەم: مێژووی شارستانی دەوڵەتی ساسانی/ ژیانی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

تێبینی:

یەکەم: دیارە لە ناونیشانەکەیدا لەبری (کیسرەوییەکان) بە هەڵە (کیرەوییەکان) نووسراوە؟

دووەم: نەنووسراوە کە لە چ زمانێکەوە وەرگێڕراوە، بە پێی ناوی بەرهەکانی نووسەر، دانراوە.

**٧١- نیگایەک لە ئێستا خەونێک بۆ سبەی**

نووسین: مەریوان وریا قانیع- بەختیار عەلی- ئاراس فەتاح- ڕێبین هەردی

بڵاوکراوەی پاشکۆی ڕۆژنامەی ئاوێنە

چاپ: یەکەم، چ: ئاوێنە، ش: سلێمانی، ژ.س: ؟، س: ٢٠٠٩، ل:١٠١، پ:١٢×١٧

ناوەرۆک: پێنجەم: ئابووری و نەوت و سیاسەت.

**٧٢- وریابوونەوەی کورد- مێژووی سیاسیی ١٩٠٠- ١٩٢٥ بەشی دووەم- باسی ئەو ململانێیە دەکا کە لە کۆمەڵەی گەلاندا (عصبة الأمم) سەبارەت بە باشووری کوردستان ڕوویدا لەگەڵ بەڵگەنامە و یادداشتە پەیوەندیدارەکان بەو کێشەیەوە**
نووسین: جەرجیس فەتحوڵڵا
وەرگێڕانی لە ؟: حەسەن جاف
بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٥٠٢، س: ٢٠٠٩، ل:٣٤٤- ٧٥٢، پ:١٦×٢٣
ناوەرۆک: فەسڵی سێیەم: بەڵگە ئابوورییەکان.

**٧٣- هاوپەیمانێتییە فەرامۆشکراوەکە «نوێکردنەوەی پێوەندییەکانی ئەمریکا- تورکیا بۆ دەمەوەهاتنی تەحەددییاتەکانی سەدەی بیست و یەکەم»**
نووسین: سپێنسەر پ. بویەر- براین کاتۆلیس
وەرگێڕانی لە زمانی ئینگلیزییەوە: ئاسۆ کەریم
بڵاوکراوەی دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی
چاپ: یەکەم، چ: خانی، ش: دهۆک، ژ.س: ٥٠٥، س: ٢٠٠٩، ل:٩٦، پ:١٦×٢٣
ناوەرۆک: نیگەرانی ئابووریی سیاسەتی تورکیا و بڕیارەکانی ڕەنگرێژ دەکەن.

٧٤- هەڵەبجە و کەسایەتییەکانی- بەشی دووهەم
ئامادەکردن: ئازاد حەمدی
چاپ: یەکەم، چ: ڕەنج، ش: سلێمانی، ژ.س: ١١٠٦، س: ٢٠٠٩، ل:٥٣٧، پ:١٩×٢٤
ناوەرۆک: سەرچاوە ئاوییەکانی شاری هەڵەبجە/ ئابووریی هەڵەبجە.

**٧٥- هەوارگەی شار- بەرگی دووەم**
نووسین: تالیب دەرباز
چاپ: یەکەم، چ: پیرەمێرد، ش: هەڵەبجە، ژ.س: ١٥٧١، س: ٢٠٠٩، ل:٤٧٤+ ١٠٠، پ:١٤×٢٠
ناوەرۆک: ئابووری و موڵکایەتی زەویوزار لە شارەزووردا.

**٧٦- ئاسوورییەکانی باشووری کوردستان- لێکۆڵینەوەیەکی جوگرافی- ئەتنۆگرافی**
نووسین: د.عەبدوڵڵا غەفوور
بڵاوکراوەی ئەکادیمیای کوردی
چاپ: یەکەم، چ: سپیرێز، ش: دهۆک، ژ.س: ٤٨١، س: ٢٠١٠، ل:١٩٩، پ:١٧×٢٤
ناوەرۆک: سەربابەتی دووەم: بنەمای ئابووریی ئاسوورییەکان.

**٧٧- ئەشکانییەکان (پارتەکان)**
نووسین: ماڵکۆم کالێج
وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: سەلاحەددین ئاشتی
بڵاوکراوەی بنکەی ژین
چاپ.: یەکەم، چ.: شڤان، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ١٣٤١، س.: ٢٠١٠، ل.:٣٣٩، پ.:١٧×٢٤
ناوەرۆک: بەشی پێنجەم: باری ئابووری و کۆمەڵایەتی.

**٧٨- ئەنفال لە ڕۆمانی کوردیدا لێکۆڵینەوەیەکی شیکاری-ڕەخنەیی-مێژووییە**
نووسین: د.ئەحمەد شەریف عەلی
چاپ.: یەکەم، چ.: منارە، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٥٦٢، س.: ٢٠١٠، ل.:٢٠٠، پ.:١٥×٢٢
ناوەرۆک: بەشی دووەم: ڕەهەندی کۆمەڵایەتی و ئابووری/ ئەنفال و تێکدانی شیرازەی کۆمەڵایەتی و ئابووری.

**٧٩- ئەو هۆکارانەی مەسەلەی کورد پێکدێنن**
نووسین: لازاریف
وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە: سەعد عەبدوڵڵا
چاپ.: ؟، چ.: ؟، ش.: ؟، ژ.س.: ؟، س.: ؟، ل.:٤٨، پ.:١٦×٢٢
ناوەرۆک: هۆکارەکانی ئابووری و کۆمەڵایەتی.

**٨٠- پرۆگرام و پەیڕەوی ناوخۆ- یەکێتیی نیشتمانیی کوردستان- پەسەندکراوی سێیەمین** کۆنگرەی (ی.ن.ک) سلێمانی ٦/١- ٢٠١٠/٦/١٤
ئامادەکردن و بڵاوکردنەوە: (ی.ن.ک.)
چاپ.: دووەم، چ.: حەمدی، ش.: سلێمانی، ژ.س.: ؟، س.: ٢٠١٠، ل.:٩٣، پ.:١٣×١٧
ناوەرۆک: ئامانجە ئابوورییەکان.

**٨١- ڕۆژنامەوانیی کوردی- گۆڤاری هیوا ١٩٥٧- ١٩٦٣ بەرگی یەکەم**
لێکۆڵینەوە و ئامادەکردن: د.هیمداد حسێن
بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس
چاپ.: یەکەم، چ.: ئاراس، ش.: هەولێر، ژ.س.: ٧٥٣، س.: ٢٠١٠، ل.:٦٧٩، پ.:١٧×٢٣
ناوەرۆک: ئاوڕدانەوەیەکی مێژوویی لە بارودۆخی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و ڕۆشنبیریی عێراق لە دوای جەنگی دووەمی جیهانییەوە ١٩٤٦ تا داخستنی گۆڤاری هیوا... ١٩٦٣.
تێبینی: ناوی چەند ژمارە لە هەر بەرگێکدا هاتبێت، وێنەی لاپەڕە ئۆرجیناڵەکانی ئەو ژمارانەش لەو بەرگانەدا دانراون.

**٨٢- کاتێ نوێنەری سەرۆک بووم**

نووسین: بەهرۆز گەڵاڵی

چاپ: یەکەم، چ: ساری یەلدز، ش: ئەنکەرە، ISBN: ٩٧٨-٩٧٥-٠٠٨٧٢-١٠-١، س: ٢٠١٠، ل:٤٤٤، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: ئابووری و بازرگانی.

**٨٣- کورد و دەوڵەت**

نووسین: ئاوارە حسێن

پێداچوونەوە: د.کەیوان ئازاد ئەنوەر

چاپ: یەکەم، چ: سیما، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٢٢٨، س: ٢٠١٠، ل:٢٢٦، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: کوردستان لە ڕووی جوگرافیا و ئابوورییەوە.

**٨٤- مانیفێستی دژەگەندەڵی پاکڕەوشتیی دژ بە گەندەڵی**

نووسین: ئازاد حەمە

بڵاوکراوەی دەزگای چاپ و بڵاوکردنەوەی ئاراس

چاپ: یەکەم، چ: ئاراس، ش: هەولێر، ژ.س: ٦٤٣، س: ٢٠١٠، ل:٤٠٠، پ:١٥×٢٢

ناوەرۆک: ١٧- گەندەڵی و تەپاندنی داهاتی نەتەوە: لە کۆمەڵگەی گەندەڵدا ڕۆشنبیریی ئابووریی تاکەکەس بێ.

**٨٥- مێژووی شارستانیەت- خۆرهەڵات لانکی شارستانیەت- بەرگی یەکەم**

نووسین: ویل دورانت

وەرگێڕانی لە ؟ بۆ زمانی فارسی: چەند وەرگێڕێک

وەرگێڕانی لە زمانی فارسییەوە: عەبدوڵڵا ڕەسووڵی

بڵاوکراوەی خانەی چاپ و بڵاوکردنەوەی چوارچرا

چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: ؟، ژ.س: ؟، س: ٢٠١٠، ل:٦٥٣، پ:١٧×٢٤

ناوەرۆک: بەشی دووەم: هۆکارە ئابوورییەکانی شارستانیەت.

تێبینی: ئەم کتێبە چەند جارێکی تر وەرگێڕراوە.

**٨٦- ناحیەی پێباز (باوەنور) لێکۆڵینەوەیەک لە جوگرافیای هەرێمی**

نووسین: نامدار محەممەد عەلی

لەسەر ئەرکی کۆمەڵەی ڕۆشنبیریی باوەنوور چاپکراوە

چاپ: یەکەم، چ: چوارچرا، ش: سلێمانی، ژ.س: ١٨٣٦، س: ٢٠١٠، ل:١٢٠، پ:١٤×٢٠

ناوەرۆک: بەشی چوارەم: خەسڵەتە ئابوورییەکانی ناحیەی پێباز.




تەوەرێکی نوێی گۆڤاری خاڵە و
کۆمەڵێك بابەتی هەمەچەشن
دەخاتە بەر دیدی خوێنەرانی



ئامادەکردنی: فەرەیدون ئەحمەد پێنجوێنی



## خانمی دەستبەدەستنوێژی کورد
## دووسەدوپەنجا ساڵ پێش ئێستا:

یەکێك لەو گەڕیدانەی سەردانی عێراق و ناوچەکەیان کردووە و بەکوردستانیشدا تێپەڕیون، (کارستین نیبور)ی زانای ماتماتیك و نەخشەناس و گەڕیدەی بەناوبانگی ئەڵمانییە کە کاری بۆ میرنشینی دانیمارکی کردووە و ساڵی ١٧٦٥ز گەیشتووەتە شاری بەسرە و پاشان بەرەو باکوور کشاوە، لە مانگی ئازاری ١٧٦٦دا لە شاری بەغداوە بەرەو موسڵ دەکەوێتەڕێ و لە ڕێگادا بەناو دوزخورماتوو لەڕێی چیای حەمرین و کەرکوك و قوشتەپەوە دەگاتە هەولێر، پاشان لەوێوە بەرەو زێی گەورە و لە کەڵەك بە زێ دا دەپەڕێتەوە بۆ موسڵ، دواتر گەشتەکەی بەردەوام دەبێت بە کوردستانی باکووردا و لە کۆتاییدا لە ساڵی ١٧٦٧دا دەگاتەوە کۆبنهاگنی پایتەختی دانیمارك. سەفەرنامەکەی نیبور لەلایەن (ئەردەڵان عەبدوڵڵا)وە وەرگێڕدراوە بۆ زمانی کوردی و ساڵی ٢٠١٣ بڵاکراوەتەوە. وەرگێڕ لە پێشەکی کتێبەکەدا ئاماژە بۆ ئەوە دەکات کە نیبور بەباشی باسی کوردی نەکردووە، زۆر ئاگاداریی و زانیاریی لەبارەی کوردەوە نەبووە، بەڵام لەو شارە کوردییانەی پێیدا تێپەڕ بووە وێنەیەکی ژیانی ئەو کاتی کوردی کێشاوە و وەسفی سەوزایی و دەوڵەمەندیی ناوچەکانی کوردستان دەکات، ئەوکاتە لە کوردستانەوە (دار و گوێز و بادەم و گەنم و جۆ و توتن) چووەتە بازاڕەکانی ئەوروپا.

نیبور، کە لەگەشتەکەدا و بۆ نەناسینەوەی، ناوی خۆی گۆڕیوە بۆ (عەبدوڵڵا)، لە شارۆچکەی (قوشتەپە) دیمەنێك سەرنجی ڕادەکێشێت، خانمێکی دەستبەدەستنوێژی کورد لە دەشتاییەکدا و بە تەنها، سەربەرزانە، خەریکی نوێژکردنە، ئەمە هەڵوێستە بە نیبور دەکات و باسی ئەو دیمەنە جوانەی خانمە کوردەکە تۆمار دەکات، وەك وەرگێڕی کتێبەکە لە لاپەڕە (٢٣)دا ئاماژەی پێ دەکات نیبور دەڵێت: «لەوەتەی هاتوومەتە وڵاتانی خۆرهەڵات ئەمە یەکەمین جارە ژنێك ببینم و لە دەشتاییدا بە تەنها نوێژ بکات، چونکە لە شوێنەکانی تردا ژنان نابێت بڕۆنەدەرەوە و هەر لەماڵەوە دەبن»، کە ئەمە خۆی لەخۆیدا جۆرە ئازادییەکی ژنی کورد نیشان دەدات، ئەم خاڵە زۆرێك لە گەڕیدەکانی دیکەش باسیان کردووە.



# بۆچوونی خۆرهەڵاتناسێك

## لەبارەی فەتحی مەككەوە:

خۆرهەڵاتناسەكان كە خەڵكی وڵاتانی خۆرئاوان و هاتوونەتە وڵاتانی خۆرهەڵات و توێژینەوە و كتێب و یادەوەریی و گەشتنامەیان لەبارەوە یان لەبارەی مێژوویانەوە نووسیون، بەشێوەیەكی گشتی كاتێك باسیان لە گەلانی خۆرهەڵات كردووە دەكرێن بە دوو گرووپەوە، بەشێكیان بە ویژدان و ئینسافانە نووسیویانە و بەشێكیشیان بەهاندەری ئایینی و مەزهەبی دواون و هێڵی ڕەشیان بەسەر هەموو شتێكی خۆرهەڵاتییەكاندا هێناوە، جا چ ئەم كەسانە لە هەردوو گرووپەكە خۆیان هاتبنە ناوچەكە یاخود كتێبیان لەسەر مێژووەكەی نووسیبێت، بەتایبەتیش مێژووی ئیسلام كە لایەنێكی گرنگ و سەرەكیی بابەتەكانیانی داگیركردووە و بەتایبەتی تریش ژیاننامەی پێغەمبەری ئیسلام محەمەد سەلامی خوای لێبێت.

لێرەدا نمونەی یەكێك لەوانە باس دەكەین كە خۆرهەڵاتناسی فەڕەنسی (ئمیل دیرمینغەم)ـە كە كتێبێكی نووسیوە بەناوی «ژیانی محەمەد»، ئەم كتێبە بە وردترین دانراوی خۆرهەڵاتناسەكان دادەنرێت كە لەبارەی ژیاننامە و سیرەی پێغەمبەری ئیسلامەوە نووسرابێت، ئەو خۆرهەڵاتناسە فەڕەنسییە لەو كتێبەیدا كە ساڵی ١٩٢٩ بڵاویكردووەتەوە دەنووسێت:» بەڕاستی محەمەد لە زۆرینەی ساتەكانی ژیانیدا میانڕەوییەكی جێسەرنجی پیشانداوە. ئەو لە كۆتاهەمین سەركەوتنیدا (مەبەستی فەتحی مەككەیە) دەروون گەورەییەكی كەموێنەی لە مێژوودا سەلماند كە فەرمانی بە سەربازەكانی كرد كە لە كەسە لاواز و بەتەمەنەكان و منداڵ و ژنان ببورن و هۆشیاری دانێ نەكەن خانوو بڕووخێنن یان بازرگانەكان بڕووتێننەوە یاخود داری بەردار ببڕن.. هەروەها فەرمانی پێكردن شمشێر هەڵنەكێشن تەنها مەگەر بۆ كاتی زۆر پێویست و ناچاری. تەنانەت بینیمان سەرزەنشتی هەندێك لە فەرماندە (سەربازییەكانی سوپاكە)ی دەكرد و بە پێدانی پارە (بە زیانلێكەوتووان) هەڵەكانی بۆ ڕاست دەكردنەوە، و بیری دەخستنەوە كە پارێزگاریی لە ژیانی تاقە كەسێك، لە هەزار فەتح باشترە«.

ـ سەرچاوە: گۆڤاری حراء، ژمارە ٦٦، مایس و حوزەیرانی ٢٠١٨.

# خەباتی مەدەنی، شێوازێکی نوێ:

لە سەرەتای شۆڕشی ئێراندا کە شا ڕووخا و حکومەتی نوێ بەسەرۆکایەتی خومەینی هاتەسەر دەسەڵات، دژەشۆڕشەکان کە بەشێکیان پاشماوەی ڕژێمی شا بوون و بەرژەوەندییان کەوتبووە مەترسییەوە و باریان لار ببوو، بڕیاریاندا ڕۆژێکی هەینی خۆنیشاندانێکی مەزن ئەنجام بدەن و سەرجەم ڕێگاوبانەکانی تارانی پایتەخت بگرن و جوڵەی شار ڕابگرن وەك نارەزاییەك بەرانبەر بەو ڕێوشوێنە حکومییانەی کە بۆ لەناوبردن و دوورخستنەوەی پاشماوەی ڕژێمی شا گیرابوونەبەر.

بەپێی ئەو گێڕانەوەیەی کە (فائق محمد حسین) نوسەری کتێبی (ما رأته العین) کە خۆی هاوڵاتییەکی عەرەبی عێراقییە و لەوسەروبەندەدا لە ئێران بووە، باسیکردووە خەڵك ترسیان لێنیشت لەوەی کارەسات بقەومێت و ڕووبەڕووبوونەوە دروست ببێت، هەموو چاوەکان لەسەر بەیانیی ڕۆژی هەینی بوو تا بزانن چی ڕوودەدات، خومەینی درکی بەوە کرد کە ڕووبەڕووبوونەوە ڕوودەدات و لەوانەشە خوێن بڕێژرێت، لەبەرئەوە فەرمانی بە شوێنکەوتووانی کرد کە ڕێگایەکی شارستانی بگرنەبەر و بەڵێنی سەرکەوتنیشی پێدان، لەبەرئەوە ئێوارەی ڕۆژی پێنج شەممە، دوای نوێژی ئێوارە، خومەینی هاتە سەر تەلەفزیۆن و وتارێکیدا، تیایدا داوای لە ڕۆڵەکانی گەل کرد کە «پیلانە شەیتانییەکان» شکست پێبهێنن و خۆی وتەنی «ئیستیکباری جیهانی و لەسەروویانەوە ئەمەریکای دوژمنی گەلان» تێکبشکێنن، ئەوەش بەوەی کە سبەێنی هەینی هەموویان لە ماڵەکانیان بێنەدەر و بست بە بستی شوێن و شەقام و گۆڕەپانەکانی تاران بگرن و ڕێگە نەدەن «خائینان» جوڵە بکەن. بەمشێوەیە، پاش نوێژی بەیانیی ڕۆژی هەینی، خەڵکی تاران و گوندەکانی دەوروبەری ڕژانە شەقام و کوچە و کۆڵان و گۆڕەپان و باخچە گرنگەکانی شار و لێی دانیشتن، بەڵێ هەر بە دانیشتن دانیشتن و پاڵیاندا بەیەکەوە بەجۆرێك بواری تێپەڕبوونی ئاژەڵیش نەبوو.

نووسەری کتێبەکە دەڵێت بەمجۆرە پلانەکەی خومەینی بەبێ ئەوەی دڵۆپە خوێنێك بڕژێت سەریگرت، خۆپیشاندانە دژەکە هەڵوەشایەوە و دژەشۆڕشەکان هیچیان سەوز نەکرد.

## بەتەمەنەکان، وەك سەرچاوەی مێژوو:

کۆمەڵناسی عێراقی د.عەلی وەردی لە بەشی شەشەمی کتێبەکەیدا (لمحات اجتماعیە من تاریخ العراق الحدیپ)، کە تایبەتی کردووە بە مێژووی ساڵانی ١٩٢٠ - ١٩٢٤ی عێراق، واتە سەروبەندی دامەزراندنی دەوڵەتی پادشایی لە عێراقدا، ئاماژە بۆ ئەو سەرچاوانە دەکات کە پشتی پێبەستوون بۆ نووسینی کتێبەکەی، لەناویاندا کەسە پیر و بەتەمەنەکانی کردووە بە یەکێك لەو سەرچاوانە.

د.عەلی وەردی، کە زیاتر وەك کۆمەڵناس و توێژەرێکی دیاری عێراقی ناوبانگی دەرکردووە لەو کتێبەیدا ئاماژە بۆ ئەو سەرچاوانە دەکات کە بۆ دانانی کتێبەکەی و مێژووی ساڵانی بیستی عێراق و دامەزراندنی دەوڵەتی هاوچەرخی ئەم وڵاتە پشتی پێبەستوون، تیایدا ئەو سەرچاوانە ڕیزدەکات کە بریتیین لە بەڵگەنامەکانی بەریتانیا و نامەکانی (مس بێڵ)ی سکرتێری مەندوبی سامی بەریتانیا لە بەغدا و نامەی ماستەر و تێزی دکتۆرای خوێندکارانی بەشی مێژووی زانکۆی بەغدا و یادەوەریی کەسایەتییە سیاسییەکانی ئەوکاتی عێراق و قسەی ئەو بەتەمەنانەی کە لەو سەردەمەدا ژیاون، هاوکات لەگەڵ ئەو ڕۆژنامە کۆنانەی ئەو سەردەمە دەردەچوون.

لە باسی قسەی بەتەمەنەکاندا د.عەلی وەردی دەنووسێت لەڕاستیدا ناتوانین ئەوە پشتگوێ بخەین کە قسەی ئەو بەتەمەنانە بۆ تێگەیشتن لە ڕووداوەکانی ڕابردوو و دەرخستنی هەندێك سووچ و گۆشەی پشتگوێخراوی ئەوکات، گرنگە، «بەبۆچوونی من قسەی بەتەمەنە نەخوێندەوارەکان لەوانەیە هەندێك جار بۆ توێژەر سوودمەندتر بێت لە قسەی خوێندەوارەکان، لەبەرئەوەی خوێندەوار هەوڵدەدات ڕووداوەکان بەوشێوەیە وێنا بکات کە لەگەڵ ئاڕاستە فیکرییەکانی یاخود حیزبایەتییە سیاسییەکەی بگونجێت، بەڵام کەسی نەخوێندەوار کاتێك قسە لەبارەی ڕووداوەکانەوە دەکات وەك خۆی چۆن ڕوویداوە بەبێ جوانکردن و ڕازاندنەوەی دەیانهێنێت و باسیان دەکات، گێڕانەوەکەشی لەوانەیە ڕووکەشانە و سادە بێت، بەڵام لەوانەیە هەندێك لایەنی شاراوەی ڕووداوەکان دەربخات کە عادەتەن خوێندەوارەکان گرنگی بە باسکردنی ئەو لایەنانە نادەن».

د.عەلی وەردی کە لە بواری مێژوودا گرنگی بە لایەنی کۆمەڵایەتی دەدات ساڵی ١٩١٣ لە بەغدا لەدایکبووە و لە ١٣ی تەمموزی ١٩٩٥ هەر لەوێ کۆچی دوایی کردووە.

## دواهەمین میوان

دەقی هۆنراوەیەکی شاعیری عێراقی (عەبدولڕەزاق عەبدولواحید) بەناونیشانی (دواهەمین میوان ـ سەردانکەر ـ)، کە باسی کاتی گیانکێشانی خۆی و هاتنی فریشتەی گیانکێشان دەکات:

بەبێ وادە
بەبێ ئەوەی منداڵەکانم نیگەران بکەیت
لە دەرگام بدە...
زۆربەی کات لە کتێبخانەکەمم
وەك هەر سەردانکەرێك دابنیشە،
هیچ پرسیار ناکەم
نە بۆچی، نە لەکوێوە...
کاتێکیش منت دی چاوەکانم پڕ لە فرمێسك،
کتێبەکە لە دەستم وەربگرە و
ـ بێزەحمەت ـ بێدەنگ بیخەرەوە شوێنی خۆی لەناو ڕەفەکەدا...
کاتێکیش ڕۆیشتیت،
کەس لە ماڵەکەم خەبەرمەکەرەوە،
لەبەرئەوەی خەمناکترین شتێك کە چاوەکان بیبینێت،
ڕوخساری منداڵەکانمە کاتێك دەزانن مردووم...!

ـ عەبدولڕەزاق عەبدولواحید، شاعیری دیاری عێراق، بە (المتنبی الاخیر) و (شاعر القرنین) ناوبانگی دەرکردبوو، ساڵی ١٩٣٠ لە بەغدا لەدایکبووە و ساڵی ٢٠١٥ لە پاریس کۆچی دوایی کردووە.

# مێژوو، لای (ئیبن خەلدون):

زانای بەناوبانگی مسوڵمانان (ئیبن خەلدون) جگەلەوەی کە بە باوکی زانستی کۆمەڵناسی ناسراوە، لەهەمانکاتدا ناوبانگی بە لێکۆڵینەوەی مێژوویی دەرکردووە، کتێبە بەناوبانگەکەی (المقدمة) یەکێکە لە باشترین نووسراوەکانی. بۆچوونی ئیبن خەلدون بۆ مێژوو ئەوەیە کە مێژوو بریتییە لە «هەواڵ لەبارەی گردبوونەوەی مرۆیی»، باسکردن و هەواڵ لەبارەی هەر شتێك کە بەسەر ئەو گردبوونەوە مرۆییەدا هاتووە وەك دەوارنشینی و شارستانێتییەکەی، جەنگ و سیاسەتی، ئابووریی و زانستی، بەشێوەیەکی گشتیش سەبارەت بە هەر شتێك کە لەو گردبوونەوە مرۆییەدا ڕوودەدات. جا (ئیبن خەلدون) پێیوایە مێژوو دوو ڕووی هەیە، ڕووی دەرەکیی و ڕووی ناوەکی، کە ئەو بە (ظاهر التاريخ و باطن التاريخ) گوزارشتی لێکردوون. هەرچی ڕووی دەرەکیی مێژووە بریتییە لە هەواڵی ڕابردووی مرۆڤ بەجۆرێك زانا و نەزان لە تێگەیشتنیدا وەك یەکن. بەڵام ڕووی ناوەکیی مێژوو بریتییە لە دڵنیابوون لە ڕاستیی هەواڵەکە، گەڕان بەدوای هۆکارەکانی ڕووداوەکاندا، دڵنیابوون لە ئیمکانییەتی ڕوودانیان، هەر ئەم بەشەیشە کە شایستەی ئەوەیە بکرێت بە زانستی مێژوو.

(ئیبن خەلدون) لەبارەی مێژوونووسانی ئیسلامەوە دەڵێت: ئەوان لە ڕووی دەرەکیی مێژوو نەترازاون، تەنها هەواڵ و ڕووداوەکانیان گواستووەتەوە، چ ڕاست بووبن یاخود ناڕاست، ڕەخنەناگرن و هۆکارەکانی دروستبوونی ڕووداوەکان باسناکەن. هەرچی سەبارەت بە خۆیەتی، (ئیبن خەلدون) دەڵێت ئەو کە دەستیداوەتە زانستی مێژوو، هەموو مەبەستی سەرەکیی ڕووی ناوەکیی مێژووە، واتە گەڕان بەدوای هۆکارەکان و شیکاری هەواڵ و ڕووداوەکان و لەبێژنگدانیانە، تا بە دروستی بگاتە خوێنەر.

(ئیبن خەلدون) نمونەیەك بۆ ئەمە باس دەکات، مێژوونووسان پێیانوایە کە هارونە ڕەشید کاتێك سەرلەبەری بنەماڵەی بەرمەکییەکانی لە دەسەڵات دوورخستەوە و لەناویبردن، هۆکارەکەی ئەوەبوو کە جەعفەری کوڕی یەحیای بەرمەکی پەیوەندیی سۆزداریی لەگەڵ (عەبباسە)ی خوشکی هارونە ڕەشیددا هەبووە، لەکاتێکدا ـ بەپێی شیکاری ڕووداوەکان لای ئیبن خەلدون ـ هۆکارەکە سیاسیی بووە و بەهۆی ئەوەوە بووە کە بەرمەکییەکان دەستیان بەسەر دەوڵەتدا گرتبوو و سەرجەم جومگەکانی حکومەتدارییان بەدەستەوە بوو، ئەمە جگە لە لایەنی دارایی، لەبەرئەوە و پێش ئەوەی بتوانن کودەتا بەسەر هارونە ڕەشیددا بکەن، ئەم لێیان هاتەدەست و سەرجەم بنەماڵەکەیانی لەناوبرد.

بەمجۆرە، ئیبن خەلدون پێیوایە ئەرکی مێژوو ئەوەیە شیکاری بۆ ڕووداوەکان بکات نەك تەنها گوێزەرەوەیان بێت.




## جیاوازییەکی زمانەوانی و
# ناوە پیرۆزەکانی خوا:

وشەی (السخاء) لە زمانی عەرەبیدا بریتییە لە (بەخشین) پاش ئەوەی داوات لێ دەکرێت، واتە: کەسێك داوای یارمەتی دەکات و بەرامبەرەکەشی بە دڵاوابیەوە پێی دەبەخشێت.

وشەیەکی دیکەمان هەیە کە بەهەمان شێوە مانای بەخشین دەدات کە بریتییە لە (الجود)، کە بریتییە لە (بەخشین) بە خەڵکی بەبێ ئەوەی کەسەکە داوای کردبێت، واتە: کەسێك دەبەخشێت بەبێ ئەوەی کەس داوای لێ کردبێت. لەم وشەیەش بترازێت وشەیەکی دیکەمان هەیە کە بریتییە لە (الکرم)، ئەمیش بەهەمان شێوە مانای (بەخشین) دەدات، بەڵام بەخشینێك بە جۆرێك کە پێویستیت بەوە نابێت کە داوای یارمەتی لە هیچ کەسێکی دیکە بکەیت، بەخشینێك کە بێنیازت دەکات لە هەموو کەس.

جا دیقەت بدەن: (الجواد) و (الکریم) دوو ناون لە ناوە پیرۆزەکانی خوای گەورە، واتە خوا دەبەخشێت بە بەندەکانی بەبێ ئەوەی بەندەکانی داوای لێبکەن و بەجۆرێکیش دەبەخشێت کە پێویستیت بە جگە لەخۆی نەبێت، بەڵام ناوی (السخی) لە ناوەکانی خوای گەورە نییە، کە ئەم ناوە مانای ئەوەیە هەر دەبێت داوای لێ بکەیت ئەنجا پێت ببەخشێت.

خوا، دەبەخشێت ئەگەرچی داوایشی لێ نەکرێت.

# تۆڵەی سیستەمی سەرمایەداری لە مارکس:

کارل مارکس، دوژمنی سەرسەختی سەرمایەداریی و بەرگریکاری چینی کرێکار لە سیستەمی شیوعییەتدا، لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا لە بەریتانیا گیرسایەوە و لە دواجاردا لە لەندەن کۆچی دوایی کرد.
لە سەراسیمەکانی ژیان ئەوەیە ئێستا سەردانکردنی گۆڕی (مارکس) لە لەندەن لە ساڵی ٢٠١٥ـەوە بووە بە پارە و بۆ بینینی گۆڕی ئەو کەسەی کە تا مرد دژایەتی سیستەمی سەرمایەداریی دەکرد و بەرگریی لە هەژاران دەکرد، دەبێت چوار تا شەش پاوەن بدەیت. ئەمە، وەك بڵێی سیستەمی سەرمایەداریی زمان لە مارکس دەردێنێت کە لە گۆڕەکەیدایە و پێی دەڵێت: مارکس! لەکۆتاییدا سەرکەوتم بەسەرتدا و ئەها ئەوەتە وەبەرهێنان و بازرگانی بە جەستەتەوە دەکەم و گیان و ڕۆحت لە بازاڕدا دەخەمە سەوداوە..!!
وێنەکەش، وەبەرهێنانێکی پێکەنیناویی سەری مارکسە کە کراوە بە دەغیلەی پارە.
مارکس، بەڕابەری قوتابخانەی مارکسی دادەنرێت و لە ساڵی ١٨١٨ لەدایکبووە و ساڵی ١٨٨٣ کۆچی دوایی کردووە.

. خەلیل نەبوائی

# ڕیکلامێکی سەیری ڕۆژنامەیەک

مامۆستا هێمنی شاعیری ناوداری موکریان و کورد، لە دیوانە شیعرێکیدا بەناوی (تاریك و ڕوون) باسی ژیانی خۆی دەكات و لە درێژەی باسەكەیدا دەچێتە سەر باس‌وخواسی ڕۆژنامەگەریی لە سەردەمی ساڵانی سی و چلەكانی سەدەی ڕابردوو لە ڕۆژهەڵاتی كوردستان و شاری مەهاباددا. لەوێدا (هێمن) باس لە دەرچوونی ڕۆژنامەیەك دەكات لە ئێران كە ژمارەكانی دەگەیشتە شاری مەهاباد و بەگرنگییەوە لێی دەڕوانێت و بە ڕۆژنامەیەكی (شیرین) ناوی دەبات كە بابەتەكانی خوێندووەتەوە و بە تاسەوە چاوەڕێی دەرچوونی كردووە. هەروەها باس لە ڕیكلامێكی سەیر دەكات كە ڕۆژنامەكە بۆ بڵاوكردنەوە و كڕینی لەلایەن هاوڵاتییانەوە كردوویەتی. ڕۆژنامەكە ناوی ڕۆژنامەی (تەوفیق) بووە و ڕۆژانی پێنج شەممە ژمارەی نوێی دەردەچوو و شەوانی هەینی خەڵك دەیانبردەوە ماڵەوە بۆ خوێندنەوەی.

(هێمن) دەنوسێت: «ڕۆژنامەكانی ئەو سەردەمە تەبلیغاتیان بۆ ئاڵمان دەكرد و بە بەژن و باڵای پەهلەوییان هەڵدەگووت. تەنها ڕۆژنامەیەك كە ئەودەمی شیرین بوو و تا ژیاش هەر شیرینتر بوو نەحلەت لەو كەسەی مراندی، (تەوفیق) بوو، ئەو ڕۆژنامەیە ڕۆژانی پێنج شەممە دەردەچوو و لە هەموو ژمارەیەكدا دەینووسی: (شەوی جومعە دوو شتت لەبیرنەچێ، دووەم ڕۆژنامەی تەوفیق)»...!

شاعیری گەورەی موكریان كە ئەو سەردەمە گەنج بووە و هێشتا بوخچەی نەكراوە بووە و هاوسەرگیریی نەكردووە، وەك توانجێك بۆ ئەو حاڵەی خۆی و سەرقاڵبوونی ئەو سەردەمەی بە خزمەتی ئەدەبی و فەرهەنگیی لە شاری مەهاباددا، دەڵێت: «من ڕەبەن بووم، دەنا ئەویتریشم لەبیردەچوو، بەڵام شەوی جومعە تەوفیقم لەبیر نەدەچۆوە».



# ناوەندە زانستییە بەناوبانگەکان:

زانکۆی (القرویین) بە یەکەم زانکۆ دادەنرێت لە جیهان و مێژووی مسوڵمانان‌دا کە لەلایەن ئافرەتێکی خانەدانی مسوڵمانەوە بنیاتنراوە. ئەم زانکۆیە، لە بنەڕەتدا هەم زانکۆ و هەم مزگەوت بووە، زانکۆی (القرویین) دەکەوێتە شاری (فاس) لە وڵاتی مەغریب و دێرینترین زانکۆی جیهانە، زانکۆکە لەلایەن (فاتیمەی فەهری) خانمە ناوداری مسوڵمانەوە لە ساڵی ٨٥٩ زایینی بنیاتنراوە، فاتیمە لە خانەوادەیەکی شاری قەیرەوان بووە و چووەتە شاری فاس و ئەم زانکۆ و مزگەوتەی دروستکردووە. جێی باسە زانکۆی (القرویین) پێش زانکۆی (زەیتونە)ی تونس و پێش زانکۆی (ئەزهەر)ی میسر و دووسەد ساڵیش پێش زانکۆکانی ئەوروپا، بنیاتنراوە.

هەر کە ناوی زانکۆی (القرویین) دەهێنرێت لەگەڵیدا ناوی زانا گەورە و مەزنەکانی ئەو سەردەمە دێت کە لەوێ وانەیان وتووەتەوە، لەوانە: زانای کۆمەڵناس (ئیبن خەلدون) و (ئیبن خەتیب) و (ئیبن باجە)، لە سەردەمی هاوچەرخیشدا (علال الفاسی) ڕابەری بزوتنەوەی نیشتمانی مەغریبی هەر لەو زانکۆیە خوێندوویەتی. لەلایەکی دیکەوە خوێندن لەو زانکۆیە تەنها بۆ فێرخوازانی زانستەکان نەبووە، بەڵکو ڕێگە دراوە بە پیشەوەر و بازرگانەکانیش ئامادەی وانەکان ببن و سوودی زانستی وەربگرن. زانکۆکە لە سەردەمانی دوای خۆیدا نۆژەنکراوەتەوە و فراوانکراوە، بەتایبەتی لە سەردەمی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایانی (مورابیتین)دا کە حەوشەیەکی فراوان بەشێوەیەکی تەلارسازیی نایاب خرایە سەر زانکۆکە و بەشێوەی تەلارسازیی ئەندەلوس ڕازێنرایەوە.

جگە لەلایەنە زانستی و ئاینییەکەی، زانکۆی (القرویین) ڕۆڵی سیاسیی ڕاستەوخۆیشی هەبووە، لە سەردەمی داگیرکاریی فەرەنسادا کە وڵاتی مەغریبیان داگیرکردبوو، زانکۆکە بووە شوێنی پێگەیاندنی خەباتکارانی دژە داگیرکەر و لانکەی شۆڕش بووە.

**. سەرچاوە: سایتی جەزیرەی دیکیۆمێنتاری.**






# الوحدة الاسلامية مقوماتها ومعوقاتها

کتێبی نوێی ناوەندی ڕۆشنبیریی و هزیی خاڵ

ئێستا لە کتێبخانەکاندایە






# ئۆتاوا 2041

کتێبی نوێی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ئێستا لە کتێبخانەکاندایە






# ئەوروپا و پرسی ئیسلام

## تێڕوانینی ڕۆژئاوا بۆ ئیسلام و موسڵمانان هەتا دەرکەوتنی ڕۆژهەڵاتناسیی

کتێبی نوێی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

ئێستا لە کتێبخانەکاندایە






# سەردەمی سەلاحەددین

## ئەو نەوەیەی قودسی ڕزگارکرد

کتێبی نوێی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

ئێستا لە کتێبخانەکاندایە